به بەرگی تازەی شیعرەوە

بەرگێ.. لە وردە پوولەکەی ئەسرین

با بریسکەیبێ مەراق و

بدرەوشێنەوە ئاخ و داخ!.
بەرگێ.. لە شەماڵی وەنەوشەیی شەفاف
لەمدیوەوە با هەناوی کزەکانی هەموو دیاربێ.
بەرگێ.. لە پەلکە گیای غەمگین
وەختێ کە فەسڵی دابڕان
بە ئەسپایی ئەیکاتە بەر ئێوارانی عاشقان و
باڵای سەفەری غەریبان!
بەجلی تازەی شیعرەوە
ئەو جلانەی کە خەیاتە باریکەلەکەی خەیاڵی خۆم
لە ژوورە نسرمەکانی تەنیایی و تەریکیدا
هێور هێور لەبەر فانۆزێکی هیلاك
بۆی بڕیم و بە تەقەڵی وردە هەنیسکی شەوانە
بۆیشی دروومۆ!

هەر بە کاڵاو
هەر بە پێتاوی شیعرەوە
بەو کلاوەوە
کە پەپووسلێمانکەیەکی عاشق
بەدەم خوێندنی سورەتی ئەوینەوە
لەسەری کردم و
بەو بۆینباخەوە کە دارهەنارێکی بێوەژن
بە دوو دەستی لەرزۆکەوە

بۆی بەستم و

هەر بەو کڵاشە دۆمیانەیشەوە
کە داربەڕوویەکی هەورامان
دوای خوێندنەوەی پێدەشتێکی پەخشانم
لە بەردەمی هۆرەیەکی کاکۆڵ درێژ و
"کنالەیلێکی" چاوڕەشدا..
لە شارەزوور پێشکەشیکردم!
هەر بە کراسی شیعرەوە
وەك پۆشاکی
چیای تەم لە دامێندا گرمۆڵە بوو
وەك بەرگی گڕەژۆی[1]
دارستانێکی کۆست کەوتوو..
هەر بە جل و بەرگی شیعرەوە.. ئەڕۆم
بێ مۆڵەت وەرگرتن.. لە یەکەم ڕەشنووسی تووڕەم.
بێ مۆڵەت وەرگرتن.. لە ڕەشەبا چەنەبازەکەی ڕەخنەگر
بێ مۆڵەت وەرگرتن.. لە بازگەی هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێ
لە هیچ کەوشەنێ و لە هیچ پیرەرێو
لە هیچ داوێکی سەرەڕێ.
ئەڕۆم
هەر بە کاڵای مۆسیقاو چریکەوە ئەڕۆم

---
[1] گڕەژۆ: گەڵارێزان

**واتە بەو جریوەو جووکەو نەغمانەوە**

**بەو گڕاگڕو[2] گژەگژەی[3] ژانانەوە ئەڕۆم**

**کە لە بێشەی لەشمەوە دێنە دەرێ**

**بە چکچکەی[4] ئەو دڵۆپە زیوینانەوە**

**ئەو دڵۆپی حەسرەتانەوە ئەڕۆم**

**کە لە نامۆییم ئەتکێنەوەو**

**ئەچۆڕێنەوەو**

**ئەبریسکێنەوە.**

**ئەڕۆم پێبەپێی ڕۆیشتنی شپرزەیی**

**شانبەشانی ڕۆیشتنی سەراب**

**قۆڵ لە قۆڵی پاییزدا**

**ئەڕۆم..**

**چۆن هەوری ڕاونراو لە گاپێڵی[5] کێواندا.**

**بە شێوەی (با) یەکی ترساو لە چەخماخە.**

**بە وێنەی کیژۆڵەیەکی قوتاربووی ئەوسا**

**لە هەوای هەڵەبجە**

**ئەڕۆم..**

**هەر بەو شمشاڵی ئاخ و داخانەوە**

---

[2]گڕاگڕ: کڵپەو بڵێسە

[3]گژگژە: پووش و پەڵاشی بابردە.

[4]چکچکە: دەنگی دڵۆپە.

[5]گاپێڵ: پێچی شاخ

که برینەکانم بۆ تەنیاییمی ئەژەنن.
بە پەڵە خوێنی نەوتاوی کەرکوکی سینەمەوە
کە بەردەوام سەری بڕڕاوی تیا هەڵدێ.
ئەڕۆم
بە خۆم و دەسکەنەیەك
لە قژی ئەو ژنەوە ئەڕۆم
کە شمشێری فەتوایەك
لەسەر تاوێرە بەردێکی تەوێڵە
بە نێوی خوداوە، گەردنی ڕفان و
لە دواییدا وەك دیاریی دای بە منارەیەك!.
ئەڕۆم و
سەفەرێکی تازەم لەبەرە
سەفەرێ بە پێی پەتی خەمان.
سەفەرێ بە سواری تراویلکەو
سەفەرێ بە سواری هەواڵی ناوەخت و
سەفەرێ بە سواری دووکەڵێ
کە پاشکۆو خورجینی
پڕکردووە لە چاوی کوژراوی باران!.
سەفەرێکی تازە
بۆ مەملەکەتێ لە شارەکانی خۆڵەمێش
بۆ مەملەکەتێ لە کوچەو شەقامی بێدەنگیی
بەڵام پڕ لە خەڵکی

پڕ لە گۆرانیی نوستوو..

پڕ لە شووشە شەرابی شکاو

پڕ لە کوێرە کانیی

پڕ لە ئێسك و پروسکی هەتاو

سەفەرێکی تازە

بەرەو سەعیری بنەوە

بەرەو بن بیفی تەم و مژ

لە بندینی گریان و فوغانی ئاوەوە ئەڕۆم.

سەفەرێ کت و مت وەك سەفەری

باڵندەیەکی بەچکە لێونبووی وێڵ و شڵەژاو.

چون تیلماسکی هەورێکی برینداری

لە ئاسماندا لێقەوماو..

چون سەفەری جۆگەیەکی سەرچاوەکوژراو

کە هەر ئەڕواو بە دەم شەپۆڕی نێرینەی شەپۆلەوە

وڕێنەیەتی و نە ئەتوانێ بگەڕێتەوە

سەر خوێنی سەرچاوەو

نە ئەیشزانێ لەبەر دەمەوە

بە کام تووناوتوون ئەگات و

بە کام جەیحوونی نادیارو بەکام گراداڤ و(*)

لە کوێدایە چارەنووسی ئاو!.

هەر بە جلوبەرگی شیعرەوە

(*) گراداڤ: ئاوی بەخوڕ کە خول ئەخوا.

هەر بەو پۆشاکانەوە

کە بادی خۆش مروری نالیی پۆشیبووی

ئەڕۆم و کەڕەتێ ئەبم بە سەمەندەرو

بە چریسکەوە[6] باڵ لێك ئەدەم و

کەڕەتێکی دی ئەبمە پەپووی وێرانە خاك و

لەناو گارۆی[7]

درەختی گریاندا هەڵئەنیشم و

جارێکی دیش ئەبمە سێبەری ئەنجن ئەنجنی شاخ و

لە دواییشدا بە شەوقی تینووی سوورە هەتاو!.

هەر بە جل و بەرگی مۆسیقاوە..

بە کاڵای تەمبورو باڵەبانەوە

بە سڵسڵەی وەزنەوە

وەختێ ئەمکا بە لەنجەی کلێپەداری وشەو

کاتێ ئەمکا بە سەمای پەلوپۆداری ئەشکەنجەو

لە ناکاویش بە تەپ و تۆزی کاروانی جەستەی

کۆستێکی درێژی لەو خوارە بەجێماو!

ئەڕۆم و

سەفەرێکی تازەم لەبەرە، سەفەرێکی شین و مۆر.

بە خۆم و جانتا ڕەشەکەی بن دەستمەوە ئەڕۆم

کە لە دە گیرفانی خۆشەویستیی زیاتری هەیە و

---

[6] چریسکە: بریسکە.

[7] گارۆ: هێلانەی مەل لە کونی داردا.

له هەر گیرفانێکیشدا، تیشکێ، یان پەندێ
یان باڵندەیەك، یان قەسیدەیەك، یان
تەمێکی لەناودایە!.
ئەوەتا لە یەکەم گیرفاندا
شپرزەییم گمەگمێتی و
لەسەر هێلکەی شیعرێ کڕکەوتووەو
خەریکە مانگەشەوێ هەڵبێنێ!.
ئەوەتا لە دووەمدا
لاواندنەوەی دایکم
بووە بە تووتاکێکی[8] ڕەش و سپی و
لە نێوان خەزانە خەمێکی درێژو
ڕنۆ بەفرێکی کلۆڵ و قەتیسدا دێت و ئەچێ!
لە سێهەمدا نامەی کچێ
کە پڕێتی لە پەلکەگیاو لە شەونمی حەرف و
لە زەنگینانەی پرشنگ و
بووە بە بالیفی خەیاڵێکم و
شەوانە پژاڵی[*] تەنیایی لەسەر ئەڕوێ!.
لە چوارەمدا (با)یەکی ئاوس خەریکە
ژان بە دووانەی باران و برووسکەوە بگرێ!.
لە پێنجەمدا.. پەڕی شەبەنگێ ئەوەرێ.

---

[8] توتاك: قومری، جۆرە کۆترێکە وەك تاق تاقکەرە.
[*] پژاڵ: لکی هەرەباریکی دار.

له شەشەمدا.. هەر لە خۆوە وشەیەکی جەحێڵ ئەمرێ.
لە حەوتەمدا.. ڕەنگێکی تازە هەڵئەفڕێ.
لە هەشتەمدا.. لە پڕێکدا وەیشوومەیەك دائەبارێو
لە نۆیەمدا.. بەفرم ڕەش ڕەش هەڵئەگەڕێ و
لە دەیەمدا.. کێلانێکم ئارام ناگرێ و
لە تیغی خۆی ڕائەپەڕێ!.
هەر بەو جانتایەوە ئەڕۆم..
ئەمجارەیان زۆر دوور ناڕۆم
هەتا سنووری باشووری ئەم زمانەو
جوگرافیام، ئەدەم بە کۆڵی مێژوودا و
مێژووم ئەسپێرم بە ئەسپێ و ئەسپیش سەری
خۆی بە سەحرای پەراگەندەکان ئەسپێرێ.
من بەسەر پشتی ئەسپەوەم
هەتا بەر دیواری بابل ئەیئاژووم و
لەوێوەڕا سەریش لە خاکی سۆمەرو
مەملەکەتی تەمووز ئەدەم
من بە شوێن ئێسك و پرووسك و کاسەسەرم و
من بە شوێن خۆمدا ئەگەڕێم.
ئەمجارەیان زۆر دوور ناڕۆم
بەڵام قووڵ قووڵ
بەرەو جیهانی بنەوە دائەگەڕێم
من ڕۆئەچم و سەرنج شۆڕ شۆڕ ئەکەمەوە

**تا ئەو شوێنەی**

**کە ڕووبەڕوو مەرگ ئەبینم!**

**ئەمجارەیان من سەرزەمین بەجێدێڵم**

**هیچ کارێکم بە ئەستێرە و بە داروباری سەرەوەو**

**بە شەقام و بە تەلارو بە خۆر نییە**

**هەر بەرەو بن دائەچۆڕێم**

**لەناو نیشتمانی گڵدا**

**لە وڵاتی خۆڵ و قوڕدا**

**بۆ ئاوی کوژراو ئەگەڕێم!.**

**بۆ ئەو پەری و فریشتانەی یەزدانی شووم**

**یەکە یەکە فڕاندنی.**

**لە بنەوە پەل ئەکوتم بۆ نەهێنیی**

**تا بە ڕووتو قووتی بیگرم!.**

**لە بنەوە خوا ئەدوێنم و**

**هەرچی بێدەنگیی زەمانی تاریکایی و**

**تەنیاییە ئەیهەژێنم.**

**لە خوارەوە**

**لە بنی بنەوەی نەخشەیەکدا**

**کە بورکانێك تیا نوستووە**

**من ئەمەوێ توورەی کەم و هەڵیسێنم!**

**زۆر دوور ناڕۆم**

**هەر لە نەخشەی مەرگی ڕەنگاوڕەنگی خۆمدا**

له چوارچێوەی دیرۆکێکدا
کە هەر ناسنامەی دۆزەخ و
خۆڵ و تۆزی بزر بوونی
بە من بەخشیی
سەفەر ئەکەم.
زۆر دوور ناڕۆم!.
من هەروەکوو باگژەیەك
کە سەحرا شێتی کردبێ و
سەراب جێ پێی هەڵگرتبێ و
چون تەندوورەی گێژەڵووکە
بە چواردەوری لەشی خۆمدا ئەخولێمەوە!.
یەك مەنزڵی دیارم نییە
یاخود ئەدرەسێ بۆ دواجار
ڕووی تێکەم و بڵێم لەوێ
ئیتر سەرم لە باوەشی
دوا سۆراخدا وەك سروەیەك
دا ئەسەکنێ و
بڵێم لەوێ
وەڵامێکی چون یەقینی
خوام دەسکەوێ!.
من بە نادیاردا ئەگەڕێم
دەلیلم شپرزەییەو

سەرابێ پێشم ئەکەوێ!.
هەموو چۆڵەوانی و دەشتێ
هەموو قاقڕو کاولاشێ
بانگم ئەکەن
قەلەڕەشکە و داڵ لە مندان.
پەپوو ناوچەوانی منە.
لە هەر کوێیەك کە بێدەنگیی
پارچە عەردێکی یخ دابێ
لە هەر شوێنێ کە نەهێنی و
مەرگ و ونبوون لەوێدا بێ.
لە هەر شوێنێ بۆنی گومان و ترس و لەرز
بۆنی زریکەو ناوی خوا
لەگەڵ خۆڵدا تێکەڵ بووبێ
ڕووی تێ ئەکەم!
بە ڕێگەکانی دووکەڵدا
سەفەرێکی خۆڵەمێشیی
بە دەشت و دەری هاواردا
سەفەرێکی وەیشوومەیی.
بەناو ژمارەی بزردا
سەفەرێکی بێ ئاکام و
بەناو لاڵبوونی زمان و
بەناو کەڕبوونی دنیادا

سەفەرێکی بێ کۆتایی

من ئیستا وەك مەراق ئامادە و

چون هاوار لەسەر پێم!

ئەپرسم: لە پێشدا پێ بخەمە

کام خاکی واوەیلاو کام عەردی زریکەو

کام وەرزی کوژراوی لەشمەوە؟!

سەرەتا بچمە ناو

کام گەرووی زایەڵەو

کام ماڵی گەڕۆکی مەرگمەوە؟!

یەکەمجار سەر بکەم

بە چیدا؟

بە تەمدا؟!

بە خوێندا؟!

بە گڵدا؟!

بە کوێدا؟!

لە بەردەم کام دەشتی شیوەن و

کام هەوای خنکاو و کام گۆڕی ئەستێرەو

دەربەندی قیژەدا بوەستم؟!

پێم بڵێن: چۆن بڕۆم؟!

ڕاستە و ڕاست؟!

چون پرسی برینی دڵنیا؟!

بەرەوخوار

بۆ دنیای ژێرەوەی تارومار؟!

بەرەو ژوور، بۆ لای خوا؟!

چۆن بڕۆم؟

بەرامبەر سەرابی خۆرئاوا مل بنێم؟!

یان هەڵمی سورباوی ڕۆژهەڵات؟!

پێچاوپێچ؟!

بە وێنەی گینگڵی، ئاشقەو ماشقەی

شەپۆلی نێو زەریا؟!

پێم بڵێن: چۆن بڕۆم؟! لەگەڵ کێ؟!

بە قسەی کام خۆڵ و، کام لم و،

کام سەحرای عەدەم و

بە قسەی کام ڕەنگی پەلکەگیا و

کام پووش و پەڵاشی ڕومادی و کەربەلا و

بە قسەی کام لاڕێی ڕەشەباو

کام دالّی نوگرەکەی سەلمان و

کام جرجی خوار بەغدا بکەم و

کام گومان بکەمە

ڕێبەری سۆراخی سەفەرم؟!

پێم بڵێن: چۆن بڕۆم؟! لەگەڵ کێ؟!

ـ لەگەڵ من!

من ئەگەر پێشت نەکەوم

نە ئەسپی ئەفسانەو نە مەراڵی[9] خەون و

نە تەیری شیعر و نە بای جادووگەر

بەو مەرگانە نازانن

نە یەکەو نە دووەو نە سێیەو نە هەزار

شوێنم کەوە

دەسبگرە بە پرچمەوە

من ژنێکی خەڵکی "زینانە" م

ناوم "کاڵێ"یە

سەرگوزوشتەی دۆزەخ و دۆزەخەوان و

بەیتی حەشرو قیامەت و حیکایەتی دابڕان و

هەڵقرچان و، هاتنەوە لە وەو دنیاوە

لە لای منە!

ئەوەی کە ئاو پێی ئەزانێ و

ئەوەی کە داری سەرەڕێ و باڵندەکان

پێی ئەزانن، کورتەی خەمە و ئێجگار کەمە.

من بۆ خۆم قیژەی ناوچاڵ و

من ڕەنگی شەوی دڕندەو

من بۆنی جەستەی پاسفندەی[10]

بەردەم سەگەڕەشی ئەوێ و

---

[9] مەراڵ: ئاسك.

[10] پاسفندە: گەندەڵ، ڕزیو.

ئافاتەکەی سیاساڵ بووم!

من بۆ خۆم چوومە پێخەفی مردنەوە

من خۆڵەمێشیی ئەویٚ بووم

من لەویەوە هاتوومەوە

لە هەزاران هەزار گوڵ و

لە هەزاران هەزار کانی و

لە هەزاران هەزار قومری و

شەنگەبێری و، ئەسپی پیرو، جوانووی شاخ و،

لە سمۆرەو، لە کەروێشك و، لە پەپوولە

هەر سیٚ چواریٚ گەڕانەوە!

تۆ دەسبگرە بە پرچمەوە

شوێنم کەوە، من لەویەوە هاتوومەوە

ـ نە پەلك و نە باویلکەو

نە پەمووی بابردوو بوون!

نە پاشەڕۆی دڕك و داڵ و نە عوجاج و

ئێوەم لە تۆزدا بینیەوە.

گۆرانیەکانتان وەکوو کراسی بەرتان

ڕزیوو، هیواکانتان،

لە بەردەم ئێسك و پروسکا وردوخاش و

هەتاویشتان لە مەملەکەتی ناو شەوی خۆڵدا

ئەیزریکان!

نە ڕۆژنامەی دڕاو بوون و، نە پەڕە مریشك و

نە قوتوی فڕێدراو و نە شووشەی شکاو و
کەچی بوون بە هەموویان!
قەڵەم و جزدان و هەندێ دراوی ئاسن و
بازن و مت و موروتان
ملوانکەو ئەڵقەی پەنجەتان
هەر هەموویان،
جگە لە خۆتان بێ وەی بوون!
ئاپوورەی (مانگ)ی نوستوو بوون
خەرمانەتان تۆزو خۆڵ.
لەپەو ڕوو یان لەسەر پشت پاڵکەوتوو
چاڵی چاو و، کاسەسەرو، کونی لووت و
ناو دەمیش.. ماڵی تازە
بۆ دوپشکی بیابان!
ـ دەس بگرە بە پرچمەوە
یان بە لکی درێژی خەممەوە
یان بە دووکەڵی دەنگمەوە
شوێنم کەوە!.
ئەمە نە ورێنەی شیعرەو
نە ڕێشکەو پێشکەی بەرچاوی خەوەو
نە ڕایەڵەکانی فانتازیای خەیاڵ:

ـ "تۆپزاوا" یەکەم هاوینە هەواری خێڵی مردن!

یەکەم ئێزگەی دەنگی تیژی پەپوویەکی شەوەزەنگی
باڵ لە ئاسن!.
تۆپزاوا.. دەشتێك لە ترسی ترساو و
بەراییەك لە ڕامانی خوداوەندی بێ قودرەتی
بەردەم دۆڵپاكانی بەغداو
چوڕستانێ لە پرسیاری سەرگەردان و
پرسگەیەك بەر لە دەروازەی جەهەننەم!.
تۆپزاوا.. خەریتەیەك لە نەهێنیی
پێچاوپێچی سەراب و تەم.
بەنگەڵەیەك، دوو بەنگەڵەو، بیست بەنگەڵەو
درێژ درێژ، لەمسەری هەوای خنكاو و تاساوەوە
هەتا ئەوسەری بێدەنگیی ئاسۆیەكی پشت كۆماوەم..
دنیا زەلیل
جادە زەلیل، شاخ زەلیل و ئاو زەلیل و
سروشت زەلیل
زیلێك، دوو زیل و، هەزار زیل
لێرەوەیە كۆچێكی سوور، كۆچێكی دوور
ڕێچكە ڕێچكەو، كاروان، كاروان
هەناسەی بەفر هەڵئەگرێو
شەوقی مانگەشەو هەڵئەگرێ و
خەندەی ناو بێشكە هەڵئەگرێ و
لاوك و حەیران هەڵئەگرێ و

له دواییدا (با) ی گڕاگڕ
یەکە یەکە لەناو وەیلا
دایان ئەگرێ!.

ـ لێرە زەبوونە ڕووناکیی
زەبوون.. زەبوون
خراوەتە ناو تەندووری دەبابەوەو
هەردوو چاویشی بەستراوە!
لێرە مەلوولە گۆرانیی
مەلوول.. مەلوول
خراوەتە ناو گەرووی لوولە تۆپەوەو
دەم و لێویشی دووراوە..
لێرە ئەسیرە ئازادیی
ئەسیر.. ئەسیر
خراوەتە ناو سنووقە فیشەکەوەو
سنووق لەسەر
لێواری مەرگ دانراوەو
فتیلێکی لێ بەستراوە!.
لێرە.. لێرە.. لێرە
لێرە قەدەغەیە کزە
گەورە ببێ و لە دواییدا
ببێ بە گڤەی ڕەشەبا!.

**لێرە قەدەغەیە گزنگ**

**پێ بگرێت و باڵا بکاو**

**ببێ بە سوورە هەتاو و**

**بچێتە سەر لووتکەی چیا!.**

**ـ کۆمەڵێ پیاو، دەوالی[11] (مانگ)ی عاشقان**

**بە نەهێنیی دوای نیوەشەو!.**

**دەوالی چرای هەژاران**

**وەختێ چرا تازە چاوی چووبێتە خەو!.**

**کۆمەڵێ پیاو، دژی زەردەخەنەی ئاو و**

**دژی خونچەو دژی ڕەنگی سپی و هەتاو**

**کۆمەڵێ پیاو لە ترومی[12] هێلکەی پیس و**

**لە نەژادی بەربەریەکان!**

**کۆمەڵێ پیاو، هەموو لە قوڕی ئەمەوی.**

**کۆمەڵێ سەر، هەموو لە دوورگەی تاریکیی**

**کۆمەڵێ دەس، هەموو لە شمشێری حەجاج**

**کۆمەڵێ ڕەنگ، هەموو لە ڕەنگی ئافات و**

**کۆمەڵێ دەنگ، هەموو لە دەنگی نەهات و**

**کۆمەڵێ بۆن، هەموو لە بۆنی شانزەی سێ و**

**پەیامێکی مەنجەنیقی و**

**پەیامێکی بێ پرسیارو**

---

[11] دەوال: دزی شەوانە.

[12] تروم: نەژاد، ڕەگەز.

مێژوویەکیش لە منارەی کەللەسەرو
سەروەرییەك: لە جۆگە خوێنی ئەبەدیی!.
ـ تۆپزاوا !، لە پاییزا نیوە شەوێ
بەدەر لە تەقویمی دنیا
هی زەمانێ، کە کاتژمێر
سەعاتی خۆی تیا سەرئەبڕیو
چاڵی بۆ خولەکی جەستەی هەڵئەکەنی و
بە خۆڵی چرکەکانیشی دایئەپۆشی!
بەدەر لە هەموو ژیانێ
لە پاییزا نیوە شەوێ
لەناو سەرسەڕی بەنگەڵەی سێیەمدا بوو:
ئەڵقەیەك ژن، ژنە خەزان، بازنەیەك
لە عەبدی مێی سەروقژ بژ. پەڕەسێلکەی
ڕەش و سپیی دەم بە نزا. کۆمەڵێ ژنی هەڵوەریو،
وەك لق و پۆپی ڕووتاوەی درەختێکی بەر ڕەشەبا.
جارێك سەریان بە یەکەوە ئەنووسان و
لە ناکاویش دەستیان لە یەکتر بەرئەدا.
ئەڵقەیەك ژن. لە ڕەگەزی گەڵاڕێزان، لە توخمی
شەوی تەمتوومان. بووبوون بە پەرژین بۆ ژنێ
لە ناوەندا ئەیزریکان. ژنەی ناوەند پاڵکەوتووەو
لەسەر پشتە و نیوەی لەشی لە باوەشی چەند ژنێکداو
نیوەکەی تری بەرەڵڵا، وەختێ ئازار گرژ ئەبۆوە،

به پڕاوپڕی بەنگەڵەو بە پڕاوپڕی زەمان و ئەم دنیایە
ئەیقریشکان. تەوژمی ژان و جۆگە خوێن، لەناو
گەڵدا، لەگەڵ تیشکی گڵۆپێکی زەردا و لەگەڵ
نزاو لەگەڵ ویردا تێکەڵ بە یەکتری ئەبوون لەبەر چاوی
پیسی قەمەو بەر تەماشای چەند نیزەدا.
جۆگەلەی خوێن لە ژێرەوە دزەی کردوو
چووە دەرێ و ئەڵقەی بەزان، ئەوسا ئیتر نزاو ویردو
قیژەی ژنەو، هەوای ژوورو، کۆنکرێت و،
سەروملی مشایەخ و، ئەسحابەکان، بە پرژە پرژی
ئەو خوێنە هەر هەموویان سوور هەڵگەڕان!..
لە پاییزا نیوە شەوێ
بەدەر لە ویژدانی دنیا
لە بەنگەڵەی فەنابووندا، کچێکی بوو
بە قەد پەپوولەیەك نەژیا!
ـ چیتان بۆ بگێڕمەوە؟ چی؟ چیرۆکی سەمای ئەو
ئاوەڵ کراسانەی کە "قەحطان" و "عەدنان" و "دەحام "
بە پێش دەمی قافڵەی زیلەکانەوە هەڵیان ئەواسین؟!
ئاوەڵ کراسی خۆم و دایکم و خانزادو مەستوورەو عادلە خانم و
حەپسەخانی نەقیب و عەنبەر خاتوون؟ کە یەك بەدوای یەکدا
لە زاخۆوە هەتا قەڵاکانی سەلمان ئەشەکانەوە؟ چیتان بۆ بگێڕمەوە؟!
چی؟ حیکایەتی منداڵەکەم کە لە ئاودەستێکدا بووم و تەمەنی
چارەکە سەعاتێك و لە دواییدا لەناو قاقای عەسکەرێکدا مرد؟!

ئاخر چی بگێڕمەوە، زەلیلی کە بووبووە کراسی شیتاڵ شیتاڵی بەرمان؟

حەیا کە قەترە قەترە ئەتکاو "نەزهەت تۆغان" ئەیخواردەوە؟!

چیرۆکی ئەو بەفراوانەی ئەبوون بە گڕەو

ئەو هەڵاڵانەی ئەبوون بە عوجاج؟!

حیکایەتی ئەو جەستانەی وردە وردە کرمەڕێز ئەبوون و

ئێمەیش کرمەکانمان لە برساندا ئەخوارد؟!

چیتان بۆ بگێڕمەوە؟!

ئاخر زریکە چۆن ئەگێڕدرێتەوە؟!

قیژە چۆن ئەنوسرێتەوە؟!

عەرعەر چۆن ئەخوێنرێتەوە؟!

ئەبێ خۆڵ قسە بکات خۆڵ!

ئەبێ چاڵ قسە بکات چاڵ،

مارو مێروو بیگێڕنەوە

ئەو چاوانەو ئەو گۆی مەمك و ئەو کاکۆڵ و زەردەخەنەو مەقامانە چییان لێهات؟!

ئەبێ خودا خۆی ڕۆژێ سەرمان لێبداو

پێمان بڵێ ئەو ڕۆژی حەشرە چۆن ڕوویدا؟!

"لە تاریکە شەوێکی هاوینی 1988 دا. هەر لە ڕۆژئاوای "تۆپزاوا"وە بە چەند کیلۆمەترێ دوور. دەحام لەسەر گردۆڵکەیەك ڕاوەستابوو. لەویەوە چاودێری هەڵکەندنی ئەو ڕیزە چاڵانەی ئەکرد کە چەند شۆفڵێ بەردەوام لەوزیان تێژەنیبوو. "قەحتان و عەدنان" یش لە دامێندا هات و چۆیان بوو. دەحام لە هەڕەتی هێزو گوڕو سەرکەوتندا بوو. دەحام لەبەر خۆیەوە ئەیوت:

ـ ئێمە واهاتووین کە نەڕۆین!

هەروەکوو چۆن شمشێر هاتە ناو خوێنەوەو

ئیتر نەڕۆی!.

ئەسپ هاتە ناو شاڵاوی قادسییەو یەرموکەوەو

ئیتر نەڕۆی.

باهۆز هاتە ناو دەنگی سوارچاکانەوەو

ئیتر نەڕۆی.

دیجلە هاتە ناو جەستەی ئەم،

عێراقەوەو ئیتر نەڕۆی!

باز هاتە ناو ئەم ئاسمانی عەرەبەوەو

ئیتر نەڕۆی!

ئێمە وا هاتووین کە نەڕۆین

مانەوە لەناو تەماشای یەك بەیەکی ئەم خەڵکەدا..

مانەوە لەناو بێدەنگی و، لە نادیارداو،

لە چرپەچرپی زمان و جوڵانەوەی دەست و پەنجەو

لە شەوگاری هەناسەدا!

هەموو شتێ بە ڕەنگی خۆمان ڕەنگ ئەکەین

ڕەنگی دوورگە، ڕەنگی سەرۆك، ڕەنگی قائید

ئاوو هەواو، شاخ و دەشت و، داروبەرد و

لەدایك بوون و مردن و هەموو شتێ

بە ڕەنگی خۆمان ڕەنگ ئەکەین.

هێز. هێز. هێز. هێز

حەقیقەتێ.. لە یەزداندا و لە ئاسندا و

لەناو چەکدا و لە مستەکۆڵەی ئێمەدا.

حەقیقەتێ.. لە ئاگردا

لەم ڕاجیمە و زرێپۆش و خومپارانەو

لە لوولەی ئەم تۆپانەدا!

وەك ڕابوردوو

ملمان کەچکرد بە زریانی ئۆقیانوس تا

پاردەی چین و ئەندەلوسمان وەك موستیلە

کردە پەنجەی مێژوومان و

دنیامان وەك ئەسپ زینکرد!

ئەبێ ڕابوردوو بێتەوە بەردەممان و

خۆمان هەڵدەینە سەر پشتی و بیئاژوین بەرەو ئایندە!

من ڕاوەستاوم لە مەجدا

سەرم لەناو ئەستێرەداو

قاچم لەسەر تەپڵی سەری

شاخ داناوە!

هەموو کێوەکانمان یخ داو.

گەیشتینە دوا نوختەی بەردو نەهێنی

ئاومان گۆڕی بەو شێوەیەی گوللە ویستی.

بامان گۆڕی بەو شێوەیەی بۆمبا ویستی.

وەرزمان گۆڕی بەو شێوەیەی قائید ویستی.

مێژووی یاخیمان هەڵتەکاند

بەو شێوەیەی کە barووت و تەقینەوەی

باوەڕ ویستی

تەماشاکە وا ئیستاکە نەك هەر خۆیان

کام چیایان زۆر بڵندە، دانەویوەو

لەسەر چۆکە!

وەختێ هاتم هەر لە ڕێوە

من بەزەییم فڕێدایە چاڵێکەوەو

هەتا نەمرد بەجێمنەهێشت.

هەر لە ڕێوە من فرمێسکم

لەم چاوانەم قەدەغە کرد

هەتا نەمکوشت

بەجێمنەهێشت!

لەم ساتەدا شەوەزەنگ ئەزرنگێتەوە.

مانگ دیار نییەو هەر چاوی شۆڤڵ ئەبینێ و

هەر دەنگی شۆڤڵ ئەبیسرێ و، وا ئێستاکە

من لەسەر گردێ وەستاوم

گرد نووزەی دێ و لە دامێندا

شەوقی تیژی شۆڤڵەکان

ڕیزە چاڵێ نیشانئەدا..

ڕیزە چاڵێ هەڵکەنراون

چاوەڕوانی پڕبوونەوەن:

بە حەرف و وشەی زمانێ کە غەریبن بە زمانم.

به دیرۆکێ که یاخییه له دیرۆکم.

بەو سەرو دەست و قاچانەی

له نەژادی مەجوسن و

لەم بەهەشتی ولاتەدا جێگه ئەگرن!.

لەسەر گردێ ڕاوەستاوم.

گرد نووزەی دێ و

لەناو دەنگی گرمژنی(*)

حەففارەدا، پاڕانەوەو

زریکه و قیژه و هاوارو

تا هاژەهاژی زەریایشی

تیا ون ئەبێ!

"له هاوینی 1989 دا و له ژێر زەمینی ماڵێکی شاری سلێمانیدا شاعیرێکی گەنج. سەربازی فیرار، خەریکی نووسینی کۆمەڵێ لەو قیژه و زریکه پەرت پەرت و خۆڵاویانه بوو که له سەحرای عەرەبستانەوە هاتبوون و دوای ساڵێك گەیشتبوونه ژێر زەمینەکەی ئەم. به داخەوە ئێمه لەو هەموو هەناسەو قیژەو زریکه و وێنەو ئاوێنه وردوخاشانە، ئەم چەند نمونەیەمان دەسکەوت"

**یەکەم:**

لەو بیابانەی خوارەوە

له هەر جێیەك هێڵەکێ خۆڵ

ببێژنەوە

---

(*) گرمژن: دەنگی ڕووخانی گەورە.

لەسەر کۆزەری هێڵەکدا
ئەبێ هەر وردە نینۆکی پەنجەیەك و
یان وردە ئێسکی لۆلاقی
کوردێکی تیا بدۆزنەوە!

دووەم:
گوێچکەی شیعرم
زۆر پووکەپووك و کڕووزە و
ناڵەناڵی عومری خۆمی بیرچۆتەوە
بەڵام ئەوەی کە بەردەوام
لەناو گوێچکەی شیعری مندا
دێت و ئەچێ و ئازارەو ئەزرنگێتەوە
زریکەی ژنە ئەنفال و کچەکانمە و
هەتا ئەمرم
ئەم کاروانی زریکەیە
هەر دێت و دێ و دوایی نایەو
نابڕێتەوە!

سێیەم:
ئەو ڕۆژەی خۆڵ بێتە قسەو
بڵێن بدوێ و یان بنووسە و لە جیهاندا
پێشبڕکێیە لە ئازاردا

من دڵنیام ئەرزێك نییە لە دنیادا
خۆڵێك نییە لە دنیادا
ئەوەندەی كۆستی لای ئێمە جوان بنووسێ و
پڕ بێ لە شەوی ڕۆمان و
لە ئاخی كورتە چیرۆك و
لە ئەشكەنجەی شانۆنامەو
لە داهێنانی ناو مردن

من دڵنیام ئەگەر غەدرمان لێنەكرێ
نۆبڵی خوا
لە خەڵاتی مەرگەسات و بێ كەسیدا
هەر ئەم كوردە وەریئەگرێ!

**چوارەم:**

تەنها وەختێ
كە خواوەندی تیا نوستبوو
حەقیقەتی تیا نوستبوو
ساڵی ئەنفالی ئێمە بوو!

**پێنجەم:**

لەوەو دنیا
كە قوربانیەكانی ئێمە هەڵئەسنەوەو
ئەچنە بەر بارەگای خوداو
بە یەكەوە هەموو خۆیان ئەتەكێنن!

ئەو تۆزەی لەوان هەڵئەسێ

سەراپای عەرشی خواوەندو

پەروەردگار دائەپۆشێ!

**شەشەم:**

مێژوویەکە

هاوارمان هێندە تەنیایە

برینمان هێندە بێکەسە

تەنیایی لێمان بێزارەو

بێکەسییش لێمان وەڕسە!

**حەوتەم:**

شەوێك ئەسیاری[13] هەناسەی

ڕۆژژمێری هەشتاوهەشت بووم

ئەمویست گۆڕیچەی بژمێرم

ئەمویست هەنسکی بژمێرم

ئەمویست فرمێسکی بژمێرم

هەتا خودی ژمارە خۆی

هاتە جواب و

وتی: چێکەی؟!

منی ڕۆژژمێر ناوێرم

مەرگەساتی تۆ بژمێرم!

---

[13] ئەسیار: ئێشکگری کاروان.

**هەشتەم:**

ئەڵێن ژنێکی گەرمەسێر
داویەتیە دەشت
بووە بە گڕەی بێ دالْدەو
بە تەوارێکی شێت و وێت
ئەڵێن بووە بە زیگاری(*)
سەرقەبرانی باڵندەکان..
بووە بە زێوانی گردی
دار چوالە جوانەمەرگەکان..
خەڵکی ئەڵێن هەر کەس بە لایدا تێپەڕێت
گوێی لێ ئەبێت
ژنە ئەڵێت:
زۆرجار شتم لێ ونبووە
جارێك مریشکێکی کونـج و
جارێکی دی دوو جووجەڵەو
لە بیرم بێ دوو موستیلەو
دوو جاریش دوو پەنجا فلسی و
جارێکیشیان کارژۆڵەیەك
بە دوایاندا من ناوماڵ و ماڵە هاوسێ و
ئەم ڕێ و بان و دەشتانەیان بۆ گەڕاوم

---

(*)زیگار: شەونشینی.

بەڵام ئیستا من سۆمای چاوم ونبووە
من ڕوانین و من بیستنم لێ ونبووە
دەستەکانیان لێ دزیوم..
کوولەکەی ڕۆحیان بردووم و
من ژیانم لێدزراوە..
من نازانم
ئاخر کوێیان بۆ بگەڕێم؟!

**نۆیەم:**

چونکە ئەوان لەو دوورەن
چاوێك نییە لە منەوە نزیك بێ!.
چونکە ئەوان زۆر تینوون
ئاوێك نییە لە منەوە دوور نەبێ.
چونکە ئەوان پەشموردەن
شتێك نییە لەناو مندا شین ببێ
چونکە ئەوان نادیارن
منیش دیارم نەماوە.

**دەیەم:**

من هەر دانیشتووم
بەرامبەر شاتووی داوێن پەمەیی و
چۆلەکەیەك دێ و ئەنیشێتەوەو
لە جریوەیدا هەواڵی پێیە:

ـ هێشتا هەر ماون

سڵاویان هەیە!

من ڕاوەستاوم بەرامبەر هەوری

هەناو فەترانیی و

دێتە سەر سەرم و گرمە گرم ئەکاو

هەواڵی پێیە

ـ وان لە شوێنکێدا

منیش ناوێرم بە سەریا ڕەتبم!

من درێژبووم و (با)یەکی گێژی

کراس خۆڵاویی

ئەگاتە لام و هەواڵی پێیە:

ـ لە تۆپزاوان

هاوار هاوار و زریکەو قیژە

منی کەڕکردوو

شەوانە ژانی ئەو هەموو ژنە

منی کوێر کردوو

وام بەم حاڵەوە

گەیشتوومە لات!

**یانزەهەم:**

هەموو جارێ

بە دۆڵەکەی ئەسحابانا

کە ڕەت ئەبم

دره‌ختی سه‌ر شه‌خسه قه‌برێ
ڕامئه‌گرێت و دێته پێشێ
به چڵێکی، تیز به پاشمه‌وه ئه‌کات و
پێئه‌که‌نێ و دوایی ئه‌ڵێ:
گه‌وجه! ئه‌وه‌ی له‌بن مندا ڕاکشاوه‌و
جارێك لووتی و
جارێکی تر تۆ قاپه‌کانی ماچ ئه‌که‌ی
گڵی ئه‌خۆی
خۆڵی ئه‌خۆی
یه‌که‌م ئه‌ستێره‌ت ئه‌م کوشتی و
یه‌که‌م کانیت ئه‌م خنکاندی و
یه‌که‌م خوێننامه‌ی ئه‌نفالیش
به‌ده‌م باگژه‌ی له‌وه
ئه‌مبوو به‌سه‌ر مه‌زراو ڕه‌زو
ده‌غڵ و ژن و
شاخه‌کانی تۆدا خوێندی!

**دوانزه‌هه‌م:**

له‌و ساڵه‌دا
له جێی کولانه‌ی داڕووخاو
سه‌گه‌کانی ئه‌و گوندانه
لانکه‌و بێشکه‌ی به‌جێماوی
منداڵانی ئێمه‌یان کرد

بە کولانە!

**سیانزەهەم:**

لەخوار کفری

ژنێك هەیە لە چاوانیاو لە بینینیا

سێ ڕەهەندی تیا نەماوە

نە ڕۆژهەڵات نە خۆرئاواو

نە لای باکوور

لەوساکەوە چاوەڕوانە

هەموو ڕۆژێ دێتە دەرێ و

لەبەر دەرگا دائەنیشێ و

چاو ئەبڕێتە

ئاسۆی دووری

تەنها ڕەهەند:

دەشتی باشوور!

**چواردەهەم:**

درەختەکانی گوێ سیروان

زۆر بە دەگمەن خەو ئەبینین

بەڵام ئەگەر خەویان بینی

تەنها یەك دیمەن ئەبینن

هەڵکێشان و بڕینەوەو

گواستنەوەیان بۆ بیابان!

**پانزەهەم:**

دنیا بە باڵای ئەم کۆستەی

خۆم ئەپێوم

لەهەر کوێوە، یان هەر کەسێ

فرمێسکێکی بۆ ناردبم

ئەیخەمە چاوی ڕۆحمەوەو

تا هەتایە هەڵیئەگرم

ئەوەی یەك قسەی کردبێ

بۆ ئەم هۆلۆکۆستی غەدرە

من سەد پەیڤی خۆشەویستی

بۆ ئەنێرم

بەڵام ئەگەر خوداوەندو پێغەمبەرو

یەزدانیش بێ

خۆی لادابێ لە بینینم

نە ئەیبینم و

نە من گوێشی بۆ ڕائەگرم!

**شانزەهەم:**

ئەنفال.. ئەنفال

ئەگەر ئەم ئاوە کوژراوە

یەك بەیەکمان نەیخۆینەوە
لە خۆشەویستیی سەرچاوەو
لە خۆشەویستی ئاو ناگەین.
ئەنفال.. ئەنفال
ئەگەر ئەم ڕەنگە کوژراوە نەپۆشین و
ئەگەر ئەم هەوا خنکاوە هەڵنەمژین
کەسمان ناژین!.

**حەڤدەهەم:**

لەو ساڵەدا
سەگی بیابانی خواروو
گورگی بیابانی خواروو
بە تازەیی
ئەوەندە کوردیان خواردبوو
خۆیان لە کۆنە بەرماوەی
قەل‌و داڵو
لە لاکی تۆپیو لا ئەدا
لەو ساڵەدا!.

**هەژدەهەم:**

من ناهێڵم
ئەم گریانە هەرگیز ڕەنگی بچێتەوە
من ناهێڵم

ئەم مردنە ژیان بیری بچێتەوە
من ئەم زوڵمە
لەناو شووشەبەندی شیعرا
دائەنێم بۆ:
ئەو زارۆکەی
دوای چەند قەرنێ دێت و ئەزێ و
لە ڕەحمی ئەم وڵاتەوە سەر دەردێنێو
ئەلف و بێی چرا فێر ئەبێ و
ئەم غەدرە ئەخوێنێتەوە!

**نۆزدەهەم:**

تا ئەتوانم ئەم دووکەڵە
درێژ درێژ ئەکەمەوە
بۆ ئەوەی چاوی ئایندە
پڕکەم لە ئاو.
تا ئەتوانم ئەم قیژەیە
درێژ درێژ ئەکەمەوە
بۆ ئەوەی گوێچکەی داهاتوو
پڕکەم لە گڤەی زایەڵەو
لە وردە ناسۆری شکاو.

**بیستەم:**

کە جۆگەلەیان تیرۆرکرد

له عەزرەتا هەرچی گوڵ بوون له هۆش خۆ چوون
وەختێ گوڵێشیان تیرۆرکرد
له عەزرەتا هەرچی مەله نابینابوون.
کاتێ مەلیشیان تیرۆرکرد
له عەزرەتا درەخت هەموو بوورانەوەو
هەندێ مردن
که درەختیشیان تیرۆرکرد
ئەوسا ئیتر هەرچی شیعرە
له فڕین و له باڵ کەوتن!

**بیستویەك:**

بەربەریەکان!
لەم گۆڕانە سامناکتریان
له ناخماندا هەڵکەندووە
کەس بەشوێنیاندا ناگەڕێ!
ترسناکتر لەسەر زەوی.
دەیان ساڵە
له گۆڕەکانی دەروونداا
گوڵی سپیی خۆشەویستیی و
کۆترەکانی لێبوردن و
هەنگی ماچ و
بەهای ڕەوشتیان ناشتووە
کەس بە شوێنیاندا ناگەڕێ!

**بیستو دوو:**

لەو وەرزەوە

چاوی زەردی پێڵو سپیی

کێڵگەی گوڵەبەڕۆژەکان

ڕوو ناکەنە نیگای خۆرو

لەگەڵیا ناسووڕێنەوە

وەکوو جاران!.

ئەوان ئیستا مل کەڵەگەت

هەر تەماشای ڕێی قافڵەی

بەرەوخواری یاران ئەکەن

بەڵکوو لەناکاو بێنەوەو

ئەوسا ئیتر بەر لە خەڵکی و

بەر لە درەختی لەش قورسی

گویَ جۆگەکان

ئەمان یەکە یەکە ڕاکەن

مژدەبەرن بۆ ماڵەکان!

**بیستو سیَ:**

لە بەسرەدا

نزیك پەیکەرەکەی "سەیاب"

لە ئاهەنگی تاج و نەجمەو

سەمای بێری و

سەرخۆشبوونی دەمانچەدا.

لەو شەوەدا

مێرگێ لە کچە سەبایای شاخەکانیان

هەڵڕشتە ناو هۆڵێکەوە

هۆڵ ڕووناك و

کچ تاریك و

بۆ بژاری مێرگی غەمگین

چەند نەجمەیەك هاتنە پێشێ

لەسەر مێزێکی خەواڵوو

چەقۆیەك و سەبەتەیەکی پڕ هەرمێ

دانرابوون

چەند نەجمەیەك هاتنە پێشێ

دەمانچەیەك پەلی یەکەم هێرۆی گرت و

ویستی لەگەڵ خۆیدا بیبات

بۆ ژوورێکی چۆڵی سەرێ

لە پڕێکدا

گوڵە هێرۆ

کە چەقۆی دی هەڵیگرت و

چەقاندیە سەر هەرمێی دڵی و

خوێنی سپیی بوو بە فوارەو

بە لووزەوێ هاتە دەرێ.

لەسەر سەکۆکەی دەرەوەیش

بینییان وا باڵای سەیاب

گوڵەهێرۆ تێی ئاڵاوەو

لقی دەستیش وا خەریکە
هەرمێ بگرێ!

**بیستو چوار:**

من ئەم داستانە تازەیەم
بە ڕەنگی قاوەیی کاڵی
ئەو مەرەکەبە نوسیوە
کە خۆڵەکەیم لە گۆڕی بەکۆمەڵ و
ئاوەکەیم لە فرمێسکی تازەو گەرمی
چاوی ژن دەرهێناوە.
خەم و تەمی گیراوەیە!.
ئاخر ئەم مەرەکەبەی من
ئەم قوڕاوە
نە لە شێوەی مەرەکەب و
نە لە جاف و نە لە سۆفت و
نە تەباشیری ئێوەیە
وشککات و ببڕێتەوەو
یاخود لە پڕ نووکی بشکێ
لەم مەرەکەبە تازەیە هێندەم هەیە
کە گۆمەکانی ناژمێردرێن
بەم مەرەکەبە تازەیە
ئەگەر هەموو داری وڵات

ببنە نووسەر و شاعیر و پێی بنووسن

هەڵگورد ببێ بە ڕۆمان نووس

پێی بنووسێ

وشکناکا و دوایی نایە و

خەفەتێکە نووکی ناشکێ و

لە نووسیندا قەت ناوەستێ!

**بیستو پێنج:**

ئەگەر لە سەحرای خوارەوە

لە شەوێکدا چاوتان کەوت بە:

ڕیزە بریسکەو ترووسکەی گوڵ ئەستێرە

ڕوو لە چیا.

دڵنیا بن

ئەوە هەموو زارۆکەکانی ئێمەن و

ئەگەڕێنەوە بۆ ئێرە.

ئەگەر ڕۆژێ لەسەر فورات

یاخود دیجلە

پۆلە نەورەستان چاوپێکەوت

بە پێچەوانەی ئاوەوە

سپیی سپیی بەرەو گۆیژە باڵ لێکئەدەن

دڵنیا بن ئەوە کیژەکانی ئێمەن

بە دەم بەستەی "هەی بەلارو بەلارە"وە

ئەگەڕێنەوە بۆ ئێرە

ئەگەر جارێ ڕێتان کەوتە ئەو کەنداوەو

لە بازاڕی نەختینەدا

دانەی گەوهەرو مرواری و دوڕتان بینی

ئەوە چاو و ئەوە لێو و

ئەوە گۆی مەمك و سەرپەنجەی

فرۆشراوی کچی ئێمەن شەرم ئەکەن و

سەیر ئەکەن و ناجولێن و

جارێکی دی

ناگەڕێنەوە بۆ ئێرە!

**بیست و شەش:**

یەکەم شەو بوو

لەناو لمی عەرعەرەوە

دەستێك هاتبوە دەرەوە

هێشتا بازن لە مەچەکدا زڕەی ئەهات.

هێشتا خەنە لەناو دەستا پێئەکەنی و

موستیلەیەك لە قامکدا ئەیجریوان.

یەکەم شەو بوو

لە لمەوە دەستێك هاتبوە دەرەوە

لەو شەوەدا

ناو لەپی دەست

بووبوو بە دەم

ئەویش بۆ تەنها هاوارێ
کە هەر لە ڕێگە ئەمردو
نەئەگەیشتە گوێچکەی سەرێ
خودایە بۆ؟!!

**بیستو حەوت:**

لەوێ بای سەحرا هەڵیکرد
لە گۆڕیچەی منداڵەوە
ـ وەکوو تۆوی گوڵی دەم باـ
با    برژانگو
با    خەنینەوەو گریان
با    پەڕەی گوێو
با    تاڵە مووی قژی هێناو
لە سینەمدا گیرسانەوەو
ورد ورد لەناو دەنگما ڕووان
ئەی نایبینن
وەختێ شیعر ئەخوێنمەوە
جار بە جارێ
کە ئەکۆکم یاخود هەناسەم سوار ئەبێ
وەك قەڵەمەکەم پێم ئەڵێ
لەبەر عومرو یان جگەرەو
سەهۆڵاو و سەرما نییە کە واملێدێ

ئەوە پەنجەی خرپنۆك‌و
ئەوە بیلبیلەی بزێو و
ئەوە كوڵم‌و ئەوە سەری بوكەشوشەو
ئەوە نوقڵ‌و ئەوە مەساسەی ئەوانە
لەبەر بینم ئەگیرێن‌و
ئەیانەوێ بێنە دەرێ!
"من لە دواوە دەستمگرتووە بە پرچـی (كاڵـێ)وەو، هـەردوكمان بـەناو خـەیاڵێكی شیندا ئەفڕین‌و، ئەو لەسەر گێڕانەوەی یادداشتەكانی ڕۆژی حەشر بەردەوامە!"
ـ قافڵەبوو. پەنجەرەی ماشێنمان كوێرو
دنیا ون و، هەر خۆمان، خۆمان ئەبینی
كات بزر بوو، شوێن بزر بوو. شەو بزرو
ڕۆژ بزرو، پەیڤین لەگەڵ یەكدا بزر!
لەش ئەتوت توێكڵە هەناری كۆن و وشكەو،
دەم پەڵاس و، هەناو كوولەكەی بەتاڵ و،
ئەندێشەمان شریتێكی پچڕپچڕ. جوڵانەوە
بە ئاستەم و گەر پێی ڕاستت لە پێی چەپت بكەوتایە
دائەچڵەكیت. ترسمان وەك مریشكەكڕە،
لەسەر دەقیقەو سەعاتی ئەم سەفەرە كڕ كەوتبوو.
سەفەر نادیار، دیواری تەم لە مابێنی ئەو مەنزڵەو
ئێمەدا بوو. كامە مەنزڵ؟! كەس نایزانێ و
پرسیار ئەبێ، لە ناو خانەی بێدەنگیدا ڕاكشێت و
بۆ خۆی بمرێ!. دەوڵەت لەناو ماشێنێكی

داپۆشراودا، بە تەنها هەر دەم و چاوی
بێدەربەستی عەسکەرێکی خەواڵووبوو "ئەرێ
ئەمیش دایکی هەیە؟! کچی هەیە؟! کوڕی
هەیە؟! خەو ئەبینێ یان نایبینێ؟ بیری پێخەفەکەی
ئەکات؟! بیری حەوشەی ماڵەکەیان؟! بیری ژنێ؟!
بیری تەیرێ؟! بیری گوێلکێ یان مەڕێ؟!
ئەرێ ئەمیش خەمی گەڕانەوە ئەخوات بۆ لای
یەکێ؟! بە خۆشەویستی ئاشنایە؟! زیندوەرێکی خۆش
ئەوێ؟! ئەم سەفەرەی بیر ئەمێنێ؟!"
ماشێن زەمان ئەجنێت و کات قووتئەداو ڕێگای
درێژ هەڵئەلوشێ. ئەڕواو ئەڕوا، هەر بەرەو خوار،
جادە گێژو ئەم وڕەی دێو هەر وڕەی دێ.
ڤرەڤڕی تەنی ئاسن ڕوو لە باشوور، ئارەق بە
خەیاڵ دەرئەداو ترس و لەرزیش دائەگیرسێ، یادگاریش
وەکوو چاوانی پشیلەی ناو تاریکیی ناو بە ناوێ بریسکەی
دێ. لە زیکەزیك و، وڕەدا، وام هەست ئەکرد،
من گوێم لە دەنگی تر ئەبێ:
گەڤینی سەگەلی ناو دێ.
گارە گاری مریشکەکان.
سوڕانەوەی بەرداشی ئاش.
یاخود هۆرەیەك پەرت پەرت و
یاخود قیڕەی قەلەڕەشێکی ئێواران

یان دەنگی تەڕی پیاوەکەم لەبەر باران
یاخود شەوان لوورە لووری ڕەوە گورگ و
یاخود گچگچەی[14] پژاڵی ناو دارستان
یان خولانەوەی باگردێن لەسەر سەربان
یان دەنگی سمی وڵاخی سەر ڕێی زاخان[16]
ئۆه پیاوەکەم! "ئەم شوفێرە سەروکەللەی
لە پشتەوە هەر لەوئەچێ" ئۆه پیاوەکەم!
ئەهاتیتەوە لەناو ڕان، یان لە مەزراو لە
کێڵگەوە، تا ناوقەد تەڕ، بۆنی پونگە و
بۆنی خوری و بۆنی ڕێحانەت لێ ئەهات
وەختێ بێڵەکەت دائەنا، لە پێش خۆتدا
بۆن و بەرامەی گڵ و گیای بەر یەکەم
بارانی دنیا، ئەهاتە ناو ماڵەکەوە،
منت ئەدی و ئیتر هیلاکیت ڕاو ئەنا.
دائەنیشتی و هەر لەسەر لا سەرت ئەبردە ناو
بێشکەی نۆبەرەوە. خەنینەوەی منداڵەکەو
ماچەکانت، منیان ئەکرد بە گوڵخەندەرانێ
لەوێ. قاپێ دۆکولێوی گەرم لەبەر دەمتاو،
سەر بەهاڵاو، میلی ڕادیۆکەت بائەداو،
مێرگیلانی حەسەن زیرەك، بە شەونم و بە کەنێرو

---

[14] گچگچ: لەرزینی دار.

[16] زاخان: ڕێی بەردەلان.

به قوڕی ژێر بنچکەوە، ئەهاتنە سەر بەڕەو
لباد. تێرت ئەخوارد. ئەوسا ئیتر زەوقێکی
شین لەناو چاوتا ئەیجریوان. کە پڕ ئەبووی لە
لە هەوەس و لە پیاوەتی و سەرت ئەکرد
بێ ئۆقرەییت بۆ هەڵوەدای ناو ئامێزم
تیا ئەپژا..
من ئەمزانی و ئەچووم دەرگا تەنەکەکەم
پێوە ئەدا..
ئیتر ئەوسا هەڵئەسایت و
بە هێواشی مەچەکی ڕاستت ئەگرتم و
کەمێ پێش خۆتت ئەخستم و
ئەتبردمە سەر دۆشەکەکەی یەکەم شەوم و
ئیتر.. ئیتر
گەلێ جاریش لەو ساتەدا..
هەر بە (با)یەکی ئەسپاییش
جەستەی تەنەکەی دەرگاکە
زیکەزیکی لێوە ئەهات!
ئۆها! پیاوەکەم
تۆ تاباز بووی[17]
لە باوەشتا ئەتوت ئاسکی شل و ملم
لە ئەوەڵدا هەناسەمان سوارو گەرم و

---

[17] تاباز: فەحل، زەبەللاح.. زۆر گەورە.

له دواییشدا ئه‌بوو به پرووکه‌ی[18] به‌فر.
ئۆها! پیاوه‌که‌م..
ئه‌بێ ئێستا له ئامێزی کام ئاگرو
زیگاری کام مه‌ینه‌تی بی
ئه‌بێ ئیسته تۆ له کوێ بی؟!
منداڵ له کوێ و بێشکه له کوێ و
مریشکه‌کان و جوجه‌ڵه‌و گۆرانیه‌کانی
زیره‌ك و، پێکه‌نینی دارو بارو،
دۆشه‌که‌و ده‌رگای ته‌نه‌که له کوێ بن؟!!

ئۆه.. کۆرپه‌که‌م! له‌و ڕۆژه‌دا،
له‌و کۆسته‌دا، دایکم بووبوو
به باهۆزێ زه‌رد و شێت و له تاوانا
به بێشکه‌وه "لاس"ی ڕفان.
"بۆ کوێ دایه؟!. بۆ کوێی ئه‌به‌ی؟"
ـ بۆ ئه‌شکه‌وتێ! بۆ بن به‌ردێ. بۆ لای خودا!
ـ به‌ڵام دایه! ئه‌وان له هه‌موو شوێنێکدان!
کات و جێگه، شه‌و، ڕووناکیی،
ده‌رو ده‌شت و دارستان و شاخ و کێڵگه و،
کوێره ڕێگه!. ئه‌وان له هه‌موو شوێنێکدان
له‌ناو ئاودان، له هه‌وادان.

---

[18] پرووکه: ده‌نگی وردی به‌فر.

ئەوان زەمانیان گرتووە

چاوی ڕۆژگار و دەستی دەقیقە و سەعات و

قاچی چرکەیان بەستووە!

ئەوان زەمانیان گرتووە

" بۆ کوێ دایە؟!. بۆ کوێی ئەبەی؟!"

ئەوان زەمینیان لەگەڵە.

ئەوان ئاسمانیان لەگەڵە.

ئەوان لە پەنجەی خۆمان و

ئەوان لە چاوی خۆمان و

لەم زمانەو لەم جامانەو لەم جلانەو

لەم دەشتانەو

لەم شاخانەیان لەگەڵە!

ئۆە.. کۆرپەکەم! گەر تۆ بەرن!.

لە پاکژی و لە ساوایی تۆ تێئەگەن؟

خەنینەوەتیان خۆش ئەوێ؟

لەناو چاوتا کە لە زنەی ئاو ڕوونترە و

لە نمەی شەونمیش پاکتر، لەو چاوەدا

بێگوناهیی ئەخوێننەوە؟!

بە گچکەیی خواو خۆشەویستیی ئەبینن؟!

وەك هەموو جارێ ئەمبینین!

ئەوان لە یاریی ئەزانن؟

یاریی لەگەڵ هەردوو دەستی خڕپنۆکت و

کردنەوەی مشتی نووقاوت و
لەراندنەوەی غەبغەبەت و
هەڵدانت بۆ بەرەوژوور و گرتنەوەت و
ئەوان لە یاریی ئەزانن؟!
ئەوان پێکەنینیان هەیە؟!
ئەی ئەوان فرمێسکیان هەیە؟!
قەت چاوەکانیان تەڕ بووەو؟!
ڕوومەتی خۆیان سڕیوە؟!
خەو ئەبینن؟!
خەویان بینیوە تیا ببن بە چۆلەکە و
بەناو هەوای ڕەنگاوڕەنگا بفڕن؟!
خەویان بینیوە تیا ببن
بەو وردە ماسیە جوانانەی
هێواش.. هێواش، لە بندیندا
دێن و دەچن و ئێسك سووکن و لە تۆ ئەچن؟!
ئۆه.. کۆرپەکەم!
ئەوان گوڵەگەنم و گەنمەشامی ئەکوژن و
نانیش ئەخۆن؟!
ئەوان جۆگەی ناو باوەشی شاخ ئەکوژن و
بەڵام ئاویش ئەخۆنەوە!
ڕەنگ ئەپۆشن و ئەشیکوژن!
ئەوان ناویان محەمەد و

ئەبوبەکر و عومەر و عەلی و عوسمانەو
ناویان حەسەن و حوسەینەو
بەڵام لە پێش گشت ناوێکدا
ناوەکان و نوورەکانی خوا ئەکوژن!
"بۆ کوێ دایە؟!. بۆ کوێی ئەبەی؟!"
ئەوان ئەتوانن بچنە ناو
کون بەکونی کاتژمێر و هەناسەوەو
"با" دەسگیر کەن!
"بۆ کوێ دایە؟! بۆ کوێی ئەبەی؟!"
ئۆە.. کۆرپەکەم!
تۆ ئیستاکە لەناو باوەشی گریان و
لەناو هەنیسکی نەنەدای؟!
یان لە بەردەمی سیسارك و
داڵەکاندا؟!
ئۆە.. کۆرپەکەم! لەبەر چاومە گەورە ئەبووی.
وەك باوکت دەنگ خۆش دەرئەچووی.
وەك باوکت عاشق دەرئەچووی.
ئەچویتە سەر ملەی "شاهۆ"
تێت ئەچریکان، عەلی ئەسغەر ئەهاتەوەو
ئەحەپەسا!.
ئەچوویتە سەر "پیرەمەگرون" تێت ئەچریکان،
کچە کافرۆش ئەهات و شەیدات ئەبوو.

لەگەڵ خۆیدا ئەیبردی بۆ سەکری سەکران.

بە جووت لەناو لۆکەی هەورا ڕائەکشان.

ئەبوو بە وەرزی ڕامووسان.

لەناو ماچدا هەنگ شانەی دروست ئەکرد و

پەپوولە باڵی ئەگرت و

خۆشەویستیی دائەگیرسا!

گەورە ئەبووی

گڵۆپی شار ئەیبردی بۆ ژووری خوێندن

قەڵەم دەستی ئەگرتیت و لەسەر کورسیی

خۆر دایئەنایت!

کتێبخانە پێشت ئەکەوت

دنیای پێ لەبەر ئەکردی.

بەحری پێ لەبەر ئەکردی.

گەورە ئەبووی

سواری تەیارە ئەبوویت و

زمانی ئەستێرەی دوورو

زمانی چین و ماچین و

زمانی مەل و باڵندەو

زمانی سیحریش فێر ئەبووی.

لەوانە بوو

فریا کەویت

بە چاوی خۆت

پلیكانەی تیشك ببینی

چۆن ئەچێتە سەر كێوان و

لەوانە بوو، ئاو ببینی، بریق و باق

بە هەورازدا سەر بكەویٚ‌و

لەوانە بوو بە چاوی خۆت خەو ببینی

هاتۆتە دی و

هەردوو بەری شەقامی ڤیر چراخان و

چرایش هەتا ناو ئەشكەوت و

تا ڕەوەزی هەڵۆكان و

ڕكەی بزنە كێوی ئەڕوات!

لەوانە بوو، فریا كەویت، بەچاوی خۆت

لە زەمانێكی سپیدا، خاڵە "سالار" ت ببینی

بە بەرگی گوڵە ژاڵەوە

جارێكی دی هاتۆتەوەو

دەستی ڕاستی لەسەر شانی "حەمە ڕەش" و

بە دەستی چەپ سلاو لە گەرمییان ئەكات!

لەوانە بوو!

ئۆە.. كۆرپەكەم.

ئای عەشقەكەم. من ئاوێنەو

تۆیش لەناوما دێیت و ئەچی. هەر لە بیرمە:

بۆ یەكەمجار لە دروێنەی

گەنم و جۆی بەر مانگەشەودا. یەكمان بینی.

ئەو شەوە مانگ لە تەوقەسەری بەمۆدا
لەسەر چیچکان دانیشتبوو.
هەرچی چرایەکی هەبوو بەخۆیدا هەڵیواسیبوو.
خڕو گەورە، ئەتوت سینیەکی تازەی زیوەو درەوشەدار.
هێند نزیك بوو، ئەگەر درۆێنە نەبووایە، پشتم
ڕاست ڕاست ئەکردەوەو ئەچوومە سەر نووکی پەنجە و
دامئەگرت و ئەمدا بە تۆ!
یەکەمجار بوو، عەشق بێت و
پڕمان بکا لە شەونم و لە تریفەو
لە تریقەی پێکەنینی گوڵە هێرۆ!.
درۆێنەبوو، مەلۆی ئێمە و شارای ئێمە، لە هەموویان
گەورەتر بوو، چونکە ئەوان هەر دەستەکانی
خۆیانیان لەگەڵدا بوو، بەڵام عەشق،
دوو دەستی تازەی ئێمە بوو
ئەوان هەموو هیلاك، هیلاك
بەڵام عەشق لە ئێمەدا سروەیەکی بەردەوامی
حەسانەوەو کلووی بەفری
ئارەق سڕ بوو!
ئەوان هەموو، پەلەیان بوو. بە پەلەتر
لە گەڕانەوەی باڵندەی پێش تاریکیی
بۆ هێلانە
بەپەلەتر، لەو هەورانەی ڕائەکەن و کۆڵەپشتیان

پڕ لە بارانی پەڵەیە و عەرد خەمیانە.
ئەوان هەموو خواخوایان بوو چی زووترە،
وەخت وەکوو کەفەژیلکە بتوێتەوەو
داسەکانیان فڕێدەن و بڕۆنەوە.
بەڵام تۆ و من خواخوامان بوو
زەمان وەکوو گای ناو خمخۆرك
بچەقێت و داس لە دەسمان نەبێتەوەو
دەغڵی دروێنەکراویش
لەدوای خۆمان
جارێکی تر بڕوێتەوە!
پێشکەوتبووین، گەیشتینە ناو پەڵەیەك
دەغڵی هەڵچووی هەتا بەرسنگ قامك بزێو.
تۆ ئاوڕێکت دایەوە و نەتهێشت ئەو دەرفەتە بمرێ.
بە ئەسپایی ڕاتکێشام و
شەرمی دەغڵمان شکاندوو،
دوو مامزی نێر و مێ بووین
لەسەر ئاوریشمی مانگەشەو ڕاکشاین و
چاومان نوقان
ماچێك لە سیروان درێژتر
ماچێك لە گۆمەکەی دەربەندیخان قوڵتر
هەر بردینی و هەر بردینی و
تا لە خەرمانەی ناو مانگدا گیرساینەوە!

"له پرێکدا چەند جارێ لەسەر یەک پژمینی پورە نازێ کە لـە تەنیـشتمەوە دانیشتبوو دایچڵەکاندم و هێنامیەوە ناو ماشێنەکە. لەم ساتەدا سەرنجمدا، عەسکەرەکە چەکەکەی هەڵبڕیووەو لە نزیکەوە لە لوولەکەی ورد ئەبێتـەوە، لەم چەکی کلاشینکۆفەیش لای ئێمە زۆر بوو، بەڵام ئێستا... ئێستا؟!"

لەناو چرپەدا ئەیانوت:

هەندێ دەس و هەندێ چەکی

کوڕی بەردی "پیرەمەگرون" ماونەتەوە.

برێ لە برینی نەسرەوت.

برێ لە سروودی بەفر.

هەندێ لەوانەی کە ڕۆحیان،

وەك پارچە نان و ئاوێنە و نوقڵی شیعر و،

ڕەسمی هاوسەرو منداڵیان،

خستۆتە ناو هەگبەی پشت و

لەگەڵ سووتو و خۆڵەمێشی

بەجێماوی خەم و ئەوینی ئێمەدا

ماونەتەوە!

ئازاریان چۆڵ نەکردووە.

گریانیان چۆڵ نەکردووە.

خەزانیان جێنەهێشتووە.

دوکەڵیان جێنەهێشتووە.

ماونەتەوە

لەگەڵ هەتاوی بریندار..

لەگەڵ تەنیایی سێبەردا..

لەگەڵ نەمامی بێ باوك..

لەگەڵ بنچکی بێ دایك..

لەتەك گۆمی حەپەساو و

لەتەك داری سەرسوڕماودا

ماونەتەوە!.

لەناو چرپەدا ئەیانوت:

لە هەندێ کەژ گوڵ لە مەرگا ڕواونەتەوە.

هەواڵی فیراریش ئەیوت:

هەندێ درەخت گریان لە خۆیان بەرداوەو

یەکەم مەفرەزەی مەشخەڵن و

لە سنورەوە بە دزیی دەیجوورەوە

بۆ زەڵم گەڕاونەتەوە!.

لەناو چرپەدا ئەیانوت:

چرپە ئەترسا لە چرپە و

گومان داوی ئەنایەوە بۆ گومان و

بەڵام تروسکایی مۆمێك

لەناو قسەدا ئەسووتا!

لە کوولەکەدا ئەیانوت.

لەناوچرپەدا ئەیانوت:

نە یەك نە دووان و نە سەدان..

لەو دەوروبەری "لەیلان" ە بانگی شێوان

"مامەڕیشە" یان بینیوە هاتۆتەوە
ئەستێرەیەکی بچووك لە سنگیا شەڵاڵ
بە جریوەی سورو
لەسەر دەفەی هەردوو شانی گوڵە کێویلە ڕواوەو
ناو کاکۆڵی پڕ پەپوولەو
لە ناو ڕیشیا گوڵ ئەستێرە تروکاوە!
بینیویانە هاتۆتەوە..
"ئاخر خۆ دەربەند باسەڕەو داری قۆپی و
کەوەکانی ناوچەی شوان و
دەشتی حەمك درۆ ناکەن!"
بینیویانە هاتۆتەوە و هەر لە ڕێوە
لایداوەتە "تەنگی سەر" و
ژێر کەپرە کەسکەکەی "ئارام".
لەوێشەوە چەند بولبولێ دەلیلی بوون
وەرچەرخاوەو سەریداوە لە باخچەکەی
"عەلی مەردان"
"بڕوابکەم؟! بڕوانەکەم؟!"
نا نا نا نا! هەر ئەبێ هاتبێتەوە!"
کە باران بگەڕێتەوەو گوڵی دارهەنار بێتەوە!
ئیتر ئەم بۆ نەیەتەوە؟!
کە دوو چاوی کوێرە کانیی تروسکایی بۆ بێتەوە،
ئیتر ئەم بۆ نەیەتەوە؟!

که شمشاڵ گەڕابێتەوە

بۆ بەرقەدی خەمەکانمان!

ئەی ئەم بۆ نەگەڕێتەوە؟!

که (با)ی وەشت گەڕابێتەوەو

چووبێتەوە ناو باخەڵی دارستانێکی بێتاقەت!

ئەی ئەم بۆ نەگەڕێتەوە؟!

که مەرەکەب چووبێتەوە

بۆ ناو پاندانەکەی (بێکەس)

ئیتر ئەم بۆ نەیەتەوە؟!

که سدارەکەی "پیرەمێرد"

گەڕابێتەوە لای سەری شیعر و چیرۆك

ئیتر ئەم بۆ نەیەتەوە؟!

هاتۆتەوە!

ڕەنگە ئێستا لە کاولاشەکەی ئێمەدا

هەتاوێ بێ و لەسەر بەردێ دانیشتبێ!.

ڕەنگە بووبێ بە کەڵێکی گوێ کانییەك.

بە گڵۆپی سەر شەقامێ لە کەرکووکدا.

ڕەنگە لەپڕ ببێ بە دەنکە چوکلێتێ

لەناو مشتی منداڵێکدا

هاتۆتەوە! هاتۆتەوە و لەوانەیە

ساتێکی تر یان هەر ئێستا

وەك چەخماخەو موعجیزەی خوا

لەم شوێنەدا
پەیدا ببێ و
پێش بە ماشێنی دۆزەخ و
ئەم قافڵەی ڕێی نەهاتەی
ئێمە بگرێ
فریادڕەسبێ و نەجاتمان با!

ـ قافڵە بوو. من خۆم ڕەزێکی وێران و
سەر، هێشوویەکی قرپۆکی ناو کۆشم بوو.
کوللەیەك هاتبووە ژووری و بە
داوێنمەوە نووسابوو! لە کوێوە هات؟!
کوللەیەك بوو، زەردێکی کاڵی پووشویی
قاچی درێژ، ڕیشاڵی ورد، سەری درێژ،
چاوی خۆڵین. لە کوێوە هات؟!
چۆن تێپەڕی و هاتە ژووری؟! شێوەی
ئەکەم. ناسیمەوە: هێشتا کچ بووم
نیوەڕۆیەك ڕەوە کوللە بەری دڵ و
ئاسمانی گرت. ڕووناکیی کەوتە گیانەڵاو
کوللە چاوی گوڵەگەنمی هەتاوی خوارد
هەورێکی زەرد. سێبەری زەرد. کەوتە
دەشت و کەوتە شاخ و هەموو دەرگامان
پێوەدا! وتیان کوللەی بیابانەو

ئافاتێکە لەناو لەوە هاتووەو، لە
دۆزەخەوە باڵیگرتووەو، تاعوونێکەو
هاتۆتە سەر ناوچەکەمان!
کوللەیەك هاتبووە ژووری!
لەکوێوە هات. زەردێکی کاڵ،
"بۆ خوا چییە منیش بکا بە کوللەیەك
لەگەڵ ئەمدا بچمە دەرێ!"
بەڵام کوللە نەچووە دەرێ
لەپڕێکدا لەسەر داوێنی منەوە
بەرزبۆوەو بەناو هەمووماندا ڕۆیشت و
لەسەر پشتی دەستی ڕاستی
عەسکەرەکە ڕێك نیشتەوە.
ئەو داچڵەکی و
بە دوو پەنجەی دەستی چەپی
کوللەی گرت و
لە پێشدا باڵی دەرکێشاو
لە دواییدا، ئەویتری
فڕێدایە ژێر پێیەوە!.
"نەحس بوو ئەم ڕێکەوتەیش و
کوللە کوژراو
لە دەرکێشانی باڵەوە
تا کوشتنی

چارەنووسی

هەرهەموومانم بینیەوە!"

قافڵە بوو. خەیاڵ و ئاو. خەیاڵ ئەڕواو ماشێن

ئەڕواو. ئاو هەر نەبوو. ئاو هەر نەهات

نە قومێ هات. نە تنۆکێ!

کوێربوون لەناو تینوێتیدا

هەر وڵاتی خۆی ئەبینێ!

"وا ئەبینم، عەسکەرەکە، زەمزەمیەکەی لە لاقەدی ئەکاتەوە. زاری گەورەی، بۆ بەرە و ژوور دائەپچڕێ. چەند قومێکیش بەسەر سینەیدا ئەڕژێ، ئەو ئەڕژێ و من کوێر ئەبم. خەیاڵ و ئاو، لەپاش قەیرێ خەیاڵ مردوو ئاو هەر نەهات. نە قومێک و نە تنۆکێ. دنیا ون و کات بزرو، بەڵام ئیستا بۆنی لم و بۆنی کوللەو بۆنی سەحرا و چۆڵەوانی و بۆنی هەوای ڕقاوی دێ"

"شۆفێرە سەربازەکە، بەردەوام چاوی بڕیبووە ڕێگای درێژی بەردەمی و دەمێکیش بوو بێوچان لێی ئەخوڕی، لە ماوەی یەک ساڵی جەنگدا دوو برای و دوو ئامۆزای لە شەڕەکانی دزفول و شووشدا کوژرابوون. زۆر لە دوور و لە ئاسۆیەکی تەڵخدا، سەرەتای هەڵکردنی گێژەڵووکەیەکی بیابانی بەدیکرد. بیری ئەکردەوە، خۆی لەگەڵ خۆیدا ئەدوا ــ لە دڵی خۆیدا ئەیوت:

ئەترسم ڕۆژێ دڵی خۆم، دڵی کەس نا

هەر دڵی خۆم..

وەختی نووستن، یان لێخوڕین

کاتێ ئەڵێم کە من هیچ ئاگام لەو نەبێ

فرسەت بێنێ و لەناو قەفەزەی سنگمەوە
بە پێدزکێ و بەبێ خشپە
خۆی قوتارکاو هەڵبێ و بچێ
لە دەرگای دڵی عەریف "ثائر" با و
ئەویش بڵێ فەرموو ژووری و
لەسەر کورسیی حەوتی نیسان دابنیشێ و
ئەوسا خەبەرم لێبدا
کە ناوبەناو لە کونی کونی ژوورەوەی
ناو دەروونما من چی ئەڵێم!

من ئەترسم خەیاڵی خۆم
تۆقین زۆری بۆ بهێنێ و ڕۆژێ بڕواو
دەرگای ژووری شیر و شمشێر بکاتەوە و
قاچ لەسەر قاچ بەرامبەری
وێنەی قەعقاع دابنیشێ و
چی ئەزانێ دەربارەی ناو و
چرپە چرپ و وڕێنەکانی شەوگارم
هەمووی بڵێ!
من ئەترسم لچ و لێوم..
یان مەڵاشووم یاخود زمانە بچکۆلەم
یان ددانم..
ڕۆژێ حاشام لێبکەن و

خەبەر لە زمانە گەورەو لە گەرووم و
لە ژێکانی ناو دەنگم بەن!

من ئەترسم
هەندێ (با) هەن سست و تەمەڵ
نەفس نزم و لەم دەشتانەدا کەوتوون و
قەت هەڵناکەن
من ئەترسم
(با) یەکی وایان کڕیبێ و
کردبێتیان بە جاسوس و
(با)ی جاسوسیش نیوە شەوێ
هەر بەناو درزی دەرگادا
بە ئاسانی بێتە ژووری و
گوێ لە هەناسەو یان پرخەو
یاخود نەبزی خوێنم بگرێ و
دوایی بڵێ:
لەوە ئەچێ ئەم سەربازە
بۆ "بەوابەی شەرقی" نەمرێ و
بە مردنی خوایی بمرێ و
بۆ بەیانیی قیڕ بمگرن!

من ڕۆژێ چووم، دیارە هەر بە تاقی تەنیا

بەسەر قامیشەڵانی زەردەڵەی مل باریك و بەسەر
ئاوی بێوەژنی ناو ئەهوارو
سەریفە لەش سووتاوەکەی کۆنەماڵدا
تۆزێ گریام
لەو ڕۆژەوە
ئۆقرەم هەر لەسەر ئاگرەو
دەسم لەسەر دڵی ترسەو
ئەڵێم نەوەك
قامیشێکیان سیخوڕ بووبێ و
چووبێ بۆلای ماسییە نقەی ئاسایش و
ڕاپۆرتێکی لە من دابێ! چۆن گریاوم؟

هەر لەبیرمە
من جارێکیان خەونم بینی
خەونێکی سەیر!
لەو خەوەدا ڕائید "حەمدان"
بووبوو بە بەرازێك ڕەش و
لە ساحەکەی موعەسکەردا
یاری فتبۆڵی ئەکردوو
خێرا خێرا بە پاشەڵی
لە فتبۆڵەکەی هەڵئەدا
تا ئەکەوتە سەر لۆزی!
وەختێ کە خەبەرم بۆوە

کێشام بە کەللەی نەگریسما و
لە ترساندا، یەکەندەردوو، گەرماو گەرم
بینەقاقای خەوم گرت و
هەر لە جێدا خەوم کوشت و
چوومە دەرێ و لاشەکەیم دوور فڕێدا!.
وتم نەبادا ئەم خەوە
بۆ شەوێ فریابکەوێ و
بڕواو بچێتە ناو خەوی حەمدانەوەو
بڵێ کە من ئەوم لەناو
خەوێکی خۆمدا بینیوە
بۆتە بەراز!
من ناوێرم سەیری ئەم کوردانە بکەم
ئەڵێم نەوەك چاوی "خەڵەف"ی پاسەوان
لە پڕێکدا قەترەیەکی بەزەیی خوا
یان یەك بریسکەی بچووکی
لێبوردنی پێغەمبەرێ
لەناو چاوانما ببینێ و بەگرتمبا!
ئەیانبینم و، نایانبینم!
زۆر نزیکن و زۆریش دوورن
لە ماشێندان و تیایشیا نین
بە ئێمەیان وا وتووە
ئەبێ ئێوە وابزانن

ئەم قافلانە درۆن و
ئەم ماشێنانە سێبەرن و
کورسیی چۆڵن و
ئەبێ ئێوە وابزانن
کە بەردەوام خەو ئەبینن.
خەوێ کە ناگێڕدرێتەوە هەتا هەتا!.
خەوێ نابێ دەقی بشکێ
هەتا ئەیبەنە لای خودا!!

"خەڵەف کۆکی و ئەم داچڵەکی و
گەردەلوولی کلک کلافەی
دووری سەحرا، هەتا ئەهات
لە قافڵەی ڕوو لە عەدەم
نزیک نزیک ئەکەوتەوەو
لە پڕێکدا لەناو بەرایی
تەماشای خۆلاویدا..
قەلایەک و چەند قوللەیەک
هەڵتۆقین و
لەناو ئێوارەی ژەنگاوی و
لەناو وەڕەی سەگی ڕەش و
لە بەردەمی زەمانێکی مڕومۆچدا
ماشێن وەستا!.
خەڵەف بە دەنگی بەرز وتی:

نوگره سەلمان!"

ـ نوگره سەلمان!

ئافاتێکی قەڵا قەڵا، دوپشکێکی گەوره گەورەی کۆنکرێتیی.

ئەشکەنجەیەکی درێژو

کلێپەیەکی بازنەیی!.

نوگره سەلمان!

ژەنگی مێژوویەکی کۆن و

قوللەی زوڵمێکی زۆر دوورو

مەنزڵێکی بیرچوونەوەو

یادگاریێ بێ پەنجەرەو

تاعونێکی خۆمەڵاسدەر لەناو لمدا و

کینه و ڕقێکی سرمدیی!.

نوگره سەلمان!

قەڵا قەڵای ئازارێکی ڕەش داگەڕاو.

تینویەتیەکی ئەزەلیی و

پێناسەیەك بۆ ونبوون و بۆ تاریکیی و

شوێنێ بۆ زەمانی غەدر و

جێگایەك بۆ پیاسەی زوڵم و

گاڵتەی تاوان.

نوگره سەلمان!

له زستاندا.. وشکه سەرمای دەم بە گوێزان.

لە هاویندا.. گەرمایەکی پڕووکاوی گرنـج گرنـج.
جێگایەك بۆ پشوودانی نێزەی ماندوو.
شوێنێ بۆ نوستنی هەواو تا ئێوارە هەڵنەسانی!.
نوگرە سەلمان!
چەند نەخشەیەکی فیراری نەخشەسازی
چەند بینایەکی هەڵاتوو لە ئەندازەو
چەند پەتایەکی ڕاکردوو لەدەس فورات!.
چەند پاسەوانێ لە نەسلی گورگی ڕەسەن
نوگرە سەلمان!.
(با)یەکی نائومێد وتی:
بیابان بۆ خۆی شەرمئەکا
بلێ مێژووم بنیاتی نا.
تەیرێکی خۆڵاویش وتی:
من شایەتم
جارێك بیابان پێی وتم:
من شەرمئەکەم وەختێ نامە و
هەر پۆستێکم لە ڕێی ئەمەوە پێ بگا!.
بەردی دیوار هەموو جارێ
کە پاسەوان تێپەڕ ئەبوو
ئینجا ئەیوت:
ئای کە بەختێکی ڕەشم بوو
وەختێ نەکرام بە دیواری کتێبخانەو

یان مەکتەبێ و
یان خانووی شیعرو چیرۆکێ و
یان بە بەردڕێژی شەقامی
نێو باخێك و
ئەم چارەنووسەم پێبڕا!.
ژەکە ئاوی ناو بەرمیلیش
وەختێ کە پاسەوان ئەڕۆیشت
ئەویش ئەیوت:
ئای کە بەختێکی ڕەشم بوو
نە گەنم و جۆیەك خواردمیەوەو
نە چوومە ناو دووپەرداخی عاشقەوەو
نە بەفرێ سەردانی کردم و
من شەرمەزاری ئەم عەبدە فەقیرانەم
دوای سووتانم ئەمخۆنەوە!.
قەلا قەلا
شەوانەیش چرای بنمیچی سەر عەبدەکان
وەختێ ئەیزانی بە تەنها ئەوان لەوێن
ئەویش ئەیوت:
ئای کە بەختێکی ڕەشم بوو
لە ژوورسەری خۆشیەکدا دانەگیرسام
لە ژوورسەری سەمایەکدا.
لە ژوورسەری هیوایەکدا.

من نەمئەویست ئەم قافڵەی کۆیلانە
لەسەر جێگەی دەردەداریم
زەردو ژاکاو بمبیننەوە..
من شەرمئەکەم ئەیانبینم
لەژێر مندا یەکە یەکە گیان ئەدەن و
کەچی من دەستە وەستانم و
بۆ ڕێزگرتن لەم مردنە
چەند ساتێ ناکوژێمەوە!
قەلا قەلا، مردن لێرە بەرجەستەیە. پێئەکەنێ و
قسە ئەکاو سەیرت ئەکاو سەیری ئەکەی. دەس لە دەستیەوە
ئەدەیت و بۆنی ئەکەی. هەڵئەسێت و دائەنیشێ و ڕائەکشێ و
بەناو ڕۆحدا پیاسەئەکات. مردن لێرە وەختێ کە دێت
سەگەلی ڕەش لە پێشیەوەن. چەند کەڕەتێ دێن و
ئەڕۆن، تا شەو دادێ و، ئەوسا مردن بەریان ئەداتە
ناومان و بە یەکەوە خەم وگۆشت و ئێسکەکانی ئەم
غوربەتەو ژیان ئەخۆن!.
ـ دوای پانزە ساڵ. هەتا ئیستەیش تینوێتی
کۆچم نەشکاوە. هەتا ئیستەیش زەمزەمیەکەو
ئەو چەند دلۆپە ڕژاوە و زاری گەورەی
عەسکەرەکەم لەیادماوە. دوای پانزە ساڵ
هەتا ئێستەیش، هەموو جارێ بە درێژایی خەیاڵم
تەپ و تۆزێك لە وڕێنەکانم هەڵئەسێ

لە بیاباندایە چاوانم و لە قاقڕدایە تینوێتیم.
هەمووجارێ بە پانایی ئەم چاوەڕوانیە
شێدارەم، هەڵمێك لە ڕۆحم هەڵئەسێ،
لەناو لمدایە خەمانم و لە سەحرادایە تەمەنم.
چاوەڕوانی ڕواندومی و ئاویش نایە، دەنگم
قەوزەیەك گرتوێتی و دووکەڵێکم،
نە با ئەمرەوێنێتەوەو سێبەرێکی تا هەتایم.
پارچە عەردێکی هەتیوم.
هەموو کاولاشی ڕووناکیی لە مندایە:
هەموو ڕەنگێکی کوژراوی
ئەم دنیایە لە چاومایە:
نووکە نووکی پەلکی داران.
خشەخشی گەڵاڕێزان.
قرچەقرچی یادگارو
ورتەورتی ئاوی شلوێ و
پووکەپووکی گوڵی ژێر پێ و
هەرچی باڵندەی یەك چاوەو
کوێرە کانی و هەموو مەسافەی دابڕان
لە مندایە!
من ئەسیاری نەختینەکانی تەنیاییم
تەنیاییەکی سارد سارد
تەنیاییەك کە ڕۆژانە

(با)یەکی بێوەژنی پەرەوازە و بەدبەخت

لە دەشتێکی کلۆڵدا بیلاوێنێتەوە!

من زیگاری

ناو ڕەنگێکم

ژانی تیا ئەزرنگێتەوە

بە دیار چییەوە کرووشکەم کردوو؟!

دەوەنی سوتاوم و لە خۆم ئەپرسم و

بێدەنگیی وەڵامێکی خنکاوم ئەداتەوە!

لەوسەری تەنیاییەوە

ژنێك دیارە!

ژنە یاخود کۆلکە دارە؟

ژنێك دیارە

لەوسەرەوە، لەوسەری تەنیاییەوە

تاقە درەختێکی تەنیا دیارە، ڕووت ڕووت

ئەوە ژنە؟!

یان درەختی لێو بەبارە؟!

نا.. درەختە

درەختێ لە تینوێتی

درەختێ لە نەزۆکی

نەء ژنە

ژنێك لە هۆزی تەم و مژ

ژنێك لە مۆمی کوژاوە

ژنێك لە ئێسکی تاریکیی
بە دیار چییەوەترووشکەم کردووە؟!
کێ دێت؟! چی دێت؟!
لە خۆم ئەپرسم و بێدەنگیی وەڵامێکی
سوتاوم ئەداتەوە!
ئەی هەڵۆەدای
ئومێدێکی نائومێد!
تۆ لەو چۆلەکە قەتیسە ئەچی،
کە بەردەوام خۆی بە شووشەی
پەنجەرەی ژوورێکدا ئەکێشێ و
بەڵام دواجار
لەناو لەپی دەستی مەرگا
مت ئەبێت و
(با)ی ساردی تەنیایی دێت و
پەڕی مردوو ڕائەژەنێ
نە کەس دێ و نە کەس ئەڕوا؟!
ئەی ڕێگەی بێ ڕێبوارو
ئەی هەڵۆەدای ئومێدێکی نائومێد!
ئەوە هەر خۆتی، هەر خۆتی، هەردووکیان
کۆچەری و ماڵ ئاواییکەر، هەر خۆتی هەردووکیان
خانەخوێ و میوان
هەر خۆتی هەردووکیان،

نیشتمانیش و غەریبیی..
هیچ باڵندەیەك دیار نییە..
چونكە هیچ ئاسمانێك دیار نییە
هیچ درەختێك دیار نییە
چونكە هیچ ئاوێك دیار نییە..
بگەڕێرەوە بۆلای خەو
بەشكوو لەوێدا بباری!
ـ ئەی ژنەكەی پڕ لە سەراب و خۆڵەمێش!
ئەی چیرۆكی قژ درێژ و فرمێسك درێژ!
من بەقەد خۆشیی لێت دوورم.
من بەقەد بەهەشت لێت دوورم.
بەڵام هێندەی
ئەو دڵۆپە درشتانەی
لە كالانەی چاوەكانتاو
لە ڕوخساری خۆڵاویتا
قەتیس ماون.. لێت نزیكم!
من دووكەڵكێشی شیعرێكی دوور وڵاتم.
ناوم "مەم"ە و
خەڵكی "دووز" م
خەڵكی دەشتە تەنیاكان و
كوڕی دەغڵە سووتاوەكان.
خەڵكی دەڤەرێ نەونەمام

تیا قەموورەو

گوڵ و پەپوولە تیا پیرەو

لەو ناوەدا، گەر بە ڕێکەوت

پێکەنینێ لە دایکبێ

بە زگماکی قاقای لاڵەو

بە زگماکی سۆمای خلّتانی دەیجوورە.

لەم ساتەدا من لێرەم و لە ژێر ئەرزاو

لە میترۆیەکی دڵتەنگدا

بەڵام چاوم لە پەلکەکانی باڵاتە

کە (با)ی عەدەم لە سەحرادا چۆن ئەیانبا

گوێم لە ڕەنگتە کە نووزەی دێ

لە ئێوارەی ئاوابووندا.

سیانزە ساڵە

غوربەت بووە بە شوقەیەك

لە نهۆمی بێزاریدا و

شێی بە پێستم هەڵهێناوە

غوربەت بووە بە زمانێ

لە بەستێنی دابڕانداو

شێی بە شیعر و

شێی بە دەنگم هەڵهێناوە.

غوربەت بووە بە تەپ و تۆزی لێنیشتوو

لە تەماشاو لە جانتاکەم

له چاوەڕوانی و خەیاڵم و

له یادگار و چاویلکەم!

سیانزه ساڵه

غوربەت بووه به هاوسەرم و

من لەم ژنه پاییزەیه هەتا ئیستا

دەیان منداڵه خەزانی

ڤژزەرد ڤژزەردەم لێ بووه!

ئێره پڕپڕه له گڵۆپ

کەچی من هێشتا تارماییم

"ئاخر چیبکەم

من شەوانی "دووز"م تیایه!"

ئێره هەموو هەر شەقامی گوڵ گوڵییەو

ئەپارتمانی شووشەییەو کافتریای

زەرد و سوورەو

کەچی من هێشتا له ناخدا

هەر قوڕاویم

"ئاخر چیبکەم!

من هەر کۆڵانی مەندەلی و

بەدرەم تیایه!"

ئێره پڕپڕه له سەماو له بالێت و

له هەڵفڕینی گۆرانیی و

له نیشتنەوەی کۆتری ماچ و

کەچی من هێشتا هەر لاڵم!

"ئاخر چیبکەم!

من قافڵەی بەرەو خوارو

"کاڵێ" م تیایە!"

ئەچمە دەرێ، ئەبمە پەپوولە پاییزەو

"با"ی گەرمێن دێ و ئەمبا و ئەمباو

ئەمکا بە ناو بازاڕێکی شووشەبەندا.

جێگا ئەوەندە خاوێنە کۆگایش هێندە

ئێسکی سووکە، لە لەشی تازە خۆشتووی

ژنێك ئەچێ سپیی سپیی و بە چریسکە.

سۆپەر مارکێت، نهۆم نهۆم، بەژن و باڵای

ئاوێنەیەو سترێجێکی تەسك لە بەرداو

گوڵمی لاڕان دەرپەڕیوەو، ناوك دیارەو،

لە سەرەوە بۆ خوارەوە، تەماشای شین،

بە پلیکەی کارەبادا دێتە خوارێ و سەرئەکەوێو

لە بەردەمی فوارەیەکی پەمەییدا سەما ئەکا.

ئاخر چیکەم؟!

من دوو چاوی ئەم غوربەتەم

بەدبەختیشن

لە بەردەمی زمرڕوتام و لە بەردەمی

گەوهەردام و لە بەردەمی یاقووتام و

کەچی لێم ئەبن بە موورووی

بەردە شینەکەی ملی کیژێ لە خانەقین!.

ئاخر چیبکەم؟!

من سوراحیەك کریستاڵ

هەڵئەگرم و ورد ورد تەماشای ئەکەم و

کەچی کریستاڵ لە دەسماو لە پاش قەیرێ

ئەگۆڕدرێت و

ئەبێ بە گۆزەی گڵەسوور!

ئاخر چیبکەم؟!

ڕەنگە من شیعرێکی گەوجبم!

دەست ئەدەمە، تازەترین، گرانترین

ڕەفتەی ئاوریشمینی دنیاو هەڵیئەگرم

کەچی لەپڕ ئەو ڕەفتەیە لەبەر دیدەم

ئەبێتەوە بە سرکەییە

زۆر کۆنەکەی ئەوسای دایکم!

ئاخر چیبکەم؟!

من جوان کوێرم! یاخود شێتم!

ئەچمە بەردەمی کڵاوێ

لە تووکی قوو دروستکراو

شل و شل و نەرم نەرم

هەڵیئەگرم.. ئەیکەمە سەر

وەختێ ئەچمە بەر ئاوێنە

کڵاوی قوو، ئەبێتەوە

بە کلێتە نەگبەتەکەی

ئەوسای باوکم!

ئاخر چیبکەم؟!

من کە چاوم هی خۆم نەبێ و

هی کاڵێ بێ..

من کە گوێچکەم هی خۆم نەبێ و

هی دەوەن و هی دارێ بێ و

من کە ڕۆحم هی خۆم نەبێ و

هی وڵات و هی خاکێ بێ

هەروام لێدێ! ئاخر چیبکەم؟!!

"دوانزە ساڵ بوو، شاعیرەکە، لە ژێرزەمینەکە هاتبووە دەرێ. دوانزە ساڵ بوو لەبەر هەتاودا شیعری ئەنووسی. بەڵام هێشتا هەوای ژەهراویی لە بەغدا حوکمدار بوو. تا ئەو ڕۆژەی مێژووی بەربەریەکان بوومەلەرزەیەکی گەورە لێیداو قەحطان و عەدنان و دەحام تەفروتوونا بوون. یەک لە دوای یەک گۆڕستانی چراکان ئەدۆزرانەوە. لەگەڵ هەڵدانەوەی چوارەم گۆڕستاندا، شاعیرەکە چوار شیعری لەسەر باڵای پیرەمەگرون نووسیی"

**یەکەم شیعر:**

گومان. گومان. گومان ئەکەم

ناتوانن بیاندۆزنەوە

هەرهەموویان نادۆزنەوە.

ئەو هەموو مانگی ژێر خۆڵەو

ئەو هەموو خۆری ژێر گڵەو

ئەو هەموو ئێسك و پروسکی گۆرانیانەو

ئەو هەموو ڕەشە ڕێحانەی گەرمییانەو

ئەو هەموو قاسپەی بەفرانەو

یەك بە یەکی ئەو گوڵ ئەستێرەی دەشتانەو

یەك بە یەکی ئەو هەموو ئاسکە ونبوانە

گومان. گومان. گومان ئەکەم

ناتوانن بیاندۆزنەوە

هەر هەموویان نادۆزنەوە

ئەم حەففارانە بچوکن

ئەم حەففارانە ئەترسن،

ئێوە بڕۆن لە عەمباری

حەففارەی ئەوەو دنیاوە

کە بۆ هەڵکەندنی دۆزەخ دانراون

ئا لەویەوە

ئێوە حەففارەی خوا بێنن

حەففارەیەك بە یەك کەڕەت

لە زاخۆوە هەتاکوو فاو

سەری عێراق هەڵباتەوە!

**دووەم شیعر:**

پەیکەرێ ئێسك، سپیی. سپیی

ملوانکەیەکی پەمەیی و

تاکێ بازنی شووشەیی.
شپرزەو مات، پیاوێك هات و
دانەویەوەو فوویەکی کرد
لە دەم و چاوی خۆڵاویی پەیکەرەکە
هەیکەلەکە کەوتە قسە:
ـ ئۆها! پیاوەکە
چەند دەمێکە ئەم سروەیە لێی نەداوم!
ملوانکەکە
لەناو دەستی پیاوەکەدا
کەوتە جووڵەو
ئەویش وتی:
ـ چەند دەمێکە
ئەم خاتوونەی من نوستووە
چەندیش شل بووم بە گەردنی
ئەم هەڵنەساو تۆیش نەهاتی!
بازنەکە، ئەویش وتی:
چەند دەمێکە
ئەم خاتوونەی من خەوتووە
هەر هەڵنەساو چەندیش گەورەبووم
بە دەسی.
لە دوای فوویەك کە پیاوەکە
سەیری بازنی شووشەی کرد

وردتر بۆوه..

لەناو هەناوی شووشەدا

سەروچاوی عەسکەرێکی تیا مابۆوه..

له ناوچەوانی نووسرابوو:

قیامەت و

حەشری ئەنفالی عوروبە!!

**سێیەم شیعر:**

له چاڵێکی هەشتاو هەشتا

من سەرین و بووکه شووشەی

منداڵێکم هەلگرتەوه

لەناو شیعرا و لەگەڵ خۆمدا

هێنامنەوه بۆ ماڵەوه!.

که شەو داهات، وەختی نووستن

سەرینەکەی خۆم فرێداو

سەرمکرده سەر سەرینی منداڵەکەو

ئیتر من تاکوو بەیانیی

هەر خەونەکانی پەپوولەو

کانیم بینی!

بۆ سبەینێش

ساتێ که چاوم کردەوه

تەماشام کرد

بووم به کچ و

بچووك بچووك بوومەتەوە

پرچ درێژو

شەش ساڵانم.

شیعر هات، نەیناسیمەوە.

ئاواز هات، نەیناسیمەوە.

چیرۆك هات، نەیناسیمەوە.

ئەوەی کە منی ناسیەوە

سەرینی دایکی کچەکەو

گوارەیەکی بەجێماوی کچەکە بوو!.

**چوارەم شیعر:**

بەو سەرەوە

تەیرێك لەناو دووکەڵەوە

کە منی دی

هاتە خوارێ و

ڕێك بەرامبەرم نیشتەوە!.

"یەکەمجار بوو

تەیرێ ببینم عەمامەی لەسەردابێ!"

وتی: تۆ ئەمناسیتەوە

وتم: تەنها شێوەت ئەکەم!.

وتی: من ناوم نەجەفەو

لە شیعری جەواهیریدا یەکمان دیوە!

کە تۆزێ لێی وردبوومەوە

وتم: وایە!

وتی: تۆ هەرچاڵی باڵندەکانی خۆت باسکرد

تۆ هەر مۆمت لەسەر گۆڕی

قوربانیەکانی خۆت هەڵکرد

بەڵام ئاخر..

"نەمهێشت قسەکەی تەواوکا"

وتم: هێشتا من فڕینم بەردەوامەو!

نەگەیشتوومەتە ناو دڵت!

وتی: تەنها من یەك قسەم پێیەو ئەڕۆم!

ئەمجارەیان ئێمە و ئێوە

لەگۆڕستانی چرادا

لە ڕێی ئێسك و پرووسکەوە

لەناو مردنا بۆ ژیان

بە تەواوی بووین بە برا!

"سەرنشینی قافڵەکان کەمێکیان نەبێ ئەوانی تر نەگەڕانەوە. حەیران بێژێکی ئاگر لەڕۆح بەربووی عاشق، حەیرانی ئەنفالی خوڵقاند. نەزمێکی نوێی موتوربەکراو بە ژان و حەسرەتی لاوک. هەندێ ناویان لەم بەیتە تازەیە نا "حەیاوک". چریکەکانی لە نێوان بەیت و داستان و عەشق و دابڕان و غەریبیدا هەر جارەو لە سیلەی خەمێکەوە باڵی ئەگرت. لە شەوێکی مانگەشەوی ئێجگار خامۆشدا، کە تەنیایی لە مانگ ڕەنگ پەرپوتر بوو، حەیران بێژ، لەسەر قەڵای هەولێرەوە بەرامبەر خەرمانەی خۆڵەمێشی مانگ و ڕوو لە باشوور، وردە وردە سەدای ئەکەوتە شەقژن. باڵندەی چریکە بەرەو خوار ئەفڕی و لە

گێڕانەوەی چیرۆکەکەیدا، نمە نمە خوێن لـە ژێکـانی دەنگـی ئـەتکاو دانـە دانـە وشەکانی دائەگیرساو وێنەکان ئـەبوون بـە شـارا بـۆ پەپوولـەو یادگـاریش بـە خۆڵەمێش..

"حەیاوك" ئەی وت:

لەو خوارە، نزیك بە تەنگەی ئەستووری "سعود"

نزیك هەتاوێکی نەخۆشی ناوچەوان کلێپەدار

کە بەردەوام وڕێنەیەك لەناو لمدا

بە "با" ئەدا.

لەوخوارە، نزیك قیامەت و نزیکی عەدەم

هەر بە تەنیشت، مێژوویەکی کەڕوکوێرەوە

لەوخوارە، لەوێندەرێ

کە دەشت و دەر نەزۆکن و

سەراب پادشای وڵاتێکە لە تینوێتی ئەبەدیی.

تاك و تەرا باڵندەی وەجاغ کوێر قیڕەقیڕیانەو

لێرەو لەوێ، لە هێلانەی خۆڵەمێشدا،

هەڵکورماون و

بە تەنها هەر

ئاسمانی ڕابوردوو

خەونی مردوو

یادگاریانە.

لەوێندەرێ. لە قاقڕێ

ئەمجارەیان، خۆڵ ئەمنووسێتەوە

چاڵ ئەمخوێنێتەوە. ئەمجارەیان، لەوێندەرێ.
لەو سەحرایانەوە کە هەر زێدی سەعیر بوون
نیشتمانی مەنجەنیق و مەملەکەتی سوننەو کوللەو
زێدی عاگول، زێدی خوێن و
کیفی کینەی یەقدانەوەی
هۆزی غەدری شمشێرو شیر بوون!.
لەو سەحرایانەوە، (با)یەك هەڵئەکات
بە وژە وژی ئافاتەوە، زەرد، زەرد.
لە لمۆزی
دوورگەیەکی ئاوساوەوە
لەوخوارەوە، لوورەیەك دێت
لوورەیەکی گرێ، گرێ..
گڤەگڤی پڕە لە لم.
پڕە لە زام و وەیشوومەو
پڕە لە گڕ.
لەو سەحرایانەوە، هاوارێ دێ، قەترانییەو
سووکەڵەیەو ڕاناوەستێ و لە غاردایەو
درێژ درێژ ئەبێتەوە
هەتا ناو کۆستی ئەم بەفرەو
هەتا لای من!
هاوارێ لە ئێسك و پرووسکەوە، تیژ تیژ
هاوارێ لە ڕیزە چاڵەوە، قوڵ قوڵ

ئەمجارەیان خۆڵ ئەمنووسێتەوە:
چ دەفتەرێکی بەرینی هەیە
ئەم خواوەندی لمە!
دەفتەرێ ئەستوورتر
لەناو قەدی دۆزەخ و
تۆمارێ پان و پۆڕتر
لە زەریای عەرەب و
حیکایەتێ لە کەنیزەکی
ناو "غەنائم" بە ئاپوورەترو
لەشکرێ لە شارە مێروولەی حیجاز
زۆرتر!
خۆڵ ئەمنووسێتەوە
بەو زمانەی کە خودا
حەشرو نەشری بەنی ئادەمی پێ ئەکات.
بەو زمانەی تۆڵە تیا ئەزێ و
بەو زمانەی ئاگر لە پەلکە گیا
موتوربە ئەکاو
بەو وشانەی لە قافڵەیەکی درێژی
حوشتری دووسەنەمی بارکراون و
ڕۆژگار کاوێژ ئەکەنەوەو
ڕوویانکردۆتە بەردە ڕەشەکەی کەعبەو
عەگالی "قەعقاع" جڵەو گیریانە!

لەو خوارە، بەردەوام خۆڵ ئەمنووسێتەوە
هەر وەکو چۆن تەور دار بنووسێتەوەو
هەروەکو چۆن، کوللە گوڵە گەنم و
تۆڕ ماسیی بنووسێتەوە.
لەو خوارە، خۆڵ ئەمنووسێتەوە
مەرگ ڕۆژ کوێرە!
ئەو هەر لە شەوەزەنگدا ئەمخوێنێتەوە.
نە چرای ئەویٚو
نە مانگەشەو
چرای ئەو ملمەو
مانگەشەوی ئەو، مەحاقی سەرم!
ئەو بەردەوام بەو دەیجوورە ئەمنووسێتەوە
نە ڤاچی حەرفە کوفیەکانی
تێکەڵ و پێکەڵ ئەبن و
نە هەڵەیەکی نەحوی ئەکات و
نە پەنجەی ئەشڵەژیٚ و
نە چاڵە دێڕیٚ ئەپەڕێنیٚ و
نە خاکەنازیٚ غەدر بەخەسار ئەداو
نە سڵ لە خودا و
نە سڵ لە نەوەدونۆ ناوەکەی تریشی ئەکاتەوە!
لەو خوارە، خۆڵ و چاڵ و باگژەیەك لە عەدەم
ئەمنووسێتەوەو ئەمخوێنێتەوە

ئەو خوارە، مووبەمووی جەستەی منی لەبەرە
فەنا بوونی منی لە خۆیدا دەرخکردووە.
بڕینەوەی منی لە چنگیا خەتمکردووە.
لە چەقی هەموو بزەیەکی، منداڵە بەدبەختەکەمدا
دەرزییەکی داناوەو، لەسەرەڕێی هەموو وشەیەکما
قەمەیەك و، لەناو نزارەکان و
زاووزێی کەژیشماندا گێژەڵۆوکەیەك ژەهر!
لەو خوارە، تەپ و تۆزێ لە تەندورەی خۆڵدا
نە هێشتویەتی ئاو چاوی ببینێ و
نە تاقە پەپوولەیەکیش ببێ بە عاشق!
تەندوورەی خۆڵ ئەمخوێنێتەوە.
دەنگم تەیرێکە مردوو
لە هاوارما، هاوار ئەخنکێ و
لە بێکەسیما، چۆڵەوانی، سەرسامە و
لە ڤیژەمدا، خودا لەگەڵ
تیلماسکە نوورێکی سپیدا دێتە دەرێ و
ئاوێتەی فرمێسکی دایکم و چیام ئەبێ
لە ڤیژەمدا خوداوەندی (با) ئەشڵەژێ
لە تەنیاییما تەنیایی زۆرجار ئەنوێ
بەڵام "ئەعراب!"
وەختێ ئەدوێم
ئەوان و بیابان، نازانن خودا "ئەڵڵا"یەو

نازانن "ئاو" چییەو؟ "دایە" چییەو

بە تەنها فەنابوونی منیان لەخۆیاندا خەتمکردووە!

چەند زەلیلە

ئەم جەستەیە

چەند تەنیایە

زریکەم و

چەند بێ خەمە

بیابان و

چەندیش کلۆڵە

غەریبیم!

ـ خەو نەبوون، کیژۆڵە خەو نەبوون

ئەوە ڕەزبوون و ئەمردن

ئەوە ئاو بوون و ئەمردن

ئەوە بەرد بوون و شل ئەبوون

ئەوە گۆم بوون و ڕەق ئەبوون

خەو نەبوون. کیژۆڵە. خەو نەبوون.

ئەوە دەستی سەرگوزوشتەو

خەیاڵ نەبوو. کیژۆڵەکەم..

ئەوە دەستی نیوەی دنیاو نیوەی دەوڵەت و

قانوون بوو کە ئەهات و

تۆی ئەخستە زیلێکەوەو

دوور ئەیبردی..
ئەوە نیوەی بلیمەتی و نیوەی عەقڵ و
نیوەی زانای جیهانیّ بوو
بەیەکەوە.. لەگەڵ "مونتەسیر بیللادا"
(با)ی بۆگەنیان بۆ هەڵکردی.
خەو نەبوون. کیژۆڵە. خەو نەبوون
کلۆ خەڵووزە ساردەکە
ئەوە مەمکێکی دایکت بوو
تۆپەڵە سورو گەرمەکە
ئەوە دەماغی باوکت بوو
خەو نەبوون. کیژۆڵە. خەو نەبوون
ئەوەی کارژۆڵەکەی تۆی خوارد
ئەوەی مراویەکەی دزیت
ئەوەی مامرەکەی بردی
ئەوەی چیرۆکەکەی کوشتی
گورگ نەبوون. کیژۆڵە. گورگ نەبوون
ئەوە حیکایەت نەبوون بۆتبکەم
شیعر نەبوون بۆت ڕێکبخەم
ئەوە دەوالی مێژوو بوون..
ئەوە وەقاص و سەعد بوون
لای خەلیفەوە هاتبوون!
خەو نەبوون. کیژۆڵە. خەو نەبوون

وەکوو پرچ و زەردەخەنەو گوارەکانت
حەقیقەت بوون!
خەو نەبوون. هەرگیز خەو نەبوون..
ئەی بە چاوی خۆت نەتبینی؛
گوڵەکان چۆن لە ترساندا ڕایان ئەکرد..
بنچکەکان هەڵ ئەهاتن..
ئەی بە چاوی خۆت نەتبینی..
کەروێشك خۆی ئەکرد بە پەیکەر!.
هەتاو خۆی ئەکرد بە سێبەر!.
ئەی بە گوێی خۆت گوێت لێ نەبوو
لەو ئێوارە بەسامەدا
سەگەکەمان کەوتە قسەو
بەڵام مەرد بوو
وتی چی ئەکەن با بیکەن
بەڵام من نابم بە بەعسی!
خەون نەبوو. کیژۆڵەکەم. خەون نەبوو
ئەی هەر لەبەر دەمتا نەبوو
لە دوای ناشتنی هەڵەبجە
ئەستێرەیەك بە میوانی
ئەستێرەیەکی مرۆڤ دۆست
هاتە هەیوان
قەیرێ لەگەڵماندا گریاو

ئینجا ڕۆیشتەوە بۆ ئاسمان
خەون نەبوو. کیژۆڵەکەم. خەون نەبوون!
ـ ئەگەڕێمەوە بیابان.
قافڵەکەیش بە بەتاڵیی گەڕایەوە
بۆ کوردستان..
"تۆپزاوا" باری هەیەو دیسانەوە چاوەڕوانە!
تۆپزاوا باری هەیەو، باری قورسە
باری ژان و، باری قیژەو، باری نووزە
ئەو وەختەی ئەبن بە ڕەژوو!
باری گریان و تەنیایی وەختێ ئەبن بە کۆتەرەو
بە سوتماك و وردە شووشەو ئەو دەشت و دەرە
پڕئەکەن، باری زوخاو وەختێ ئەبێ بە قوڕقوشم و
باری زووڕە زووڕی منداڵ، وەختێ سوێیان ئەبێتەوەو،
ئەوەرێن و ئیتر ئەبن بە خەزان و بە گەڵای دار. باری ساڵەکانی
عومری پیرێژن و، باری کچە عازەبەکان، باری ئەو
هەموو جوانییە، وەختێ ئەبن بە مرواری و، بار ئەکرێن بۆ
شێخەکانی ناو خەلیج و بۆ بازاڕی عەرەبستان
باری حەریری جەستەی کیژ.. بۆ دیوەخان.
باری پەمووی بێوەژنان.. بۆ ڕەشە خەڵك
باری کەوڵی پیرەمێردان
بۆ کارگەکانی دەباغی.
لەمسەر خاڵییە قافڵەو

لەوسەر پڕە لە ئەستێرەو
لە گۆرانیی و لە چراکان

ـ ئەی ئادەمیە بەفرینەکان!
لەکوێوە گەیشتنە ئەم لێواری سەعیرانە؟!
چ کاروان سەرایەکی درێژە ئەم دووکەڵی سەفەرانە؟!
ئەرێ هیچتان لەبیرنەچووە؟!
دڵۆپە فرمێسکێ؟
ئاخێکی نێو لۆچی تەمێ؟!
خۆزگەیەکی سیس؟!
بارڕژنی ئاسکێ؟!
قاسپەی کەوێ؟!
هیچتان لەبیر نەچووە؟!
پەلەتان بوو. ئەو دەمەی
خەوتان بەجێهێشت! پەلەتان بوو، پێتان نەکرا
نە سڵاوێ لە درەختێ
نە ئاوڕدانەوە لە نووزەی ڕەزێ،
پەلەبوون و بێ پریاسکەی ماڵ ئاوایی،
بە بێ ورتە. بێ چرپەیەك
پەلەبوون و هیچتان نەبرد
لەگەڵ خۆتان:
نە کۆڵەپشتێ.

نە بوخچەیەك.
نە جانتایەك.
نە مشتێ مێوژو، نە باسوقێ و
نە چەند بەڕوویەك و، نە چەند کەشکێ و
نە تۆزێ گەزۆو، نە هەندێ ڕەشکەو
هیچتان نەبرد. نە نانی ساجێ و
نە مەمکە مژەی ئەو ساوایەو
نە بووکەشووشەکەی باوەشی و
نە حەت حەتۆکەو
نە تارای بووکێو، نە ئاوێنەیەك و
نە گۆچانەکەی باپیرێ و
نە دەرمانی سك یەشەکەی
"پوورە ئەجێ؟"
ئەی باشە چیتان هێناوە بۆ سەفەرێ؟!
بە تەنها پێستی لەش و پرچ و قژ و
جلکە شڕێ؟!
ئاخر ناکرێ هەر وا بە دەستی بەتاڵ
بچنە حزوری یەزدانێ لەوێ.
ئەی چەپکەگوڵێ بۆ بارەگای پەروەردگار؟!
ئەی بارانی هەورێ بۆ پێغەمبەری بیابان؟!
ئەی لە زنویرەوە تاشە بەفرێ بۆ خەلیفەو
بۆ حەزرەتی والییش هەندێ ڕێواسی کەلیخان؟!

پەلەتان بوو. نە (با) لەسەرتان ڕاوەستاو
نە ڕێچکەی زیل و نە جاڕنامەی مافی مرۆڤ و
نە کۆنگرەی موسڵمانان؟!
ئەی ئادەمیە بەفرینەکان!
لە کوێوە گەیشتنە ڕۆژی حەشرو
بەردەمی قاپی قیامەتێ؟! لە کوێوە
گەیشتنە ئەم دەشتی عەدەمەو
بە کام پڵنگی باڵدارو بە سواری باڵی کام
فریشتە و پەری، گەیشتنە حەوت تەبەقەی
ئاسمان و، بەردەم عەرشەکەی خوداو
چوونە سەرێ؟ عەشاماتێ.. عەشاماتێ.
لە عەبدی یەزدان و، لە ئۆمەتی جنۆکەو،
خێڵی گومڕاهوو، خەڵکی کافرستانێ.
عەشاماتێ.. عەشاماتێ، قافڵەیەك
لە جارییەو لە سەبایای پاکیزەکانی چیاو بەفرێ.
ئاپوورەیەك لە گوناهەکانی هەژاری و
عەشاماتێ، عەشاماتێ، عەشاماتێ
لە ئەهلی دۆزەخ و لە ڕەگەزی گەڕوگولی
ناو مەجوسێ!

چەند زەلیلە
ئەم هەقەی من.

چەند گوناهە
بێ گوناهیم.
چەند ڕسوایە
زمانی شاخ.
چەندە تەباین
من و مەرگ و
کە شەو داهات
سەگەلی ڕەش
یەك لەدوای یەك
چۆن ئەمانخوات!
ئای کە تەنیام. چەندە تەنیام
چەندە،، چەندە. چەندە. لەم وەختەدا
لەتۆ تەنهاتر خودایە
لەتۆ بێکەستر خودایە
تەنها کوردە!!
ـ پاکیزەکان
مانگەشەوە خۆڵاویەکان
هەر شەوەکی لە نێوانی
زرێپۆش و بەنگەڵەدا،
لەبەر شەوقی گڵۆپی تیژی زیلەکان
ڕیزکران و لە نێرینەکان دابڕان..
لەیەکتر جوێکرانەوە

گوڵەكانیش بۆ چەند جارێ

تلّژین[*] كران!

گوڵەكان ئاویان نەخواردبۆوە

لارەمل

وەك هێرۆی ملشكاوی بەردەم ڕەشەبا

لەناو چڕە تەمێكی خۆڵەمێشیی

"تۆپزاوا" دا ئەگریان و هەڵئەقرچان

ئەپاڕانەوە لە خودا.. ئەلالانەوە و خوازیاربوون

قودرەتەكەی "كون فەیەكون" پیادەبكاو

ئەرز كونكاو قووتیان بدا..

پاكیزەكان بینی ئاو نەبوون ئەلەرزین.

بەفر نەبوون، ئەتوانەوە..

ئاگرنەبوون، ئەسووتان و

پاییز نەبوون، ئەوەرین و

شووشە نەبوون هەر ئەشكان و

پاكیزەكان چاوێكیان هەر لە ڕێی خوداو

گەیشتنی قودرەتی بوو..

چاوەكەی تریان هەر لەسەر

لەش و لاری بێ پەرژین و

جەستەی بێكەسی خۆیان بوو.

پاكیزەكان لەو ساتەدا

---

[*]تلّژین: هەڵبژاردەی هەرە باش.

لە دارهەناری مەلول و

لە ڕیشۆڵەی ناوتۆڕ ئەچوون

لەو ساتەدا هیچ شتێکی سپی و بێگەرد

لەوێ نەبوو:

نە یەك دڵۆپ لە نووری خواو

نە تیلماسکێ لە ڕۆحی کەسکی باران و

نە یەك شنەشنی هەق و

نە یەك پرژە پرژی شیعرو

نە یەك لەرەلەری هەست و

نە کەوچکێك لە بەزەیی و

نە یەك قولانج لێبوردن و

نە یەك پیاڵە قسەی شیرین!

لەو ساتەدا..

ئەوەی لەوێ بوو هەر ترس و

تەم و دەشتی خۆڵەمێش و

حەربەی زمانی عەرەبی و

ڕیزە بەرمیلی پڕکراو

لە جۆرەکانی مردن و

ئەوەی لەوێ بوو هەر غەدری نەوتاوی بوو.

ئەوەی لەوێ بوو، بە تەنها تەختە سڕی

سڕینەوەی دەم و چاوم و

سڕینەوەی شاخ و داخ و

سرِینەوەی دەنگ و ڕەنگم و
ئەوەی لەوێ بوو، درێژەی گێڕانەوەی
هەمان، هەمان، هەمان..
قیژەو زریکەی خوێناویی
سەبایەکانی ناو دەنگی "تەبەری" بوو!
مریەمەکان بە تەنها شەرمیان
لە جەستەی بێکەسی خۆیان ئەکرد
لە دڵەوە بانگی مردنیان ئەکرد:
فریایان کەوێ
بەڵام مردن خۆی نە ئەهات!.
ڕاوچیەکان لە سەرو ملەوە تا ناوقەد
بەرازی شفرەدار بوون و، نیوەکەی تریشیان
ئادەمی بوون.
"ئەمن دەمگۆت
خەوێکم دیتیە سۆر سۆر
لەو خەوەیدا
شەنگەبێری، کارمامزی، بەژن عەرعەری
لە دوورەوە ڕا، لە سەحرای غەریبیەوە ڕا
هاتبوونەوە مارێ!
یەکەك ببووە ڕەشە ڕێحانێ و
ئەوی دی ببووە گوڕی دارقەزوانێ و
یەکەکی تریان ببووە زنە ئاوی بن شاخان

وەیلێ

وەیلێ

وەیلێ

ئەمن دەمگۆت لەو خەوەیدا

ئەرێ کیژان!. لۆ سەفەرتان

هێند تولانیداو

لە کێندەرێ بوون، بابان وێران!

چبوو؟! چتاندی؟! چتانکرد؟!

ئەرێ کیژان

لەوێندەرێ، لە قیامەتێ

عاشقان چ دەکەن؟!

ئەوانیش دەچنە بەهەشتێ؟!

خۆ لەوێندەریش نارەنار ناکەن

لە دەس غەدرو غەدارێ

ئەمن دەمگۆت. لەو خەوەیدا

خودایە!

ئەوی خەوی ڕاستبێ و

کیژان هاتبنەوە مارێ!"

وەیلێ

وەیلێ

وەیلێ!

وای لەکیژانێ، وای لە حەیرانێ

**وای لە ئافاتی دەورو زەمانێ**

**وای لە غوربەتی نێو بیابانێ**

**وای لە شەوانێ کە مانگ تیا ئەمرێ و**

**بەفری کێوانیش چ پێنازانێ!.**

**وای لەمریەمێ**

**وای لە پاکیزێ**

**وای لە سووتانی**

**ڕۆحی ئازیزێ**

**وەیلێ**

**وەیلێ**

**وەیلێ**

**وەیل!**

سلێمانی

**2003/12/16**

# وتەیەکی کورت

خوێنەری هێژا! ئەم کۆمەڵە دەقەی لەم کتێبەدا کۆبوونەتەوە، بەشێکیان بەر لە نووسینی ڕۆمانە شیعری (گۆڕستانی چراکان) و بەشێکی تریان دوای ئەو نووسراون. هەر لە قەسیدەی درێژەوە بۆ کورتە شیعر یان ئەو دەقانەی کە ڕەنگە بچنە خانەی پەخشانە شیعر و یان هەر پەخشانەوە. ئەگەرچی لەم ڕۆژگارەدا شیعر بەشێکی زۆر لەم سنوورانەی ڕابوردووی خۆی شکاندووەو پێئەچێ کە ئیتر "دەقی کراوە" ببێتە شکڵی زاڵ و لەبەرچاوی ئەم دنیا ئەفسووناوییە. بە کورتی ئەم دیوانە ڕەنگاڵەیەکە لەو شێوە جیاجیایانەی کە هەر هەموو باڵندەکانی، بە باڵ کورت و باڵ درێژیشەوە، تەنها ئاسمانێکیان هەیە، کە ئەویش گەردوونی شیعرە! بۆ خۆشتان ئەوە ئەزانن ئەزموونی شیعری من تەمەنێکی درێژی هەیە. لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، کەم تا زۆر ڕەنگ و ڕووی تایبەتی خۆم هەیە. لەو دنیا بەرینەدا، نیشتمانێکی بچکۆلانەم بۆ خۆم خوڵقاندووە. جا ئیتر تۆ تا چەند ئەو ئەزموون و نیشتمانەت بە دڵە یان نا؟! ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە. بەڵام ئەمەوێ لەم وتە کورتەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، بەشێکی لەبەرچاو لە شاعیرانی نەوەی من و دوای منیش، زۆرجار تووشی دابڕان و ونبوون و پەرت پەرتبوون هاتوون، کە بەلای منەوە یەکێك لە هۆیەکانی ئەوە بووە، نەیانتوانیوە، یان درێژەیان بە

ئەزموونێك نەداوە و لەپڕ پچڕاندویانەو لە گەشەکردنیان خستووە. من بۆ خۆم وا نەبووم. لە بناری ئەزموونێکی خۆمەوە دەستمکردووە بە ڕۆیشتن و سەرکەوتن، نە نوچدان و نە شکستخواردنیش نەیوەستاندووم و هەوڵمداوە بەردەوام ئەو ئەزموونە بە زمانی شیعر دەوڵەمەند بکەم و لە فۆرمی جیاجیادا پەنجەرەی تازەی لەسەر بکەمەوە. بە واتایەکی تر ئەگەر من "لەناو یادەوەری کورددا کارمکردبێ" هەوڵمداوە لە چەندین ڕەهەندی جیاجیادا ئەم ئەزموونی یادەوەرییە پەرەپێبدەم و نەهێڵم لە ئاستێکی هونەریدا ڕابوەستێ‌و ویستومە لەم زەمینەدا هەڵکەندنم قووڵایی تازە بدۆزێتەوە. بەهەرحاڵ ڕەنگە ئەم تێڕوانینە لەسەروەستانی زۆری بوێ، کە ئەمەیش بەر لە قسەکردنی خۆم لێکۆڵینەوە و قسەی ڕەخنەگرانی لە دواڕۆژدا بوێ. نوختەیەکی تریش هەبوو بە پێویستم زانی کەمێك قسەی لەسەر بکەم، کە ئەویش "شیعر و ژانرەکانێتی" یان ئەو تەوەرەی شیعرەکەی بە دەوردا ئەسوڕێتەوە. من پێم وایە شتێك نییە بکەوێتە دەرەوەی شیعر، یان نەکرێ بە شیعر، یان قەدەغە بێ بێتە ناو ئەم دنیایەوە. وەك چۆن وشەی قەدەغە نییە، بابەتیش هەروا. جا ئیتر: سیاسەتە، سروشتە، جیهانی خود و ڕوحە، تەسەوفە، دڵدارییە و هەرچیەکە. ئەوەی جەوهەرییە بە شیعرکردنی ئەو بابەتەیە. چۆنیەتی دۆزینەوەی زمانێکە بۆ دەربڕین. ئێمە سەرئەنجام شیعرمان ئەوێ جا ئەو شیعرە لە هەرچیەك بدوێ. وەك لە دنیای سیاسەت و دەنگی بەرزدا بە سەدان شیعری خراپمان هەیە هەر لە هەمان دنیادا گەلێ شیعری جوان و بەهادارمان هەیە. ئەوەندەی شیعری غەزەل و تەسەوفی پەڕپووتمان هەیە، نیو ئەوەندە هیی جوانمان نییە. شیعر بە کۆنی و تازەییش نییە. هەموو

تازەیەك بەهادار نییە. هەموو كۆنێكیش بەسەرچوو نییە. شیعر هەر شیعرە، ئەحمەدی خانی نووسیبێتی یان نالی یان گۆران یان هەر شاعیرێكی داهێنەری ئەم ڕۆژگارە. شاعیر هەیە بە فۆرمی تازە و بەڵام بە عەقڵی بەر لە هەزار ساڵ ئەنووسێ. كە بیری تازە نەبوو فۆرمی تازە نابێ. بەشێكی لەبەرچاوی ئەزموونی شیعری تازەمان لە منداڵی "تەبەننی" كراو ئەچن. لە نەسڵی ئەزموونی ئەو شاعیرە نین. خوازراون. هەر لەبەرئەوەیشە كاتێ ئەو شیعرانە ئەخوێنمەوە، وا هەست ئەكەم تەرجەمەن. یان بەزۆر لەقاڵبدراون، هەر لەبەرئەوەیشە ناتوانن هەست و نەست ببزوێنن.

ئەگەڕێمەوە بۆ سەرەتای ئەم وتە كورتە و ئەم دیوانە تازەیەم "ئێوە بە خۆشەویستیم ئەسپێرن" ئەو خۆشەویستییەی كە بۆ من هەمیشە چاوگێكی گەورەی بەردەوامبوونی ئەو گڕو كڵپەیە بووە و نەیهێشتووە دامركێمەوە.

شێركۆ بێكەس

سلەیمانی

2004/6/15

# هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا!*

"پەخشانە شیعر"

ئەمڕۆ وادەی بەیەك گەیشتنەوەی نێوان:
زستانە چاوی ئێمە و بەهارە خەزانێکی گەورەیە!
ئەمڕۆ وادەی گەڕانەوەی مەوسمی تێکەڵی
خۆڵەمێش و خونچەیە..
ئەمڕۆ وادەی بینینەوەی دیمانەی کەژاوەکەی گریان و
باڵای سەرتاپا هەڵاڵەگرتووی هەڵەبجەیە!
ئەمە نووزەی شۆڕەبی پرسەیە؟ یان ناڵەناڵی بەردە؟
یاخود وژەوژی لێڕەواری زایەڵەیە؟
وادەی سەردانەوەیە لە ساراکەی مەولەوی
وەختێ ڕیشی مەولەوی شیعر ئەگرێ و نێرگز ئەگرێ و
دیدەی پڕ لە نووری تەڕی

---

* ئەم دەقە مانگێ بەرلەوەی پەیکەرەکەی دیکتاتۆر لە مەیدانی فیردەوسدا داڕمێو ڕژێمە ڕەگەزپەرستەکەی لە ناوبچێ، نووسراوە. پێشبینیەکی شیعرییە. هەڵەبجەیش بۆیە ئەچێ بۆ بەغدا تا بە چاوی خۆی مەرگی جەللادەکەی ببینێو لە کەرنەڤاڵی ئازادیداو لەگەڵ سومبولەکانی شیعرو هونەرو خۆشەویستیدا ئاهەنگ بگێڕێ.

ئەبێ بە چرای خودا و

چرایش ئەگریی!

ئەمڕۆ وادەی نێوان چرکەکانی سەعاتی ژەهر و

ڕەقبوونی شەپۆلەکانی جەستەیە..

وادەیە و وادەیە و وادە!

ئەمڕۆ هەر هەمووومان، ورد و درشت، بە خەڵفی تازە و بە گەڵا و گوڵ و چۆلەکە و منداڵ و بە لق و پۆپمانەوە، بە پەلکە گیا و بە نەونەمام و کیژۆڵە و بە پیرەدار و بە دێبەر و ڕەز و بە سنەوبەر و ژن و بە بنچکی گرمۆڵەی خەم و، قژی ئاڵۆزکاوی دەوەنمانەوە ئەبین بە دارستان و بە ڕووبار و بە زێ و بە ڕەوەز و ئەکەوینە ڕێ، لەهەر چوارلاوە ئەکەوینە ڕێ و ئەگەڕێینەوە بۆ لای کانی عاشقانی هەڵەبجە و کڕنووش بۆ ئاپوورەی زەرد و سووری قوربانیان ئەبەین لەوێ.. ئەمڕۆ هەمووومان ئەبین بە شەقامی شار و بە کوچە و بە پەنجەرەی مارت و بە کتێب و ڕۆژنامە و تابلۆ و شانۆ و.. جەستەمان ئەکەین بە پیانۆ و ئەچینە بەردەم باڵا ئاوێنەی شنروێ، بۆئەوەی جارێ لە شارەزووری خۆشەویستیمان وەنەوشە بۆ قژی بچنێ و جارێکی دی لەگەڵ بای وەشتی شیندا ئازارمان بژەنێ!

ئەمڕۆ هەست و نەستمان.. شەبەنگێکە

مل بە کوێنی شەونماوی و دلۆپ دلۆپ

حەسرەتی مەیلەو ئاڵی لێ ئەتکێ!..

ئەمڕۆ ئەچینەوە نێو تەمە خەمێ، داڵانی هەورێ، کە لە تەوقی

سەرەوە تا کەڵەموستی پێی ئەم وڵاتە دائەگرێ و دائەپۆشێ و
ئەچینەوە نێو تەونی غەدرێ کە هەموو دنیا بۆی چنین و
بەریاندا و تەون فڕی و لە ئاسمانی بێکەسی ئێمەدا سووڕایەوە و
بوو بە فڕۆکەی ژەهرێ.. ئەچینەوە نێو سەرسام بوون و
تەنیایی و غەریبی لە ماڵی خۆماندا و ئەڕۆینەوە بۆ لای بێوەژنی
دەڤەرێ کە ڕووتوقووت و بێ جووڵە لە بەردەمی
ئاستانەکەی خوادا و لەبەردەمی داددا و لە بەردەمی جاڕنامەکەی
مافدا بوو بە خەڵووزە پەیکەرێ!
فرمێسکێ لە شێوەی سیرواندا..
ئاخێك لە شێوەی گەردەلوولدا..
متبوونێ لە شێوەی بەردا و
تاوانێ لە شێوەی زەماندا..
ئەچینەوە ناو برینێ
کە بە درێژیی: نەخشەی هەموو کوردستانە و
بە پانیی: هەموو مێژووی ئەنجن ئەنجنی جەستەمانە و
بە قووڵییش: قووڵایی هەر هەموو کۆستەکانمانە!
شانزەی سێ بوو، شانزەی سێ
شانزەی لە ناوەڕاستا قرتاوی بەهارێ!
شانزەی.. هەزاران تابووتی گوڵجاڕێ.
شانزەی زایەڵە، شانزەی کۆتەڵێ، شانزەی ڕەشی یادگارێ
هەڵوەرینی خەون و دەم و لێو و خەزانی چاوانێ..
یادگارێ لە ئاوێنە شکاوەکانی سەفەر

به مۆمیابوونی خوێندنی تەیرێ
شانزەی سێ بوو، شانزەی سێ، وەختێ ڕۆژێ
ئەبێ بە خەنجەری ساڵ و لەسەر دڵی شار ئەچەقێ!..
شانزەی سێ
ئاڵ بوونی ئاو و
کەڕبوونی شاخ و
کوێربوونی هەتاو و
وڕێنەی بەرد و
شێت بوونی دار و درەخت و
ئەوقبوونی یەزدان و لەولایشەوە
قاقای پێکەنینی دیکتاتۆرێ!.
ئاوڕدانەوە لە ڕۆژژمێری تارۆماری سەردەمێ
کە هەموو دنیا لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا.. بۆ ئێمە بریتی بوو
لە پیاڵەگێڕی ژەهر و لە تۆڕچنی غەدرێ..
هەموو دنیا لە ئاست ڕۆژی حەشری ئەنفال و قیامەتێ
نە چاویان هەبوو نە دەم و نە گوێ!
ئەچینەوە ناو هەوای ئاسمانی شانزەی سێ
کاتێ شارێ بەلادادێ و زەردەخەنەی نێرگزەجاڕ
وەك زەردەخەنەی دارچواله و منداڵان و
کارێزەکان.. کۆتایی دێ!
بەڵام لێرەوە، لە تخووبی ئەم مەرگەوە
لە کوشتنی ئاو و، لە تیرۆرکردنی گوڵ و لە

جەستەی زەردەڵەی هەڵەبجەوە، ژیانێ ڕسکاو
گوڵەگەنمێ هاتەدەرێ.. ئەو جەستەیە بوو بە مۆم..
لە ناوەوە تاریك و بەڵام ڕووناكیی دا بە دەرێ..
وەختێ شارێ بە خنكانی خۆی.. دەنگ بە دنیا
هەڵئەبڕێ، وەختێ عەشقێ بە سووتانی باڵای خۆی،
دڵدارانی ئەم دنیایە تا شارەزوور ئەهێنێ.
شارێك لە مردنی خۆیدا.. جیهانمان پێ بناسێنێ.
تۆوی خۆرەتاو و، زرنگەی زەنگ بڕوێنێ
شارێك لە مردنی خۆیدا و
بە مەرگی كانییەكانی.. گۆمی گەورە و
زەریای دوور و
ئۆقیانووس بهەژێنێ!

⋆

ئەی بەهاری بێوەژن و ئەی ڕووباری نووستووی
ناو كۆچێكی بێدەنگ!
ئەی بەرزترین زایەڵەی سەدەی بیستمان!
ئەی باڵندەی ڕۆحمان ئەودەمەی
باڵ ئەگرێ و ئەودەمەی ئەسووتێ
تۆ هەر تاژانە یادێ نیت، بە تەنها ساڵانە، لە گۆمەشینی
خۆتمان هەڵكێشی و یان بمانكەیت بە گریانی تاق تافكەرەیەك
وەختێ بۆ درەختی كۆچكردووی خۆی بگەڕێ! تۆ بە تەنها هەر
قەسیدەیەكی چاو سەوز نیت، ساڵی جارێ، ژنە هەورێ، لەو

ماهی و دەربەندانەدا، بە پرچی کڕووزەیەکی درێژ لەسەر تەمتوومانی
بە ژار و ژەنگێ بۆ شارەزووری "نالی"ت بنووسێ!
تۆ هەموو ڕۆژێ لەناوماندای، وەك دایك و باوك و هاوسەر و
جگەرگۆشە و وەك نان و ئاو و چون تین و تاوی ئاگرێ، لە
ناوماندای، وەك چریکەی ئەسغەر و دەنگی ماملێ.. لە ژوورەکانمدای
وەك پەنجەرە و ڕۆژژمێر و سەعات و بە هاوینان وەك مانگەشەوێ.
تۆ هەموو ساتێ لەگەڵماندای. چوون پەنجەکانمان. تۆ بووی بە
گوڵی ڕەشی ناو گیانمان و نێو باخچەکانمان..
بووی بە شەقامی ئازادیی
لێرە و لەوێ.. لەناو تیرێژی هەتاودای وەختێ بە ستوونی یان
شاقووڵیی دێیتە ژووری..
تۆ لیمۆیت و بۆنت ئەکەین.
تۆ خەمیت و ڕەنگت ئەکەین.
تۆ عەشقیت و سەیرت ئەکەین.
تۆ دەنگیت و لە بێدەنگیماندا جریوەت ئەکشێ.
نمەیت و پرژەیت و پرووشەیت و ڕێژنەیت و
کەناری دیاری بیرەوەریت و سەرچاوەیەکی گەرم و
هەمیشە هەڵمی غەدرێکی گەورەت لێ هەڵئەسێ!
ئەی هیلالی کوژراوی
تا ئێستەیش بە ئاسمانەوە هەڵواسراو!
وەختی هەڵهاتنەوەت، وەختی زیندووبوونەوە و
دابەزینت. وەختی خەرمانە بەخشینت

له نزیکبوونەوەی هەورێکی نزم لە دارڕژان.. نزیکترە!
لە نزیکبوونەوەی سروەیەك لە كۆساران.. نزیكترە!
لە نزیکبوونەوەی كازیوە لە هەتاو و
زەردەخەنەیەك لە لێوی ساوای ناوبێشكە.. نزیکترە..
ئەوەتا جەللادەكەت قاچێکی كەوتۆتە نێو تابووتەكەیەوە و
مردن خەریکە ڕایئەكێشێ!
ئەی كانی عاشقانی هەڵەبجە!
بە هەموو عاشقانی ئەو بەندەن و بنارانە بڵێ..
بە كارمامز و بە ژنە ڕەوەند و بە شمشاڵی قامیشەڵان و بە
پلووسكی بەفراوان و بە قاپی تەنەكەی ماڵان و بە جووتە مەلی
عاشقی گوێ ئاوان و بە هەموویان، تەلان تەلان،
بەستێن بەستێن.. پێیان بڵێ:
بەو زووانە پەپووسلێمانەكەی پیری شالیار لە كاوانەوە بە گەنجیی
ئەگەڕێتەوە. بە دەم چریكەی سیاچەمانەوە بێسارانی بە سواری
كەڵەكێوییەكی قاوەیی تیسكن دێتەوە. كەوە سپیەكانی نەقشیی
لە شەقەی باڵ ئەدەنەوە. مەولەوی بە خۆی و پەپوولە و شیعر و
ڕێحانە ڕەشەی بەر پشتێنەوە ئەگەڕێتەوە. ئەمجارەیان خاتوو
عەنبەر ئەگەڕێتەوە و بۆتەوە بە كچ و قژی وەك سەری ئازادە و
بووە بە مامۆستا و وانەكانی: ژن و باران، ژن و ئازادیی،
ژن و هەتاو بە كەنیشك و كیژۆڵانی لە چنوور چووی ئەو مەڵبەندە ئەڵێتەوە
پێیان بڵێ.. بەو نزیكانە
هەر لە ڕێگەی ئاسكەكانی دەشتی شێروانەوە، هەڵەبجە ئەچێ

بۆ بەغدا و لە قوڵینەی گەواڵە هەورێکی سپیدا و لەگەڵ خۆیدا
پێنج هەزار پەپوولەیش ئەبا. هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا. وەختێ
ئەگا، دیجلە لەبەری هەڵئەسێ و باوەش بەناو قەدیا
ئەکا و دەست ئەبات و کڵاوەکەی جەواهیریی لەسەر ئەکا. بە گمەگم
دوو جووت کۆترە شینەکەی نەجەف دێن و لەسەر شانی ئەنیشنەوە و
هەر لەوێدا دار زەیتوون و دار چنار و دارخورما ئەیکەن بە سەما.
لە دیواری کۆنکرێتی جەوادەوە، ئەسپەشێ دێتە دەرەوە و
پڕ بە پایتەخت ئەحیلێنێ و خۆر بەر ئەبێ و بارانی پرشنگ دائەکا.
هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا، گوڵی هەنار کاڵایەتی و قەڵبەزەیەکی
ئەحماوا باڵایەتی و، وەختێ ئەگا، ئەبونەواس لەسەر سەکۆ
دێتە خوارێ و لە گوڵ و هەنار و قەڵبەزە بادەی تازە دروست
ئەکا، یەکەم پەرداخ حسەین مەردان لێی وەرئەگرێ و هەر بە
یەك بین هەڵیئەدا. دوای ئەو ڕوشدی قژی بژە و بۆینباخ
خوار، دێتە پێشێ و تا ئەتوانێ "باخی عەلی" و خۆی مەست ئەکا.
هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا. کاتێ ئەگا. حوصەیری وەك جاری جاران
بوتڵی مەیە و چاکەتی بەر داکەوتووە و سووربۆتەوە و لە بەردەمی
پەیکەرەکەی ڕەصافیدا هەر لەترەدا و نیوەلاڵە و بە عەمودیی
جنێو بە کوڕەکەی صەبحە و بە مەدرەسەکەی عەفلەق و بە دوو ژمارەی
حەڤدە و سی و جنێو بە عەرش و قورش ئەدا! هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغداو
سەرنج ئەدا، حەیدەرخانە گەنج بۆتەوە: نێرگەلەکان،
سەماوەر و قۆری و پیاڵەی کەمەر زەڕلی، چایخانەکەی حەسەن
عەجمی، لەسەر وەجاغ و ڕەفەوە، دائەبەزن و دێنە

سەرجادەی ڕەشید و ئەزرنگێنەوە یەك یەك و هەڵئەپەڕن
لە خۆشیاندا، سەرنج ئەدا، هەردوو سدارەی گوبانجی و عەلیلوەردی
ئەویان بە باڵی مەقام و ئەمیان بە باڵی بیری نوێ، دوو کوکوختی
هەڵفڕیون و بەسەر قوببەی پیرۆزەیی و شەناشیلدا ئەخولێنەوە و
پێئەکەنن لە ئاسماندا.
هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا. بە شۆڕیجەدا ڕەت ئەبێ، لەشی بۆنی
حێل و دارچینی و میسك ئەگرێ. ماچی فەیلی، دەورەی
ئەدا، لە پاش تۆزێ ماچەکان ئەبن بە هەنگ و باڵای
هەڵەبجە بە شانە و، ئازادیی دێ و، هەنگوین بەسەر
هەمووواندا دابەش ئەکا. هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا و بەر
لە بەغدا لە شارەبان ئەوەستێت و، لەناو باخی پرتەقاڵدا،
دوا پارچەی جلی گریانی فڕێ ئەدا. ئەوسا ئیتر پرتەقاڵی
ڤژنارنجیی، لەناو پەرژینی مۆردەوە، کراسێکی ئاودامانی
لە گوڵی خۆی بۆ ئەهێنێ و.. هەڵەبجە جلی هەتاو و، هەڵەبجە
جلی کەرنەڤاڵ لەبەر ئەکا و ئینجا ئەڕوا..
هەڵەبجە ئەچێ بۆ بەغدا!

سلێمانی
2003/3/14

# عومەری خاوەر دنیا ئەگەڕێ و،
# پەپوولە شیعر ئەنووسێ و،
# گازی ژەهراویش دەسگیرئەکرێ!!

ئەمە هیچ کەسێ نایبینێ
لەخۆم زیاتر!

بەرەبەیان، زوو بەرلەوەی
لەگوێ چۆمێ دار هەنار چاوی بگلۆفێ و
کارمامزێ لەخەو هەستێ و
هەتاو لە ماڵی بەفرەوە بێتە دەرێ!

زوو بەر لەوەی
هیچ دەربەندێ لەناو تەمێکی تەنکدا
باوێشکبدا
تاڤگەیەك، هەر بە ئەنقسەت و، بۆ گاڵتە
بە مشت ئاو بکا بەسەری بنچکێکداو

لە شیرین خەو دایچڵەکێنێ!.
بەرەبەیان، زوو بەرلەوەی
منارە مێزەر ببەستێ بۆ بانگدان و
زوو بەر لەوەی نزای دایکم
ببێ بە کۆترە باریکەو
بەرەو لای خودا هەڵفڕێ.

بەر لەوەی لوتکە دەستبەرێ
بۆ ئەوەی پۆپنەی گزنگێ
لەنێوان دووکەڵدا بگرێ.

زوو پێش ئەوەی
پیرە حاجی لەقلەقێکی کەشی بەسەر
لەگوێ زەڵم هەڵبلەرزێ و
باڵەکانی بکاتەوە و گوناه لەخۆی بتەکێنێ و
بەرەو گەرمەسێر هەڵفڕێ

ئەمە هیچ چاوێ نایبینێ
چاوم نەبێ!

پێش ئەوەی "با" لەمسەرەوە
شەونم بەرێ بۆ ڕوومەتی تازە گوڵێ و
لەو سەرەوە پریاسکەی هەڵمێ هەلگرێ و

بۆ نیوەڕۆ بێتە سەرێ!.
زوو بەر لەوەی ئاگریماڵێ
دابگیرسێ و ڕەنگی نارنجیی تێگەڕێ!
بەرەبەیان، پەڵە هەورێکی خەواڵووی
کاکۆڵ ڕەشی، سمێڵ سپیی
باران بەشانی "شنروێ"
لە سێدەریەکەی خۆیەوە دێتە دەرێ و
لەبەردەمی کەوێڵێکی داوێن تەڕی
سنگ و بەرۆك داچەقاودا
ساتەوەختێ ڕائەوەستێ و
لە باڵای گریانی کوردو
لە باڵای خوا ڕائەمێنێ و ئەوسا ئیتر دائەنەوێ و
دەست ئەبات و سیگاری تەم و مژێکی باریکەلە
لەناو قوڵایی دۆڵەوە هەڵئەگرێت و
بە بەردە ئەستێی دووگەلیی ئەمبەرئەوبەر
سیگاری دائەگیرسێنێ و
مژ لە دوای مژ
ڕەوەز ڕەوەز و دەشت بە دەشت
خەمی درێژی ئەکێشێ...
لەپاش قەیرێ نزم نزم
بە هەورازی هۆرەیەکدا سەربەرەو خوار دائەگەڕێ.
پەڵە هەورێ

خاڵۆ هەورێ!

بۆ فەقیانەی ئەم سەفەرە

دوو تیلماسکێ لە خامەکی یەکەم شەفەق

دائەدڕێت و لە مەچەکییەوە ئەپێچێ و

بەسەر خەفەتێکی خزا

دێتە خوارێ..

ئەمە هیچ چاوێ نایبینێ

چاوم نەبێ...

هەور کۆمبۆتەوە و ئەڕواو جار بەجارێکیش ئەکۆکێ

هەور قورسە

هەور ئەمانەتی پێیە

ئەمانەتی بەهارێکی بێوەژن و

ئەمانەتی هۆنراوەیەکی شین پۆش و

ئەمانەتی ناوخەزانی مەملەکەتێ.

ئەمانەتێ لە تەنیایی عاشقان و

ئەمانەتێ لە نامۆیی نیشتمان و

ئەمانەتێ لە خەونەکانی شانزەی سێ.

هەور ئەمانەتی پێیەو دائەگەڕێ

نزم.. نزم.. ئەڵێی سەرپۆشی دایکمەو دائەبەزێ.

نزم.. نزم.. ئەڵێی پەردەو کوللەی پەری و

ئەڵێی کەژاوەی گریانی خوداوەندە و دائەبەزێ.

نزم نزم هەردێت و دێت

لەڕێ شان ئەدا لە شانی خەمەکانی
دار گێلاس و گوڵی ژاڵەو
ئەرخەوان و
چۆغەی سپیی
ئیتر سوور سوور هەڵئەگەڕێ!.
هەور ئەمانەتی پێیەو بە کاوخۆ دێ
نزم نزم هەتا دێتە سەر هەڵەبجەو
لە ناوەڕاستی شەقامدا
باڵەکانی ئەکاتەوەو
هەڵئەبەزێ و هەڵئەپرژێ و هەڵئەڕژێ و
لە ناکاوێ
هەر لەوێدا
بە ئەسپایی
عومەری خاوەر دائەگرێ!
ئەمە هیچ چاوێ نایبینێ
چاوم نەبێ!
لە بازاڕدا
عومەری خاوەر بۆ ساتێ ئەبێ بە پەیکەری شارو
جووڵە ناکاو لە ژانێکی مەیلەو شیندا و
لەسەر سەکۆی کازیوەیەك ڕائەوەستێ!
چاو بەناو کۆستا ئەگێڕێ
لە پرێکدا هەنگاو ئەنێ و

به یاددا پێچ ئەکاتەوەو

بە کۆڤانێکی باریکدا وەرئەچەرخێ و

پیر محەمەد، کانی قوڵکەو

یەکەم ئاوڕ لە دەرگای کۆنەماڵەکەی

ئەداتەوەو

ئەم کەڕەتەیان خێراتر

لەگەڵ (با) یەکی کلۆڵدا پێ هەڵئەگرێ!

هەر دوورا و دوور، پاسەوانێك و ئاگرێ

بەدییئەکاو هەناسەیەك

بۆ ئیشەکەی جارانی خۆی هەڵئەکێشێ.

ئەمجارەیان بەلای ڕاستی

نووری شیعر و

فرمێسکێکی ڕاوەستاوی بەژن بەرزی

ڕەنگ زیویینی

"مەولەوی" دا تێئەپەڕێ.

ئەڕواو ئەڕواو ڕاناوەستێ..

لە "مۆردانە" بەتەنیشتی قەسیدەیەکی "گۆران"دا

کە لەسەر چرپای مانگەشەو ڕاکشاوەو

تووشی نەخۆشیی شێرپەنجەی گەدە بووە و ئەناڵێنێ

گوزەر ئەکاو تێئەپەڕێ و

کەس نایبینێ!

لەنزیك "کانی عاشقان"

لەماڵێکی قوڕینەوە، تارماییەکی هەژاریی
منداڵێکی پێنج شەش ساڵان
پێخاوس وەکوو کارژۆڵەو
جلدڕاو وەکوو دار چواڵەی بەر ڕەشەباو
غەمگین وەکوو کەروێشکێکی لانە ڕووخاو.
بۆ نان کڕین دێتە دەرێ
لە پڕێکدا ئەو ئەبینێ و
ئەبێ بە مانگی ناو حەوز و ئەحەپەسێ و
خەریکە هاوار بکات و بڵێ ئەوە
عومەری خاوەر خۆیەتی و هاتۆتەوە
ئیتر ئەم لەچاو ون ئەبێ!.

★

عومەری خاوەر بەخۆیی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
سەفەر ئەکا بۆ کیشوەری زەردو ڕەش و
سپی و سوور و بۆ لای عەشقی سەوزوشین و
بۆ لای خەمی ئێجگار دوورو
ئەمجارەیان سواری فڕۆکەی بۆینگ و
تیژڕەو ئەبێ
وەختێ خۆی ئەکا بە ژووری درێژکۆلەی
زۆر ڕووناکی فڕۆکەدا هەر لە خۆیەوە ئەشڵەژێ
نازدارەکان، ژنە کەیبانووی تەیارە
ئەیبینن و ئەیناسنەوەو

بۆ چرکەیەك و دوو چرکە لێڵ ئەبن و
زەردەخەنەیان ئەژاکێ
عومەری خاوەر بە خۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
سواری پاپۆڕی زۆر گەورەی ئۆقیانووس و زەریا ئەبێ
سەر لە هەموو بەندەرێکی شیعر و ئاشتی و
خۆشەویستیی دنیا ئەدا!
لەناو بوخارو هەڵمدا دائەبەزێ و
هەر سەروملی دیار ئەبێ.
بە بەر باراندا ڕێ ئەکاو
لە شوێن پێیدا گوڵ هەڵئەقوڵێ
بەناو خەوندا ڕێ ئەکاو
بەدوای خۆیدا پەتی دووکەڵ ڕائەکێشێ
لەسەر کورسی بەر تریفەی
ڕوو لە زەریا دائەنیشێ و
هەرچی منداڵێك کە بینی
چڵێ نێرگزی هەڵەبجەی لێ وەرئەگرێ!.
عومەری خاوەر بەخۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
لە کەناری ئۆقیانوسدا پیاسە ئەکا
دۆلفینەکان ئەیبینن و ئەیناسنەوەو
بۆ پێشوازی، لە بنەوە بەرەو سەرێ
کەوانەیی خۆ هەڵئەدەن
دۆلفینێکی هەرزەکاریان زیاد هەڵئەچێ

دەمی ئەگاتە ڕوومەتی کۆرپەلەکەو ماچی ئەکاو
ئەکەوێتەوە ناو ئاوو شڵپەیەکی ئێجگار گەورەو
کۆرپەلەکە دائەچڵەکێ
عومەری خاوەر ئەگەڕێ و هەر ئەگەڕێ
جارێك ئەبێ بەگڵۆپی ناو تەم و مژ.
جارێکی تر بە نەورەسێکی زۆر ماندوو لە کەناردا.
یاخود ئەبێ بە چارۆگەی
کەشتیەکی لە دوور دیاری بەر ڕەشەبا!
عومەری خاوەر بە خۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
گەیشتۆتە کونج بەکونجی ئەم جیهانە
لەیەك وەختا، لەسەر دیواری ماڵێکی کۆپنهاگن
پایزێکی ڕۆژژمێرەو
لەیەك وەختا، لەسەر ڕەفەو
لە ماڵێکی ناو ژاپۆندا
پەیکەرێکی بچکۆلانەی
ناو عالەمی زوڵم و غەدرەو
لەناو هۆڵێکی لەندەندا
ناونیشانی مانفێستێکی ئازادییەو
لە باخچەیەکی گشتیدا و لە بەرلیندا
خۆی هەڵواسیوە بەقەدی دارو بارداو
لە شەقامێکی سەرەکیی ڤیەننادا
خۆی نووساندووە بە جامی ماشێنەوەو

یاخود لەناو ئاپوورەیەك

خۆ نیشاندانی كۆترو دار زەیتوونی هێلسەنكیدا

هەڵەبجەیەو جادە جادە

لە پێشی پێشەوە ئەڕوا!

*

عومەری خاوەر ئەگەڕێ و هەر ئەگەڕێ و

بێ پەساپۆرت و بێ ڤیزەو

بێ ناسنامە

قارە بە قارە تەی ئەكات!

لە ئەمریكای لاتیندا ئەیبیننەوە

كرێكاری كێڵگەی مۆزەو

شەپقەی پووشووی پان و پۆڕی

هاوینێكی پڕ لە خێری لەسەردایە!.

لە ئوسترالیا ئەیبینن

بۆتە كەنغەرو باز ئەداو

بێچووەكەیشی لە باوەشی و بەرسكدایە.

لە كیشوەرە ڕەشەكەیشدا

گۆرانییەكی سپییەو

كراسی پڕ گوڵەباخی زەردەخەنەی

نون. ماندێللای لەبەردایە!

*

هەندێ شەویش

**که مانگ نیوەی ئەکەوێتە ناو زەریاوەو**

**نیوەکەی تری، بۆی ئەگری، لە کەناردا و**

**دەستەوئەژنۆ، خەمی زیوین، دائەمێنێ!**

**ئەو شەوانە**

**وەختێ کۆرپەلەش وەك خونچە و وەك چۆلەکەو**

**هەڵبەستێکی بچکۆلانە، ئەویش ئەنوێ!.**

**ئەوسا باوکی هەڵیئەگرێ و ئەیبا لەناو**

**جۆلانەیەکی لاولاودا بە ئەسپایی پاڵی ئەخاو**

**بە جامانەکەی سەری خۆی دایئەپۆشێ**

**ئەم خۆی ئەڕواو، ئیتر بای وەشت**

**لەجیاتی ئەو ڕایئەژەنێ.**

**ئەوسا عومەر هەر بە تەنیا**

**بەرامبەری تەلەفزیۆن دائەنیشێ**

**نیوەی لەشی لەبەر نسیەکەی غوربەتاو**

**نیوەی تری لەبەر کزەبای هەڵەبجە بەجێدێڵێ**

**جگە لە پەنجەکانی خۆی**

**چەند پەنجەیەك لە ئەشکەنجەو لە دارسێوو**

**لە نامۆیی و لە پەلکە گیاکان وەرئەگرێ**

**کەناڵەو کەناڵ ئەگەڕێ و لە پڕێکدا ڕائەوەستێ**

**لەسەر جزیرە دائەنێ و**

**بەسەر باسی خۆیدا ئەچێ**

**خۆی و پێنج هەزار درەختە شین پۆشەکەی.**

خۆی و شاری خۆڵەمێش و مرۆڤ ڕێزان.
خۆی و مەوسیمی فیراق و هەوای زەرد و
عەشقی وێران!
عومەری خاوەر گوێ ئەگرێ و
خەمی سپیی شلوێ ئەبێ.
عومەری خاوەر پەست ئەبێ و
چون داربیەکی پرسەدار
تەمی وەڕسبوون دائەگرێ!
لەو ساتەدا
لە بیابانی ویژدان و لە بیابانی زمانی جزیرەدا
هەرچی خواوەندە ون ئەبێ و
باران ئەمرێ و
تەپ و تۆز جوانیی ئەخوات و
خۆر ئەگیرێ و
لم حەقیقەت دائەپۆشێ.
لە ئاوێنەی جزیرەدا و لەو وەختەدا
سەری "گۆبلز"
وا بە لەشی وەزیرێکی ڕۆشنبیری عەرەبەوەو
ڕۆژنامەکەی "عبدالباری" لە مێزگردا
دانیشتووەو
بەڵام سجلی فتوحات و
شمشێرەکەی والی ئەدوێ!

له ژوورەکانی ناو فەتواو
ژێر زەمینی دەوڵەتانی جزیرەدا
ئیسلام شیرێکە ڕیشن و چەقۆیەکە دەم بە ویردو
تەقویمێکە ڕۆژەکانی خۆی ئەکوژێ!.
عومەری خاوەر سەیر ئەکاو
عومەری خاوەر گوێ ئەگرێ و
درۆی جزیرە ئەژمێرێ و
لەدواییدا وەکوو تەیرێ ماندوو ماندوو
سەر ئەکاتە سەر سەرینی خەزانێك و
بۆخۆی ئەنوێ!

⋆

عومەری خاوەر بە خۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
هەر ئەگەڕێ و هەر ئەگەڕێ. خولیای شینەو
پرسەی مۆرەو، هەتاکوو سەر، لە وڵاتی
کۆتەڵێکدا داناسەکنێ. ئەم کەڕەتە، هەوری
بەفرەو، لە پۆڵەندا، ئەیکا بە پرووشەی
عەشق و لە سپۆری ترێنێکدا سەر دەردێنێ.
سپیی سپیی هەنگاو ئەنێ و لە واگۆنێکی
زەرد باودا کە بۆنی سیر لە دەمی دێ،
لەسەر کورسی، ژمارە شانزەی ڕیزی سێ
دائەنیشێ!.
شەمەندەفەر لە زاری ئاسنینەوە،

لەگەڵ فیشکەیەکی کورتدا، چەند ستوونێ
لە بوخاری ناوقەد پچڕاو فڕێ ئەداو،
ڕووناکیی کزی سەر سپۆر ئەشڵەژێنێ.
نەورەسێکی قژ زەرد پرسیی:
ـ بۆ کوێ غەریبی غەریبان؟!
کلووی نامۆ!، ئەی مانگەشەوی سەرگەردان،
ئەچی بۆ کوێ؟!
ـ بۆ لای مێژوویەکی خنکاو،
کە بە شێوە لە خۆم ئەچێ!.
بۆ لای موسا سووتاوەکان.
بۆ لای ئەو دووکەڵکێشانەی
لە هۆلۆکۆستی جەستەوە
ژێر ئاسمانیان قیرتاو کردوو
بۆ لای ئەو ڕیزە کوورانەی
فریشتەکانیان تیا برژان!.

عومەری خاوەر بە خۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
بە هەم ئاهەنگی دوو دڵۆپ لە باڕێزەو
هەندێ لە حەسرەتی پاراو
لە "بیرکناو" هاتە خوارێ
لە دەروازەی ساڵەکانی "S.S" ەوە، چووە ژوورێ
هەر لە ڕێوە بۆنی فەنابوون و عەدەم هاتە لووتی. چووە پێشێ و

سەیری ڕیزە فڕنی کرد، سڵەمیەوەو، وا هەستیکرد
سەرنجەکانی قرچە قرچ لەسەر پلێتن و ئەسووتێن.
پێی خستە ناو ژووری ژەهرو ساوناکانی مردنەوە،
گەڕایەوەو وا هەستیکرد گوڵان و زەڵمی ئەخنکێن!.
عومەری خاوەر ئەگەڕێ و هەر ئەگەڕێ و
لە "بیرکناو" بەچاوی خۆی غەدری بەرجەستە ئەبینێ:
سەدان سەدان جووتە پێڵاوی چاوەڕوان
بەڵام هەرگیز قاچەکانیان نەهاتنەوە.
سەدان سەدان شەپقەو کڵاوی چاوەڕوان
بەڵام هەرگیز سەرەکانیان نەهاتنەوە.
سەدان سەدان ستیانی کچ، ستیانی ژن
بەڵام هەرگیز مەمکەکانیان نەهاتنەوە
سەدان، سەدان، سەدان، سەعات و بازن و کەمەربەند و
گۆچان و ڕستە کلیل و ئەموستیلەو بووکە شووشە و
بەڵام هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز جارێکی دی
خاوەنیان نەگەڕانەوە!
عومەری خاوەر بەخۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
لە دەروازەی "s.s"ەوە دێتە دەرێ و
هەر بە لکی جامانەکەی کلووی فرمێسك و
زەنگیانەی نمە ئەسڕێ..
هەر لەوێدا، هەمان نەورەسی قژ زەردی
جاری پێشوو، لەسەرشانی هەڵئەگورمێ و

لێی ئەپرسێ:

ـ چیتدی؟! غەریبی غەریبان؟!

ئەمێستاکە باڵندەی ڕۆحت چی ئەڵێ؟!

ـ تۆپەڵ.. تۆپەڵ

خۆشەویستیی سووتاوم دی!.

وردە ڕەژووی جێماو لە جەستەی زەمانی دابڕان و

سەرابی پۆلە نەورەس و خەونو خۆزگەی خۆڵەمێش و

ئاویلکەکانی گۆرانی و

گۆڕستانی هەتاوم دی!

ـ بەڵام ئەی نەورەسی قژ زەرد!

لە هۆڵۆکۆستەکەی مندا

نە جووتە پێڵاوێ جێما هەتا دوو قسەی دوو قاچ و،

نە بازنێ هەتا دوو قسەی دوو پەنجە و موستیلەکەیم

بۆ بکا! هیچ جێنەما..

لە ڕۆژی حەشرەکەی مندا

نە کڵاوی عەشقێ جێما تا باسی سەریم بۆ بکاو

نە گۆچانی پیرەدارێ تا باسی عومریم بۆ بکاو

نە ستیانی جوانە کچێ هەتا باسی مانگە شەوی

سینەو بەرۆکیم بۆ بکا

هیچ جێنەما..

قاچ بە پێڵاوەوە ڕۆیشت و

سەر بە کڵاوەوە ڕۆیشت و

گواره بە گوێچکەوە ڕۆیشت و
چاو بە چاویلکەوە ڕۆیشت و
هیچ جێنەما..
ئەی نەورەسە قژ زەردەکە
لە ڕۆژی حەشرەکەی مندا
ئەوەی کە لەوان بەجێما..
سەحرایەك بوو لە عەدەمداو
عەرعەرێ بوو وەك سڕی خوا!

عومەری خاوەر لە شاری هێرۆشیماو
لە سەنتەری خۆڵەمێشیی ئەو شارەدا
ماڵی تایبەتی خۆی هەیە
خشتی دیوار هەر لە گوڵی جامانەیەو
باڵکۆنەکەی کەمامەیەك لەسەریایەو
بە ژاپۆنیش لەسەر دەرگای
دەری دەرەوە نووسراوە:
ئەم دەرگایە ئاوەڵایە بۆ گشت کەسێ
لە دنیادا و با بەخێربێ
بەڵام تەنها هەر بەعسییە
کە بۆی نییە بێتە ژووری!

⋆

پێنج هەزار ژێی دەنگم پچڕان

وتم ئیتر ئەبێ بچمە سەر قەبرانی مێژووی دەنگم!.

پێنج هەزار باڵم لێبۆوە

وتم ئیتر ئەبێ بچمە سەرقەبرانی هەڵفڕینم

قەت وا نەبوو

لە پچڕانەوە بەستنەوە دروستبۆوە و

لەسەر قەبرانی فڕین و لە گۆڕستانی باڵەوە

جارێکی دی ئاسمانی نوێ

بۆ فڕینی تازەترم دروستبۆوە"

★

عومەری خاوەر بە خۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە

هەر بە ڕێگەی کاکێشان و ڕێگای بادا

ئەگەڕێتەوە بۆ وڵات

ئەمجارەیان عومەری خاوەر ئەگاتە

سێ کوچکەکەی سەر سەرێ و

بای ڕەش گەمارۆی ئەدات و

کرێوەیەك ڕێی پێ ئەگرێ

لە شوکاکەوە عەشقێ دێ و

فەرەنجیەکی هەتاوی بۆ ئەهێنێ!.

لە دەرسیمەوە عەشقێ دێ و

جووتێ گۆرەوی لە خوری

ناو کلێپەوە بۆ ئەهێنێو

لە دواییشدا

له ڕۆحی بادینانەوە
عەشقێك دێت و
کلێتەکەو
ملپێچەکەو
دەسکێشەکەی
"ئەنوەر مائی"
بۆ ئەهێنێ!.

★

"عومەری خاوەر" گینگڵی بەردەوامی
بەهارێکی سەر ئاگرە و مانگی مارتەو
کەچی لەناو حوزەیراندا لەرز ئەیگرێ..
هەندێ جاریش بەستەڵەکی ناوکاوانەو
بەڵام لەناو تەموزێکدا هەڵئەقرچێ
"عومەری خاوەر" ئەگەڕێ و هەر ئەگەڕێ و
ئەمجارەیان لەسەر بەردێ
ئەبێ بە کەڵێکی سوور و بەرامبەری
پرژە پرژی جەستەی سپیی تاڤگەیەك
لە ڕەواندز ڕائەوەستێ و
حسەین حوزنی بە پەستەکی دیرۆکەوە
پەیدا ئەبێ و، لەوبەرەوە
دار چنارێکی سورفلی خاڵ خاڵاوی
کامێرای سەوز لە باخەڵی

دارستاندا دەرئەهێنێ و بە دوو قۆڵی
بۆ یادگار، چەندین وێنەیان بۆ ئەگرێ.
"عومەری خاوەر" هاژەیەو قەت ناسرەوێ
ئەمجارەیان ڕووئەکاتە "بازیان" و
بەردە قارەمان ئەیبینێ و ئەحیلێنێ و
بانگی ئەکاو ئەمیش ئەچێ و
لە سای سێبەری عەشقێکی بریندارا
پاڵ ئەکەوێ و بە جووت خۆی و کۆرپەلەکەی
قووڵ قووڵ خەویان لێ ئەکەوێ.
عومەری خاوەر ڕووبارە و هەر ئەڕوات و
ماندوو نابێ و بە ڕۆژ هەتاوی باریکەو
هەنگاو ئەنێ و، بە شەو ئەستێرەی گەڕۆکی
هەجیجیە و لە هەر شوێنێ غەدری بینی
لەوێ هەڵدێ.
ئاو بەقەد چاوی خۆی خۆشی ئەوێ
باخ ئەیبینێ و ئەڵێ فەرموو
بۆ ماڵەوەو بۆ ساواکەیش
بێشکەم هەیەو خەمت نەبێ!
دەشت ئەیبینێ و شوان ئەیبینێ و مێرگ ئەیبینێ و
هەموو ئەڵێن فەرموو بۆ ژێر ئەو هەرزاڵەو
بۆ ساواکەیش گوانی پڕی شیری تازەی
مەڕمان هەیەو خەمت نەبێ!.

ئەو هەر ئەڕواو گەڵای خەزان لەگەڵیایەو

"با" یەکی شین ئاوەڵێتی و

پەپوولەیەکی ئاوارەیش لەسەرشانی و

نزیك نزیك لە دەم و چاوی کۆرپەلەی

ڕائەمێنێ و ئەو هەر ئەڕواو

بەندەنێ هات، کەوێ پرسیی:

ـ ئەوە بۆ کوێ ئەی نوێنەری

پێنج هەزار ئاوێنەی شکاو ئەچی بۆ کوێ؟!

ـ بۆ لای ڤاسپەیەك لە کەرکوك

تا قەتارێکم بۆ بڵێ.

دۆڵێك هات و تەمێك پرسیی

ـ ئەوە بۆ کوێ ئەی دەم ڕاستی

پێنج هەزار نێرگزی لاڵ و پێنج هەزار جۆگەی کەڕوکوێر،

ئەچی بۆ کوێ؟!

ـ بۆ لای لەیلایەك لە ئامەد

تا بە پرچی دوو دێڕ فرمێسکی زۆرتازەم

لەسەر گەردنی هەڵەبجە بۆ بنووسێ!

بنار هات و گۆمێك پرسیی

ـ ئەوە بۆ کوێ ئەی زریکەی پەڕاگەندەو

ئەی برینی بێ ماڵ و جێ، ئەچی بۆ کوێ؟!

ـ بۆ لای دەریاچەکەی ورمێ

تا ئەم مانگە بچکۆلەیەی

ناو باوەشی خۆمی بەمێ!
عومەری خاوەر ئەچێتە سەر دوا دوندی پیرۆزەیی
بەرزی کۆست و بەرەو لای خوا بە هەردوو دەست
ساوای باوەشی هەڵئەبڕێ و چەند گاتایەك لە سرودی
ئاوێستاکان لە دەنگیا دائەگیرسێنێ و دەنگ گڕ ئەگرێ و
لە هەوایشدا پەیڤی نووری زەردەشتێکی هاوچەرخ ئەڕوێ:
من نەخشی سەر تاوێرە ژانی ئەبەدیی ئەم کێوانەم.
نەخشێ لە غەدری برۆنزی و نەخشێ لە پەندی ژەهراوی.
خواوەندی وەرزی بێکەسان بە کڵپەی کۆڤان نووسیومی و
برووسکەیەکی پەیکەرتاش لە شەوێکی مانگ لەبارچوودا،
هەڵیکەندووم. خۆڵەمێشێکی وێنەکێش بە ڕەنگی خۆی و
ڕەنگی کورد ڕەنگی کردووم. لەناو هەوای خنکاوەوە
بەڕێ کەوتووم. ئەرزی حەرام لە نێڵەنێڵی گوناهدا
گۆشیکردووم. من و ئازار دووانەیەك بووین کە
گەورەبووین، سەرمان لێتێکچوو ئەو من بوو،
یان من ئەوبووم؟. تەنهایی ئەم ڕۆحەی منەو
خزاوەتە گەردوونەوە. جودایی ئەم لەشەی منەو
پەڕیوەتە ونبوونەوە. من نامۆیی و من تاراوگەو
من کۆچڕەوم داهێناوە. مەرگ دووسێ شێوەی هەبوو،
بەڵام من کردم بە هەزار. خاك جێگیر بوو بەڵام
من کردم بە کۆچەر. ڤیژە لە پێشدا نووزە بوو بەڵام
من کردم بە هاوار. لەسەر کەمەری سەرزەمین من

نیشانەی سەرسوورمانم و لە تەوقەسەری ئەویشدا
من بووم بە نیشانەی پرسیار!... (با) ئارام بوو، بە زریکە
من شێتم کرد. ئاو هێور بوو من بە مەراق ئەم
گێژەنەم بۆ دروستکرد. کە من نەبووم. سێ وەرز هەبوو،
کە من هاتم، خەزان هات و ئومێد ڕژاو، هەتاو وەری و،
سامالٚ شکاو، بەفراو سووتاو، سێبەری خۆم، خۆمی کوشت و
لە پرسەیشما هەر ئەویش بوو بە پرسەدار!.
هەتا ئێستەیش ترسێ کە بەسەرما باری، نەچۆتەوە!.
من مێژوویەکی شەل و من کولتوورێکی کوێرە مووشەو،
خەریتەیەکی بێ دەرگاو، کلیلێکی لە هۆش خۆ چووم!
"قاچێکی تازەم بدەنێ!. ئەی کێوەکانی یەکگرتن!.
دوو چاوی تازەم بدەرێ! خۆشەویستیی، لە هەر کوێ هەی!.
ئاو تۆیش دەروویەکم بەرێ!
ئەی ڕەهێڵەی ڕووناکیی تۆیش، بمخە سەرپێ و
بیکە بە تۆفی ناو عەقڵی ئەمڕۆو سبەی!"
من چیبکەم لەم ئاسەوارە ڕزیوانە؟!
لەم هەموو تەیرە مردووانە؟!
لەم هەموو پەیڤە نووستوانە؟!
لەم هەموو کەفە ژیلکانەو
من چیبکەم لەم
هەموو میراتی خوێنانە؟!
دارکەنەکان، لە نزارەوە دێنەوەو، هێشتا پاشماوەی زریکەی

دارەکان و گوڵەکانیان لەسەر تەورو دەست و پەنجە
تەڕتەڕ دیارە.
کاروانچیەکان، لە سەفەرەوە دێنەوەو
هێشتا پاشماوەی غەدرێکی ڕەنگ تۆزاوی لەسەر یاڵ و
سەر خورجین و پاشکۆکانیان پەڵەپەڵە هەمووی دیارە
براکانیش، لەسەر شاخەوە دێنەوەو
باڵایان وەکو دەنگیان و دەنگیان وەکو
چەکەکانیان لە دوورەوە سوورسوور دیارە.
ئەی من چیبکەم ئا لەم هەموو
کارمامزە هەتیوانە؟!
ئەی من چیبکەم ئا لەم هەموو
مراویە بێوەژنانە؟!
لەم هەموو باخە لالانەو
لەم هەموو گوڵە کوێرانەو
بیانبەمە لای کام یەزدان؟!

عومەری خاوەر بە خۆی و کۆرپەلەکەی باوەشیەوە
بە سواری حەیران ئەگاتە سەر هەولێر و
لەوێشەوە "موکریانی" پەڕەپەڕەی
فەرهەنگەکەی بۆ ئەکاتە باڵۆنێك و
سواری ئەبێ و ئەگاتەوە سەر هەڵەبجە
لەناو فەزای پیرۆزەیی
سەر مۆردانەو سەر گوڵان دا

بچووك بچووك ئەبێتەوەو
وەكوو قەڵبەزە پەرت ئەبێ و
ئەبێ بە شەونم لەسەر گیا.
عومەری خاوەر ئەچێتە ناو ئاسۆوە
بچووك بچووك ئەبێتەوەو
ئەبێ بە كەنیسمەی چیا
دیسانەوە دێتە خوارێو
بچووك بچووك ئەبێتەوەو
ئەچێتە ناو ڕەنگەكانی زەنگیانەوەو
ئەچێتە ناو ڕەنگەكانی مووروەوەو
لە دواییشدا ئەبێ بە ڕشتەی مرواریو
بە ملوانكەی خۆشەویستیو
بە نقێمی سەر موستیلەی
پەنجەی ژنێ!
دیسانەوە نقێمەكەیش هەڵئەفڕێتو
ئەمجارەیان ئەچێتە پۆلی خوێندنی
چۆلەكەی یەكەمساڵەوەو
لەسەر كورسی شكۆفەیەك دائەنیشێ
ئەبێ بەحەرف
بەپیتی "هێ"
ناو فێر ئەبێ
ئیتر ئەنووسێ هەڵوورژەو

**ئیتر ئەنووسێ هەڵەبجەو**

**لە دەفتەری منداڵێکدا چاو هەڵدێنێ!**

**ئەمە هیچ چاوێ نایبینێ**

**چاوم نەبێ**

**ئەمجارەیان لە پۆلەوە دێتە دەرێو**

**گەورە گەورە**

**ئەبێ بە ئەسپێکی سپیی‌و**

**لە غاردایەو ئەحیلێنێو بۆ بەرەو خوار**

**یاڵ گڕ ئەگرێو**

**تا بەردەمی مۆنۆمێنتی یادگارێ**

**ڕاناوەستێ.**

**کە ڕاوەستا، ئەبێتەوە**

**بە عومەری جاری جاران، کەس نایبینێو**

**پشتێنەکەی ئەبەستێتو جامانەکەی ئەبەستێتو**

**بەهار ئەدا لە یەخەی‌و**

**ڕێك مل ئەنێ بۆ ناو ژووری**

**لە ژوورەوە ئەیناسنەوە**

**ژێر قوببە هەموو ئەوروژێ**

**پێنج هەزار ناو لەسەر دیواری بەرزەوە**

**هەموو ئەبن بە پەپوولەو یەك لەدوای یەك**

**دێنە خوارێ**

**هەندێ لەناوە گچکەکان قاچیان ناگاتە سەر ئەرزو**

بەر ئەبنەوە
بەڵام پەپوولە گەورەکان
خێرا هەڵیان ئەگرنەوە.
ئەیناسنەوە یەکەیەکە پەپوولەکان ماچی ئەکەن
هەواڵی "خاوەر" ئەپرسن
هەواڵی کۆرپەی باوەشیو
پرسیاری فڕگەو تەیارەو
سەردێڕەکانی ڕۆژنامەو قسەی تازە
بۆ هەڵەبجەو، پرسیاری خانووە نوێیەکەی هێرۆشیماو
پرسیاری فلیم بەرداریو شریتەکەی ڕۆژی شانزەو
پرسیاری پاپۆڕی گەورەو بەندەرەکانی جیهانو
پرسیاری نیلسۆن ماندێلاو
پەپوولەی باخچەی کراسیو
پێست ڕەشەکانی لێ ئەکەن
لەدواییدا عومەر ئەڵێ:
ئیتر بمبەن بۆ هۆڵەکەم
پەپوولەکان هەر بەگەڵای گەڵاڕێزان
کەژاوەیەك دروست ئەکەن
عومەر ئەخەنە ناویەوەو هەر لەسەر شان
ئەیبەن هەتا ناو هۆڵەکەی.
پەپوولەکان لەسەر کورسیی دائەنیشن
یەکەم کەڕەت پەپوولەیەکی شاعیر هەڵئەسێو

لەهەوادا شیعرێکی خاڵدار ئەنووسێ‌و

لەدوای ئەوە عومەر خاوەر

پێشکەش ئەکاو

ئەویش ئەچێتە سەر شانۆو

لەبەردەمی گوڵە هێرۆی مایکرۆفۆندا

هێمن.. هێمن.. ڕائەوەستێ

پەپوولەکان بەپەڕەی گوڵی هەڵوەریو

دەست ئەکەن بەچەپڵە لێدان

کانی عاشقان لەخوارەوە هەڵئەستێت‌و

جامێ ئاوی بۆ ئەهێنێ‌و بۆی دائەنێ

عومەر دوو قوم ئەخواتەوەو

بۆ چەند چرکەیەك مات ئەبێ

دوایی ئەڵێ:

ئەی پەپوولە بەڕێزەکان!

سوپاس.. سوپاس.. بۆ هەمووتان

تکایە چەپڵە لێمەدەن

تا ئەم پەیڤە سەوزو سوورەم تەواو ئەکەم

من ڕاسپاردەی باران‌و هەوای سپیی‌و

ئاوی سەوزو شیعرم پێیە

ڕاسپاردەی گژوگیاکانی ناو عەشق‌و

ڕاسپاردەی یەکەم شەفەقی بەیانی‌و

ڕاسپاردەی یەکەم خوێندنی تەیرێکی

تازە خوڵقاوی گوێ دیجلەو
ڕاسپاردەی ڕۆحی بەفرو
ڕاسپاردەی یەکەم ڕەنگی تروکاوی
ناو قۆزاخەی تیشکم پێیە
هەمووی چەند چرکەیەك ئەبێو ئێوە ئاگاتان لێ نییە!
من بەسواری هەورێ هاتم
ئەو پێی وتم.
هەوریش  لە زاری ڕووبارێو
ڕووبار لە زاری چیرۆکێو
چیرۆك لە زاری دارێکی یەك قۆڵەوەو
داری یەك قۆڵیش لە زاری
حەمە سدیقی پێنجوینیو
حەمە سدیقی پێنجوینیش
ئەویش دیسان هەر لە زاری
نەورەسێکی یەك باڵەوە
بیستویانەو
منیش وا بە ئێوەی ئەڵێم:
ئەی پەپوولە بەڕێزەکان!
لەژێر زەمینی وەحشەکەی ناو بەغدادا
لەبنی بنی بنەوەی تاریکیدا
هەوای ژەهراوی گیراوەو
ئێستە لەناو بەرمیلە نەوتێکدا بەندەو

بڕیار وایە سەری بەرمیل نەکەنەوە

تا هەڵەبجە..

ئەی خانمانی پەپوولە!

ئەی برایانی پەپوولە!

ئیتر لەسەر دیوار چیبکەین؟!

چیبکەین لێرە؟!

فەرموون با بچینە دەرێ.

بۆ بەر هەتاوی تازە زاو.

بۆ بەر (با)یەك وەك هەناسەی خودا پاكو

بۆ لای ئاوێ چون فرمێسکی نالیی ڕوونو

بۆ لای شارێ زۆر لەگریان ناسکترو

بۆ لای عەشقێ لە هەمووومان بالأبەرزتر!

فەرموون با بچینە دەرێ!

سلێمانی
2004/1/19

# یەكی شووبات بوو؟!
# یان، یەكی خەزان؟!

یەكی شووبات
ئەبوو یەكی بەفر و، یەكی بارێزە و
یەكی سەر بە كڵاوەی باران و
یەكی ناو سەهۆڵبەندان و
یەكی تۆف و كرێوە بێ!
كەچی نە پرووشە و كلوویەك بینایی
پەنجەرەمی سپی كرد و..
نە تنۆكێ دای لە قژی قەسیدەم و
نە باپووسكەیەك ملی پێبردمە ناو پاڵتۆكەمەوە و
نە سەرما و سۆڵە و سەقەمێ
دەست و پەنجەی ڕستەیەك و
چیرۆكێك و خۆمی تەزان!
یەكی شووبات بوو؟
یان یەكی خەزان؟

یەکی زستان بوو؟
یان یەکی گریان؟!
★
ئەوەی کە هات و دابەزی و
کەوتە سەر ئەرز و سەر جەستە و
سەر ڕۆحی من..
ئەوەی وەری و
ئەوەی باری و
ئەوەی هەڵێکرد و پژا و ڕژا..
ڕەهێڵەی تەیری کوژراو و
سوورە ئەستێرەی خنکاو و
گرمژنی هەورەبانی خۆرەتاو و
هەڵکردنی ساراکانی خۆڵەمێش و
هاڕەی سایەقە و سامانڵ و
بەربوونەوەی مانگەشەو بوو!
"یەکی شووبات بوو؟!
یان یەکی خەزان؟!
یەکی زستان بوو؟!
یان یەکی گریان؟!"
بەیانییەك لە خۆرنشین.
جەژنێك لە شین.
نەوبەهارێ لە هەڵوەرین.

پێکەنینێ لە دارنین.

★

دوو پۆل گوڵ و

دوو پۆل کانی و

دوو پۆل چرا!.

دوو خەرمانە لە ئەوین و

دوو جۆگەلە لە پەیڤین و

دوو چریکە لەناو گەرووی

دیرۆکێکدا و

لە پرێکدا

کەمتر لە تررووکەی نیگا

کەمتر لە لەرەی بزەیەك

کەمتر لە جووڵەی گەڵایەك

لە فلاشی کامێرایەك

کەمتر لە خەونی پەپوولە و

لە پرێکدا

سەدان پەری هەڵپچوڕکاو

سەدان پرژەی سوورهەلگەڕاو

سەدان تیشکی ڕەشهەلگەڕاو

نیوە پەنجە و، نیوە دەست و، نیوە گەردن

تۆزێ لە قژ، چەند ڕیشاڵێ لە ئاوات و

چەند ئێسکێك و چەند جومگەیەك

له گۆرانیی و چەند نووزەیەك

بەر لە کەوتن!

"حەیرانێ لە خوێن.

خوێنێ لە زوڵم و

زوڵمێ لە یەزدان"

★

دوو مێرگی جوان

دوو دەریاچە و

دوو بایەوان.

لە ناکاوێ

سەدان پەلکی ڕەزی سوتاو

سەدان هەتاوی ورد و خاش

سەدان شمشاڵی شکاو و

سەدان مەوجی پارە پارە و

کەشتییەکی سەرەونخون.

★

منارەی دووکەڵ

دووکەڵکێشەکەی

سەرو ملی من.

"قەڵایەك لە تەم.

تەمێ لە سینەم.

سینەم لە هەولێر

هەولێرێ لە خەم"

★

دوو عەقڵی بەردین

دوو دەستی نەفرین

دوو دۆستی مەرگ و

دوو جانەوەر و

دوو ڕۆحی تاریك.

ویژدانێ لە دڕك

دڕكێ لە ڤین و

ڤینێ لە تابووت!

★

یەكی شووبات بوو؟! یان یەكی زستانی خوێنم و

سەرمای مەرگم و یان باهۆزی كۆستم و یان

شەختەبەندی لاشەكان!. ئەمە زستان بوو؟!

یان كۆتەڵستان؟! یان گڤەگڤی وەی؟!

ئەوە شەقام بوو؟! یان دارەمەیتێكی درێژ و

یان قەبرستانی سروودە چاو سەوزەكان؟! ئەمە

وەرزی عەشقی بەفر و برایمۆك و پەری خان بوو؟!

یان خۆڕنینەوەی گوڵەبەڕۆژە، ڤژزەردەكان؟!

ئەمە قەڵایە؟! یان كۆتەرەی ژنی ڕەشپۆش؟!

ئەمە تەیراواكەی منە؟! یان مەرگئاوا؟! یان

مەملەكەتی خۆڵەمێش؟! ئەوە چییە كۆمبۆتەوە و

به خشەخش بەهار بە دوای خۆیدا ڕائەکێشێ؟!
خۆشناوە؟! یاخود پیرمامە؟ یان گەواڵەی
ئازار و ئێش؟! ئەی ئەمانە گوڵەباخی ناو شوباتن؟!
لەم هۆڵەدا هەموو کەوتوون؟! یان جەرگ و دڵی
ئازیزان؟! یاخود شیعرن ئێستە نووستوون؟!
ئەی ئەو کەسە کەڵەگەتەی لەناو پرسەی شاخەکاندا
ڕاوەستاوە؟! ئەوە هەولێرە؟! کەرکوکە؟!
یان هەموویان و کوردستان؟!
دەپێم بڵێن:
یەکی شووبات بوو؟!
یان یەکی خەزان؟!
یەکی زستان بوو؟!
یان یەکی گریان؟!

شوباتی 2004

# چەخماخە!

بۆ هەموو هاوڕێ ئازیزەکانم و شیعر دۆستانم و
گیانی قوربانییەکانمان لەوێ، بۆ کوردستانە
ڕاپەڕیوەکەی "جگەر خوێن" پێشکەشە ! .

**هەر خۆتان نین. ئێوە کە هەورە تریشقەی پێش ڕێژنە و**

**ئاوێنەکانی ڕووبارو، بەژن و باڵای دارچنار و،**

**سوورە گوڵ و، پۆلە مەلی، بەیانیانتان لەگەڵدا بێ**

**هەر خۆتان نین**

**هەمووماننین!.**

**ئێوە لەسەر ئەو جادانە**

**کە دەڕابەی هەرچی دوکان و بازاڕی داخراوە**

**لەگەڵتان بێ. چی خشتی تووڕەی دیوارەو**

**هەرچی پایەی کۆنکرێتی ڕاوەستاوی شارەکانەو**

**هەرچی شووشەی پەنجەرەیەو چاوی ماڵە**

**لەگەڵتان بێ**

**هەر خۆتان نین.**

**هەمووماننین بە پەلکەگیاو بە پەنجەوە**

**بە هەناسەو بە شنەوە**

به قژی سەرو دەوەن و

بە بنچك و بە بێشكەوە.

هەر خۆتان نین

ئەوەی گەڵای دارستانی لەگەڵدابێ. چۆن تەنیایە؟!

ئەوەی خەونی منداڵان و چاوی ئاوو

ئەو هەموو پەیژەی گزنگ و

ئەو هەموو باڵەفڕێی زامانەی

لەگەڵدابێ. چۆن تەنیایە؟!

ئەوەی "مەم و زین"ی خانی و

چاویلکەکەی بەدرخان و

سدارەکەی پیرەمێردی لەگەڵدابێ

چۆن تەنیایە؟!

هەر خۆتان نین

وەختێ جادە بانگیکردن:

ئەو هەموو کورسیە چۆڵانەی قوتابخانەو

خاڵیبوونەوەی مزگەوت لە ویرد و نوێژو

خاڵیبوونەوەی گەڕەك لە شەوقی یاری و

ساردبوونەوەی چای چایخانەو

ڕستەی پچڕاوی سەر تەختە و

ڕیشی نیوە نەتاشراوو

پاروویەکی نیوە خوراو

پێتان ئەڵێن:

هەر خۆتان نین. هەموومانین.

ئەو کاتەی ئێوە سروودی داروبەردن،

گەرووتانین.

کە مەوجدانەوەی ئازاری سەرشەقام بن

هاژەتانین.

هەر خۆتان نین

پەنجەکانی دەستتان ئێمەین

با مەچەکیش هی خۆتان بێ.

ڕەنگتان ئێمەین

با وێنەکەیش هی خۆتان بێ!

سەروملتان هی خۆتانەو بەڵام سینەو

خورپەی دڵ و، بەتایبەتی

برینەکانتان هی ئێمەن!

"چوار گوێچکیلەین و

یەك دڵین.

چوار پەنجەرەین و

یەك ماڵین.

چوار کارێزین و

یەك باخچەو

چوار هەنگاوین و

یەك ڕێگا!."

★

هەر خۆتان نین. تەماشاکەن:

درەختێکتان لێئەکوژن

من لێرەوە، بەژنی سپی

درەختەکەم خوێنی لێدێ.

کڵپەیەکتان لێئەگیرێ.

من لێرەوە

هەناسەی ژوورم تەنگ ئەبێ.

لەلای ئێوە کانییەکی بچووك بگری

من لێرەوە منداڵێکم

تینووی ئەبێ.

تەماشاکەن:

باڵی تەیرێك ئەکەن لەوێ

من لێرەوە

وشەم نافڕێ!

دە گوێش بگرن:

ئەو وژە وژەی لای منە

هی خەمەکانی ئێوەیە

ئەم گڤەگڤی پەخشانەیش

هی دەنگی خوێنی ئێوەیە.

تەماشاکەن:

ئەم کوڕبوونەوەی شانانەم

هی هەڵگرتنی تابووتی

جۆگەلەكانی ئێوەیە!.
هەر خۆتان نین
لە "خابوور" تاندا.. سیروانین.
لە "عفرین"دا.. خانەقین و
لە "دیرەك" دا.. شەنگارین و
لەناو هەڵەبجەی ئێمەیشدا
ئێوە "قامیشلی" و "سەركانی"ن!.

★

ئەوەی تەنیایە و گوڵێكی لەگەڵ نییە
یەك پەپوولە دۆستی نییە
هەر ئەوانن. هیچیان نییە
نە عەشق، نە پەروانەو، نە مانگەشەو
ئەوان هەرگیز
نە خوا ئەبینن و نە خەو!.

★

من ڕۆژێكیان، لە عامودا، چاوم لێبوو
كەلەپچەیان كردە دەستی چیرۆكێكی "عوسمان سەبری"
هەر هەمان سات لە كەركووكدا
سەدان شیعری پێخاوس و جلدڕاوی
ڕەحیماواكەم ڕاپەڕی!.

★

"جگەر خوێن"ی قژ گوڵ هەرمێ!
لەلای ئێوە

پەڵە خوێنێ کەوتە سەر تەختی کراسی
خوێندکارێك و بەڵام لێرە هەمان چرکە
مەندیلەکەی سەری "حاجی" سوور هەڵگەڕاو
بزەی "بێکەس"م هەڵوەری!

★

هەر خۆتان نین
ئەی ئەو هەموو باڵندانە و ئەو گۆرانییە
باڵ سەوزانەو ئەو ڕووبارە قژڕەشانە
لەگەڵ کێدان؟!
ئەی ئەو هەموو چراوگانەی
لە پشت ئەو تەم و مژەوە
کەوتوونەڕێ، ئەوان هی کێن؟!.
ئەوان بە تەنها خاوەنی دووکەڵێکی
ڕابووردوون و بەڵام ئایندەی چاوشین و
ئەو ڕۆژگارانەی کە هێشتا هەر نەزاون
وەکوو هەتاو جگەرگۆشەی جوانی ئێمەن!

★

پرچی کچەکەی تۆ... حسکۆ!
پرچی خولیایەکی منە.
ئەم دابێنم
ئەویش دایەت.
ئەم ئاڵۆزبێ ئەو ئاڵۆزەو

گەر مەراقیش چڕبێتەوەو

لە خەیاڵمەوە بئاڵێ، ناوبەناوێ

بەداخەوە

شانەم لەناو قژیا ئەشکێت!.

★

دارزەیتوونی ماڵەکەتان.. مەلکۆ!

ئەگەر ڕۆژێ دەست لە ئەژنۆ

دابنیشێ و دەنکە فرمێسکی ڕەشی خۆی

لەلای خەمێکی دراوسێ هەڵبڕێژێ

هەر ئەو ڕۆژە منیش لێرە

بەر پەنجەرەم، لاواندنەوەی

لاولاوێکی خوشك کوژراو

ئەیگرێت و..

گەر ڕێشکەوێ

ئەو گریانە سامالێ بکاو

لەدوای بارانێ پێکەنێ

من لێرەوە سەرم بۆی ئەبێ بە ئاسۆ!

★

لەوێ گوڵەبەڕۆژەی ناو کێڵگەت.. مەمۆ!

چاوەڕوانیی، زەردوسپیی، عەشقی منە.

کە باڵا کات باڵا ئەکەم

لاربێتەوە، ملم لارەو

گەر لە سەر ئەرزیش بکەوێ
منیش ئەوساکە لێرەوە
ئەستێرەیەکی نەخۆشی
کەوتووی ناو جێم!

★

گوارەکانی گوێچکەت.. خەجۆ!
گوارەی حەیرانەکەی منن
کە بێوازو بێتاقەت و بێ لەنجەبوون
من لێرەوە تەم ئەمگرێ و
ئیتر منیش سیامەندی
بێ لاوك و بێ شمشاڵم و
هەوارێکی بێتاقەتم!

★

عەرەبانە دەسگێڕەکەت.. ئاپۆ چەتۆ!
جەستەی منەو هێواش هێواش تۆ ئەیگێڕی.
ئەگەر ڕۆژێ ئەو برسیبێ و تا ئێوارە
پوونگەو نەعناو تەڕەپیازی
دۆشداماوی، کەس نەیکڕی
ئەوسا ئیتر من لێرەوە
دەمم وشکەو
دەسم خاڵیی و
وەکو پێچکەی عەرەبانە قاچم دێشێ و

بەختم ئەگری!

★

تۆ هەر خۆت نیت، کاکە مستۆ!

لەسەر جادەو لەم ئاپوورە گەورەیەدا

وەختێ ئاوڕ لە پیاوێکی تەنیشتی خۆت ئەدەیتەوە

نە ئەزانی ناوی چییەو نە قەت دیوتەو

نە ئەیناسی: بەڵام ئاخر کاکە مستۆ!

باپێت بڵێم.. ئەوە مچەی توور فرۆشی

ژێر پردەکەی لای ئێمەیەو

لە تەکتاندا کەوتۆتە ڕێ.

هەر خۆتان نین، ئەرخەوانەو، دارگێلاسەو،

مانگی سوورەو، چەخماخەیەو، هەمووماونین!

2004/3/24

# بنەماڵەیەك

# لە گوڵی شەستپەڕ

"پەخشانە شیعر"

زەمانی بەستەڵەك و شەختەبەندی ناو هۆش و گۆشمان بوو. دەورانی زاووزێی خورافات و ئاخۆران و بخۆرانی خانەی بە جەنگ و ئافاتی سیاساڵو پەرت پەرتبوونی جومگەکانی جەستە و بلووری ڕۆحمان بوو. لەودەمەدا، کوردو تاریکی دووانەی نێو ئەشکەوتێکی قووڵی بە زوقم و نسێداری ناوشیاری بوون. عەقڵمان لە تەونەکانی ماڵە جاڵجاڵۆکەیەکی گەورەدا، کە سەرێکی لە ئەستەمووڵ و ئەویتری لەوپەڕی دنیا بوو، لە لیکاوێکی لینجدا گیریخواردبوو. چاخی تاریکستان بوو. لە چڕبوونەوەی ئەو شەوەزەنگەدا، لە ماڵێکی سپیی سەردەرگا و پەنجەرە بە لاولاو هەڵزناوەوە، لە دەروازەی مژدەیەکی کەسك و لاشیپان و والآ و لەسەرپشتەوە، گەش گەش چرای پەیامبەرێکی شارێی ئێمە هاتە دەرەوە و تاریکیی شڵەژاو سڵەمییەوە و بەرەودوا گەڕایەوە، چرا هات و ژان هات و ژان ڕۆیشت و دیرۆکێکی درەوشاوەی تازەمان لەدایکبوو، کوڕێك کەوتە سەر کاسەی ڕووناکی و ژیان ناویان نا: بەدرخان..!

بنەماڵەیەك لە گوڵی شەستپەڕ

ئەو وەختەی گوڵ ئەبێ بە پەیف و

پەیف ئەبێ بە باران و

بارانیش ئەبێ بە ڕووبار و

ڕووباریش ڕووئەکاتە پاشەڕۆژ..!

ماڵباتێ لە وشە و پرشە و جریوە جریوەی ئەستێرە

ئەودەمەی ئەستێرە ئەبێ بە یەکەمین ڕۆژنامە و

ڕۆژنامە ئەبێ بە پەیژەی خۆرەتاوی ئێمەو

خۆرەتاویش بە چریکە چریك زەینی داگیرساو..!

بنەماڵەیەك لە مەرەکەب

مەرەکەب لە ئاوی ژان و

ژان لە شەونخوونی و

شەونخوونی لە عەشق و

عەشقیش لە گزنگی بەیان..!

میقدادێ لە گوڵەگەنم وەختی کەروێشکەکردن.

سمێڵێ لە وردە پەپوولەی قەترانیی.

دووچاو لە هەڵووژە ڕەشەی ئامەد و

شان و ملێ لە تاڤگە و

دە پەنجە لە ژیەکانی سروەی سەربەفری هەکار و

دەم و لێوێ لە گوڵی دارهەنار و

فێستێکی کڕکەوتوویش لەسەر ئەو هێلکەی سەرەی

مانگەشەو هەڵدێنێ..!

بنەماڵەیەك لە چل چرا.
جەلادەتێ.. لە یەكەم هەوری پەڵە وەختی دابارین.
سوورەیایەك.. لەترووسكە تروسكی گوڵ ئەستێرە
وەختی خلبوونەوە.
كامەرانێ.. لە سەفەری غەریبی كاتی دابڕان
ڕەوشەنێ.. لە گوڵ خەندەرانی ژنان و یاخی بوو
لە ژووری حەرەم و باخی سوڵتان..!
ماڵباتێ لە پەلكە ڕەنگینەی بەرهەتاوی گورگەزێ
وەختێ كەوانەیی شان و مل بە تنۆكی زیوینی
بریقەدار، بەسەر چیای كاكۆڵ درێژدا
ئەنوشتێتەوە و ئێوارەیەكی چاو سەوز لە ئامێز ئەگرێ..!
بنەماڵەیەك لە سوورەتی
كوردایەتی و شارستانی
وەختێ سوورەت ئەبێ بە گەڵا و پژوپۆی
خۆشەویستیی و هەموومان دائەپۆشێ..!
خێزانێ لە دوورە ئاگری دیاری سەرلووتكە
ئەو وەختەی بەفر و هەڵەكۆك لەوێن و
مانگ بۆ پیاسەی سەر بەفر هاتۆتە خوارەوە و
خەرمانەیش لەناو خۆیدا ئەیانخەوێنێ..!
ماڵباتێ لە قوللەی پیرۆزەیی ڕەنگی شەرەفنامە
ئەو وەختەی شەرەفخان
لەناو دەربەندی نووری كێوانەوە

کتێب لە بن هەنگڵدا و گوڵاڵە بە دەستەوە

دێتە دەرێ..!

ئەی پەیامبەرەکانی باران و ڕۆشنایی..!

کە ئێوە هاتن. شاخ خەبەری بۆوە و هەردوو

چاوی گڵۆفت و چووە بەر ڕێژنەی تازە..!

کە ئێوە هاتن زەنگ هات و خۆی بە ملی

دەیجووردا هەڵواسی و لەناو بێدەنگیدا زرنگایەوە و

ئیتر زمانەکەمان شەبەقێکی ئاڵی تازەی تێکەوت و

چوون شەقژنی کۆترە باریکەی

ناو شیعرەکانی "خانی"ش

بەرزەفڕ لە ئاسماندا کەوتە سەما..!

کە ئێوە هاتن، ئایندە لە چاوتاندا بوو.

کۆتر لە باخەڵتاندا و بە هەردوو مشت ڕووناکیتان

ڕشتە ناو ماڵەکانمانەوە و پەنجەرەی بیری

نوێتان بۆ دیوارە نابیناکانمان دانا..!

پرژە پرژە فوارەیەکی تازە لە حەوشەی مێژووماندا

شکۆدار کەوتە هەڵچوون.

ئیتر لەو کولتوورە جیابوونەوە کە خەنجەری تۆڵە و

تیرەگەرییان لەسەر جەستەمان لە هەسان ئەدا.

لەو نەریتە ڕاپەڕین کە کانییەکانی ژنی تێدا

ئەکوژراو چرای تیا خاکەسار ئەکرا..!

ئەی قەڵەمە بانگدەرەکانی

سەر منارەی شارستانی:
پەنجەکانی ئێوە بوون، بۆ یەکەمجار، لە کێڵگەی وشەدا
گوڵەبەڕۆژەی ئەم زمانەیان چاند و
گوڵەبەڕۆژەش بوو بە ڕۆژنامە و ڕوو لە خۆری درەخشان
باڵایکرد و ئاوێزانی بوو: کوردستان..!
پەنجەکانی ئێوە بوون. دەستەکانی ئێوە بوون. بۆ یەکەمجار
لە دڵۆپی ئازار حەرفیان چێکرد و وشەیان چنی و
هەر چاوەکانی ئێوەش بوو.. بۆ یەکەمجار لە شەوی
نامۆیی و لە ژووری تازە زاوای چاپخانەدا بوون بە
نەورۆزی نیشتمان..!
باپیرانێ لە سنەوبەر
باپیرانێ لە گڵۆپ و
باپیرانێ لە پاندان و
باپیرانێ لە جاویدان..!
ئەی چراکان..!
ئێمە هەمووومان لەژێر فێستەکانی ئێوەوە هاتووین..!
ئێمە هەمووومان لە ڕەچەڵەکی قەڵەم و قەڵەمدان و
پەڕەکاغەزی ڕۆژنامەکەی ئێوەوە هاتووین
ئێمە هەمووومان، بە نەژادی شارستانی، ئەچینەوە
سەر شەقامە جوانەکانی ئێوە
ئێوە باپیرە پەنجەرە و
باپیرە گوڵدان و باپیرە چاپخانە و

باپیره غەزەتەی ئێمە بوون..!
ماڵباتێ لە شەوی ئاوارەبوون
وەختێ کە سایەقە غوربەتی تیا ئەپرژێ و
مانگەشەو ڕووتە و لەناو بەفرا هەڵئەلەرزێ و
میقدادێکیش بە تریفە
یەکەم سەروتار ئەنووسێ..!
ئەی باوکانی تەریقەتی کوردستانیی..!
کە ئێوە هاتن لاوکی سەر بە هەلاڵەیش بە قەتار هاتن..
قۆڵ لە قۆڵدا تریفە و بەفر و مەم و زین پێکەوە هاتن
کە ئێوە هاتن لە پێشوازیتاندا..
کارمامز و شیعری جزیری و ڕۆحی نالیی پێکەوە هاتن
کە ئێوە هاتن
بە دەم ڕۆیشتنەوە دیجلە پێکەنی و
جودی بە دەم ئاگرەوە سەری هەڵبڕی و
دەریاچەکەی "وان"یش لە خۆرنشیندا
بزەیەکی ئەرخەوانیی گرتی و بە شەپۆل لە کەناردا و
لەسەر لم بۆی نووسین.. بەخێرهاتن..!
خەرمانێ لە شارای عەقڵ.. خەرمان بەرەکەت..
دەشتێ لە حەرف و
مێرگێ لە وشەو
باخێ لە ڕستە و
بەدرخان بەرەکەت..!

**ئەی پەیامبەرانی باران و ڕۆشنایی..!**

**هەموو خۆرهەڵهاتنێ.. بە چەند گزنگێ دەست پێئەکا**

**لەو دەمەدا، ئەو چەند گزنگە ئێوە بوون..**

**هەموو سروودێ، بە چەند چریکەیەك دەست پێئەکا**

**لەو دەمەدا ئەو چەند چریکەیە ئێوە بوون**

**هەموو فڕینێك بە چەند باڵلێکدانێ دەست پێئەکا**

**لەو دەمەدا.. ئەو باڵانە باڵی ئێوە بوون.**

**هەموو لە دایکبوونێکی تازەیش بە چەند بەرەژانێ دەست پێئەکا**

**لەو دەمەدا، ئەو بەرەژانە تازانەیش هەر ئێوە بوون.**

**ئای خودایە..!**

**ئەم هەموو قەرزە زۆرەی کە بە قەد گەلای داری**

**حەوشەکەی ماڵی میقداد بەدرخانە..**

**هێندەی ژمارەی هەناسەی وشە ساردەکانی جەلادەتە**

**ئای خودایە ئەم قەرزە کەڵەکەبووەی، بووە بە قەلای هەولێر و**

**هەروەها لە ژمارەی خەمەکانی دیاربەکر تێپەڕیوە و**

**لە فرمێسکەکانی ئێستای قامیشلو زۆرترە**

**ئای خودایە.. ئەم هەموو قەرزەی وەفایە چۆن بە من ئەدرێنەوە..!**

**چی بکەم مەگەر دەستەکانم هانا بۆ:**

**پەستەکەکەی حسێن حوزنی و**

**بۆ سدارەکەی پیرەمێرد و**

**بۆ چاویلکەکەی شێخ نوری و**

**بۆ گۆچانەکەی برایم ئەحمەد و**

بۆ بۆینباخەکەی شاکیر فەتاح بەرن

تا فریام کەون..

مەگەر ئەو هەموو وشەگەلەی ناو قامووسەکانی هەژار و

زەبیحی بێن بە دەنگمەوە، مەگەر هەر دە پەنجەم

بکەم بە مۆم و لە ژوورسەری کێلەکانیاندا

دایانگیرسێنم.. ئای خودایە..!

مەگەر وشە بە وشەی ئەم بنەماڵەی هەتاوە

لە ژونێفەوە بۆ قاهیرە و لەوێوە بۆ پاریس و

لەوێشەوە بۆ شام و تا کوردستان بە کۆڵ

بیانگێڕم.. مەگەر دەستۆکی چاپخانە کۆنەکەی

قاهیرە تا مردن بادەم.. مەگەر دەنك بە

دەنکی خۆڵی سەر گۆڕەکانیان ماچ بکەم

مەگەر خۆم بکەم بە "ڕۆڵە"ی مەکینەی چاپ و

هەر هەموو "کوردستان" و "هاوار"م لەسەر

چاپبکەنەوە ئینجا بەشێکی گچکەی ئەم قەرزە بدەمەوە..!

ئای خودایە..! چەند قەرزاری ئەم کۆگای پرشنگانەین..

چەند قەرزاری ئەو بارانانەین..! چەند قەرزاری ئەم ڕووبارانە و

ئەم مەکتەبانە و ئەم شەقامانەین..!

ئاخر کام بەوەفابوون لە باڵای خۆشەویستی ئەوان

کورتتر ناهێنێ..؟ کام پلیکانەی بەسەرکردنەوە ئەگاتە

هەورەبانی سەری ئەمان..!

بنەماڵەیەك لە شانەی هەنگوین

ماڵباتێ لە بنجی ئەڤین
خانەوادەیەك لە نەسلی شەفەق و
خێزانێ لە مۆرد و گوڵەعەتر و
تاڵەقژی نازەنین..!
ئەمڕۆ دەم و چاوی بۆتان بوو بە دەموچاوی میقداد بەدرخان
گەردنی گۆیژە بوو بە گەردنی گۆران، باڵای بازیان بووە بە
باڵای ڕەفیق حیلمی و دەستەکانی زاخۆ بوون
بە دەستەکانی یوسفی و دەشتەکەی قامیشلو بووە
بە هەناوی جگەرخوێن و قەدری جان و عوسمان سەبری.
جبەکەی عەللائەدین سوجادی وا لەبەری دارگوێزێکی
هەوراماندا و پشتێنەکەی گیوموکریانی قەڵای هەولێر
بەستوویەتی و جانتاکەی دارا تۆفیق وا بە دەستی شەقامی
کاوەوە و ئەو پەتەیش کە کرایە ملی مارف بەرزنجی ئێستە
بووە بە پەتی ئاڵاکەمان لە کەرکوکدا.
دەستەیەك لە خەمی پێشڕەو
دەستەیەك لە قەڵبەزەی مارشی ئازادی
هەڵبژاردەیەك لە یاڵی داگیرساوی ڕەوە ئەسپێ لە غاردا..
چەپکێك لە کڵپە کڵپی چەپکە قەڵەم
ڕیزێ ئینجانە لە باڵکۆنەکانی زمانی کوردی و عەرەبی و دنیادا
ڕیزێ یاقووت لە ملی پەیکەری ڕۆژنامەدا
ئەمڕۆ "با"م دی وتی:
ناکرێ بۆ ئەم پیاوانە نەچەمێمەوە..!

بەردم دی وتی: ناکرێ من لەبەر ئەوان هەڵنەسمە
سەرپێ. درەختم دی وتی: هەتا ئەڕۆن دەست بە سنگەوە
ئەگرم بۆ ئەوان..! ڕێ و بان وتیان: کە ئەوان بە سەرماندا
ئەڕۆن ئەحەسێینەوە.
دەستەواژەکانی ئەم زمانەیش لە زاری ڕۆژنامەکانی
ئێستاوە وتیان: ئەگەر ئەوان نەبوونایە ڕەنگ بوو ئێمە لاڵ بووینایە
لە دواییشدا مێژووم وتی: تا ڕۆژنامەی
"کوردستان" دەرنەچووبوو من وەجاخ کوێر بووم..!!
بەدرخانیەکان:
پێشەنگێ لە هەورە تریشقەی نارنجیی لەناو ئاسۆیەکی
تاریکدا..! چەند کلاورۆژنەیەك لە زەمانێکی کوێرە
مووشەدا. چەند هاوارێك لەناو مەملەکەتێکی لە هۆش
خۆچوودا. چەند ڕاپەڕینێك لەناو جەستەیەکی نووستودا.
چەند خەونێ لەناو ساڵانی بێ خەوندا و چەند
ڕێژنەبارانێ لە سەردەمی کوللە و قات و قڕیی ڕووناکیدا.
کۆمەڵێ قەڵەم.. لە داری خۆرەتاو
کۆمەڵێ ڕۆژنامە.. لە کاغەزی سپیی بەربەیان
کۆمەڵێ ئەموست.. لە تیشکی باریك و
دیسانەوە کۆمەڵێ مۆم
ئەسووتێن و ئەسووتێن و
منیش ئەمشەو سەر و ملم و قولەمشتم و
هەردوو دەفەی شانەکانم و چاڵی چاوم و

**ناو تاقی ڕۆحم ئەکەم بە مۆمدان**

**بۆ هەموویان.. خەرمانی وشە بەرەکەت..!**

**چرای بەدرخانیان بەرەکەت**

**ڕۆژنامە بەرەکەت و**

**خۆشەویستیی کوردستان بەرەکەت..!**

سلێمانی

2004/4/17

# مەرگی کانییەکی سەوز!

"پەخشانە شیعر"

**لەپاش دوا کۆچی ڕەنگێکی سپی پاراو بە نمەی پاکژی و**
**ئاژاری هونەرێکی خوداوەندیی. ئیتر گەواڵە هەورە**
**سپیەکانیش، عەشقە سپیەکانیش، شیعرە سپیەکانیش،**
**وەك جەستەی بە بریقەی دار بەلاڵووکە کوژراوەکەی**
**سەر شەقامی سەهۆڵەکەی ئێمە، ئەوانیش، وەك کەلەپۆ**
**ئاڵ ئاڵ هەلگەڕان و، بژنگ بژنگی، قرمزییان،**
**پەرش و پەرت پەرت، پژانە سەر کەنارەکانی بێهودەیی**
**ئەم "بوون"ە پووچەڵەو، ئەم دەورانی زەمانە**
**ناچیزەیەو، ئەم یاڵی شوومی ڕێکەوتە چەمووشانەو،**
**پەڕوباڵی ئەم تیتراوسکە عاشقەی سلەیمانییان بە**
**خووناوی نیگای خۆیان لە بارینێکی گرافیکیدا پنۆك**
**پنۆك کرد!**
**هەموو شتێ سپیی**
**فڕینی سپیی. سەرنجی سپیی**
**ئاکار سپیی. پەیڤین سپیی**

سەرو ڕیش سپی و خۆشەویستیی سپی و
هەر مەرگ ڕەش!
ئەی تیتراوسکە سپیەکە!. ئەم شەقژنە خێرایەی دواییت
بۆ؟! تۆ هەمیشە هێدی هێدی ئازارەکانی ڕەنگ و
تاژانەکانی ڕۆح و گەڵاکانی خەزامی نامۆیی خۆت و
ئەم وڵاتەت ڕائەژەنی!. ئەم پەلەی ڕووکردنە
ئاگرە چون پەپوولەیەکی وێڵی ڕوو لە بڵێسە بۆ؟!
تۆ کەی بە گڤەگڤ و بە وژە وژو بە ناڵە ناڵ و
فلْچە بە هاوارو، هێڵ بەزاق و زیق و، تان و پۆ
بە ژاوەژاو بووی؟! تۆ ئەگەر بگریایتایە کالانەی چاو
گوێی لێت نەئەبوو! لە زەمانی هاڕیندا، وردوخاش
ئەبوویت و بەڵام سروەیش گوێی لێت نەئەبوو!. برسێتیی
ئەیخواردیت و بێدەرەتانیی تووڕی ئەدایت و بەڵام نە
نان و نە خانە و ژووریش گوێی لێت نەئەبوو!. ئەم پەلەپەلی
سەفەرە چی بوو؟! کوا ڕەنگەکانی تۆ پەلەپەل کەرو بە هەڵپەو
بە هاش و هووش بوون؟!
هێوریی پەڕەمووچەکەی کلووی بەفر و، پەنجەی یەزدانیً
لەوەختی خولْقاندنی قۆزاخەی کرمێکی ئاوریشما و بێدەنگییەك
لە قولْبوونەوەی بەر زەردەپەڕی ئێوارەی گۆمێکدا لەناو
تۆدا بوو! کوا دەستەکانی تۆ لە دەستی ڕەشەباو،
کوا چاوەکانی تۆ لە چاوی لافاوی بەگرمژن و بەهاژە هاژ
بوون؟! تۆ ناسکییش ئەیڕوشاندی!. تۆ شنەبایش

ئیرەیی پێ ئەبردیو، لە ئاو نەرمتر بووی!
تۆ قامکی کامیان بووی
مانگەشەو یان پەنجەی باران؟!
تۆ گلێنەی کامیان بووی
کانیی یاخود گەڵاڕێزان؟!
کاتێ عەشقت لەناو غوربەتا ئەنەخشان
بەرد بۆ بەختی خۆی ئەگریاو
ڕووبار بۆ سەرچاوەی خۆی و
مەل بۆ هێلانەی خاپووری.
تۆ سەوزیی پڕوپۆی مێرگە چاوتەڕەکانی
ناو گەلەریەکان بووی!
سەوزێکی کاڵی سادەی بێفیزی زۆر گوێگری
کەمدووی گەلێ جار لە گۆشەی بێ بریق و باقی
پایزێکدا، چون شۆڕەبیەکی ڕاماو لە بندێن و
قوڵیی گۆمێ بەتەنیا ڕائەوەستای، بەرامبەر
پرسیارو نەهێنیەکانی ناو ڕەنگ و دەرەوەی ڕەنگ و
ناوخۆت و دەرەوەی خۆت ئەبویتە شیعرێکی کاکۆڵ
سپیی حەپەساو!. ئەرێ! تۆ هەمیشە درەختێ
بووی لە سێبەر و هەتاو!. درەختێ بە کراس و
پانتۆڵێکی غەمبارو ژاکاوەوە! بەڵام بەردەوام
لێوی سەرچڵ بەزەردەخەنە. بەردەوام لە ناو
پەیوەندیە زبرەکانیشدا ناسك. ئاو بووی بۆ

هەمووکەس. درەختێ بە یەخەیەکی کراوەی بێدەربەست و
پانتۆڵێ لە هەوری چرچ و بەڵام خەیاڵێ بێگەرد و گیرۆدەی
عەشقی گرافیك!. قژو ڕیشێ کە بەفرە خواوەندە
وێنەکێشەکەی سەر پیرەمەگرون بۆ ئەبەد دابویتێ.
سەوزێ لە گیانی کچە سەوزەڵەیەکی بەرپەنجەرەی دەمەو ئێواران.
سەوزێ لە مەنفای ناونیشتمان.
سەوزێ لە پەنگ خواردنەوەی ڕەنگە ئەزەلیەکانی
ناو وڵاتی حەرام!.
چەند هێڵێ لە تەمومژ و زوخاوی بێدەنگ
چەند بۆشاییەك لە حەسرەت!.
پیاوێ لەو ڕووناکیانەی نە خانەی خۆی و
نە جادەکان و نە حاکمەکان و نە هەرێمەکان و
نە سیاسیەکان و نە عەسکەریەکان نەیانئەناسی و
نەیان ئەزانی ئەم گڵۆپە کێیە؟!
پیاوێ نیوەی لە نەورەس و نیوەی لە فریشتە.
چاوی خودا لە پەنجەیدا و زاووزێی ڕەنگ لە فڵچەیدا و
نەفس بەرزیی وەکو دوندێ لە سەریداو
گیرفان بەتاڵ وەکوو کۆترو
لە ڕەنگیشدا، لە هونەری نەمریشدا
زەنگین زەنگین و بەخشندە
چون ئاو. چون ژن. چون ئازادی و
چون دارستان!

ئەی سەوزاییە سەر بە بەفرەکەی ناو شیعرم!

پەروانە تۆ نەبی کێیە؟

ئەی سروە تۆ نەبی کێیە؟!

گەلەریەك لە خەزان و

پێشانگایەك لە باران و

چوارچێوەیەك لە خەرمانە و

لەوحەیەکیش لەم سوتانەو

فلچەیەکیش لە زوقمەکەی ناو دەروونم و

ئەمانە تۆ نەبن ئەی کێن؟!

ئەستێرکێکی بەر مانگە شەو وەختێ کە ڕەنگ تیا بخەوێ!

ئەویش تۆ نیت؟

ئەی گرافیکی شەبەنگێ وەختێ خودا بیچنێت و

بیداتە دەست عاشقێك و عاشق بیداتە

دەست جوانیی و، جوانیی بیداتە دەست ڕاستیی و

ڕاستیش بیداتە دەست دوا ڕۆژ،

ئەی ئەمانە تۆیان تیا نیت؟!

ئەی شیری ناو گوڵە گەنم؟!

پەڕێك بەدەم کزەباوە؟!

کلووی ناو خەو؟!

برایمۆکی ناو بەفرانبار؟!

پڕیشکی ئاوی قەڵبەزەو، دەنگی ژن و،

ماچی مانگە شەوو شەختەو، خەنینەوەی ساوایەکی

ناو هەڵەبجەو، ڕامووسانی نێوان گوڵە هێرۆیەکی
سپیی و (با)یەکی کەسك. کراسی سەوزی
کچێکی سپیکەلە کە بۆ پیاسەی ئێوارەیەك،
بۆ ژوانێکی ڕاگوزار، ئەچێتە سەرجادەی سەهۆڵەکە.
ئەی ئەمانەیش تۆیان تیا نیت؟!
من لە زۆر شوێندا و لەناو دەیان و
سەدان باڵەفڕێی ڕەنگ و هات و چۆی
جوانیدا ئەتبینمەوە: لە نەخشە هەرە
وردەکاندا:
جێ پێی چۆلەکە لەسەر بەفری تازە باریو.
ئەو زەردە پاکەی لە پێڵوی زەرنەقووتەدا هەیە.
لە تیسکی زۆر سپیی کارژۆڵەی تازە زاودا.
لە لەرزینی دڵۆپە شەونمێکی سەر گەڵای پاییزدا.
یان لە وردە ماسییەکی پوولەکە ڕەنگینی بن
حەوزێکی ڕووندا وەختێ هێواش هێواش بجووڵێ.
لە نوشتانەوەو هەستانەوەی لاسکە گیایەك
لە بەردەمی پرژەی تاڤگەیەکدا.
لە خل بوونەوەی پەپوولە پایزەیەکی وێڵی سەر
زەوی گەلەریەکدا، لە بلقی ئالی کولێرەیەکی
گەرمدا. دوای بوولێڵیش لە مۆمێکی
داگیرساوی کێلی ژوور سەری کچێکی عاشقی کوژراودا.

★

پۆپنەی کەڵەشێر لەبەر هەتاودا ئاڵێکی ڕوون و بێگەردە
من ڕەنگی تۆم لەبەر خۆرنشیندا بەو جۆرە ئەبینی.
وەختێ پەپوولە ئەفڕێ و ئەنیشێتەوەو دەنگیش ونە،
تۆ بەو بێدەنگییە ئەفراندنت کرد بە ڕەنگ.
چاوی پشیلە لە تاریکیدا وەك مۆم ناچەقیت
ئەو بریسکە بریسك هات و چۆ ئەکات!
تۆ خەمی بریسکەدارت جۆگەی ئەو ڕەنگانە بوون
کە هەمیشە لە ڕۆیشتندا بوون
تۆ لە ناو خۆتا، ڕقت ئەوەندە تەنك تەنك کردبۆوە تا ئەو شوێنەی
کە لەمدیوەوە منداڵ و مەسیحمان بە ڕوونی تیا ئەبینیت.
تۆ ئەوەندە هونەرت بە ڕۆحتەوە نوساندبوو تا ئەو شوێنەی
گەلێ جار خۆت و نان و ماڵ و منداڵت لە بیرئەکرد. تۆ لەناو خۆتا
قرچە قرچ ئەسووتایت و بەڵام بۆ دەرەوە سەرتلێ بووی
ئەشنایتەوەو پێئەکەنیت.
تۆ ئەو شیعرە سەروڕیش سپییە بووی
کە لێوان لێو بووی لە حەیرانی سەوز.
تۆ ئەو سەوزەیش بووی کە پڕپڕبووی
لە خەزان. ئەو خەزانەیش بووی
کە سەر ڕێژ بووی لە گەشانەوەو
ئەو گەشانەوەیش بووی کە سیخناخ بووی
لە هەڵقرچان!
تۆ زەردەخەنەی وەرین بووی.

بارانی تینوو تۆ بووی.
لە سەرەوە مەنگ و لە بنەوە بەهاژەو
لە سەرەوە دووکەڵ و لە بنەوە کڵپە ئاڵ و
لە ڕووخسارتا بەفرانبارو
لە هەناویشتا ئاگر باران بوو.
فڵچەیەکت بۆی گێڕامەوەو وتی:
قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمدی ئەو
من هەڵکێشێ لە ڕەنگی خۆی و ژیان
بۆ ئەوەی دوور لە خۆشەویستیی بمانفرۆشێ و
بماندا بە نان!

★

ئەوە: زەمانە، ساڵ لە دوای ساڵ بە ڕەنگی بیرچوونەوە
ڕەنگەکانی دی کاڵ ئەکاتەوە یان ئەسڕێتەوە. دایان
ئەپۆشێ، ونیان ئەکات. بەڵام هاوڕێم تۆ ئەگەر
بە دوو تابلۆیش بێ و منیش بە دوو شیعر. ئەچینە ناو
جەستەو ڕۆحی ئەو شوێنانەوە کە سرمدین. کە بێکۆتایین
وەك سەری پیرەمەگرون و گۆمی وان و چاوی سەفین!

★

هەنووکە چاوم لێیە: شەماڵێکی غەمباری قژ خاوی
نەرم و نیان خۆی لە ڕۆحت هەڵئەکێشێ بۆ ئەوەی
لەم چلەیەدا سەوز بێ و لەگەڵماندا دوا تابلۆت
ڕاژەنێ. هەنووکە چاوم لێیە مانگ خۆی سەوز

ئەکات بۆ ئەوەی ئەمشەو لە کەژاوەی ڕەنگەکانتا جاویدانە
بخەوێ. هەنووکە چاوم لێیە: کۆترێکی دڵداری گڵەزەردە
گمەی سەوز ئەکاو فڕینی سەوز ئەکا بۆ ئەوەی لەم بەهارەدا
لاواندنەوەیەکی سەوزمان بۆ بڵێ!.

★

کە دەستت ئەبرد بۆ ڕەنگ.. ڕەنگ ئەبوو بە دەنگ.
کە لە ڕەنگ ڕائەمای.. ڕەنگ ئەبوو بە مانا.
کە وێنەی ژنێکی ئەنفالت ئەکێشا.. لە ڕەنگدا زریکە ئەڕسکا!.
کە زەردو کە سپیت جیابەجیا دائەنا
ژوورەکەت پڕ ئەبوو لە نێرگز.
ئەو وەختەی ئازارت تێکەڵی سوور ئەکرد
لە ژوور سەر چرپاکەت
شەهیدێ بە پێوە ئەوەستا!

★

من ئەم ئێوارەیە لە تاودا زمانی کوردی
ئەشڵەقێنم. زمانی کوردی شلوێ ئەکەم و
سەراسیمەی ئەکەم و شێتی ئەکەم!. وشەکان
پەڕاگەندەی ناو کێڵگەی مین ئەکەم. فەزای ڕستە
ئارام بەخشەکان پڕ ئەکەم لەو چرە دووکەڵانەی لە توونی
ڕەنگی ڕەشەوە دێنە دەرێ. بە تەواوی دەست
لە وشە گەلی چەشنی وەك خۆشی و
ئاسودەیی بەرئەدەم. ژنە شیعری زەرقیمە تەڵاق
ئەدەم و لە هەواری خۆڵەمێشدا هەڵئەدەم.

من ئەمڕۆ وەك خۆم چۆنم ئەوێ زوبانیش

بەو جۆرە: بحەپەسێ، بشلەژێ، بژاکێ. بوەرێ!.

حەپەسانی زمان، ئەوق بوونی ماناکانە لەبەردەمی

فاریزەکاندا و دانیشتنی بێ دەسەڵاتانەی ئەوانە

لەسەر بەردی نوختەکان. شڵەژانی زمان، شپرزەیی

ڕێزمانە وەختێ ناوو ئاوەڵناوو کردار و چاوگ و

هەر هەموویان جێگۆڕکێ ئەکەن و لە یەکترەوە ئەئاڵۆزکێن.

زمانی ژاکاو ئەو ڕستە نیوە ناچڵانەن کە لە چڵی

قرتاوو گەڵای لاچاو قرنجاو ئەچن و نوختەی سەرو

ژێریان تێکەڵ بە یەکتر ئەبن. وەرینی زمان، ئەو

لاپەڕانەن کە لە دوای چەندین ڕەشنووسیش ناگەنە.

ناکامێك و ونجڕونجڕ ئەکرێن!

من ئەمڕۆ ئابلۆوقەی زمان ئەدەم. هەموو ڕێگەکانی

چواردەوری ئەبەستم بۆ ئەوەی دالدەی دڵنیایی و

ڕەنگی ئارام نەدەن. من ئەمەوێ ئەمڕۆ

ڕەنگەکان سەرگەردان بکەم و لە نیشتمانی خۆیاندا

ئاوارەیان بکەم!

★

ئەمڕۆ من چل گوڵەباخ ئەدەم لە قژ و ڕیشە سپیەکەت. چل پەپوولەی وەنەوشەیش بەسەر جەستە ماندۆکەتدا بلاوئەکەمەوە. لە چواردەورت چل وشەی ڕەنگاوڕەنگ دائەگیرسێنم. چل پەلکە گیا لە دەستەکانتەوە ئەئالێنم. چل ماچم بە چل دلۆپەبارانیدا ڕەوانە ئەکەم و چل

هەنیسکم بە چل خاڵخاڵۆکەدا ئەنێرم و چل هەناسەیشم ئەخەمە
ناو شیعرێکەوە و بە بای وەشتدا بۆت ئەنێرم.
چلەتە و بەڵام ئێمە هەر لە یەکەم ڕۆژی فرمێسکداین. لە یەکەم
ساتی ڕامان و بڕوانەکردندا. ئەڵێن چلەتەو بەڵام ئێمە هەموو ڕۆژێ
هەر چاوت بۆ ئەگێڕین و ئەڵێین هەر دێت و ڕەنگە ڕووباری
لەوحەیەك دوای خستبێ. ڕەنگە خەریکی ڕامکردنی ڕەنگێ بێ.
ڕەنگە لە ناو پەڵەیەك گوڵە هێرۆی سپیدا خەوی لێکەوتبێ. ڕەنگە
لەگەڵ کەوێکی سپیدا سەفەری کردبێ. بەڵام هەردێت. ئەو ڕۆژە
لەبەردەمی مۆزەخانەدا. دووراو دوور پیاوێکی سەروڕیش سپیمان بینی و
شتێکی لەبن هەنگڵدا بوو. وتمان ئەوە خۆیەتی و، ڕامانکرد،
کە چووینە پێشەوە پیاوەکە دیار نەماو بەڵام لەو شوێنەدا
لەوحەیەکی تۆ دانرابوو!

★

هەر یەکسەر، دوای خەوتنی بێسرپەو تەنیا تەنیای هەتا هەتاییت!.
دوو پەپوولەی ڕەش، کە هەر پێڵوەکانی خۆت بوون، کەپرە
سپیەکەی سەرتیان بەجێهێشت و هەڵفڕین و هاتن و هەواڵی
ژێ بە هەنیسکیان، گەیاندە ناو کۆتەڵی ڕەنگەکان و وتیان:
ڕەنگە مێینە نازدارەکان!
ڕەنگە نێرینە ئازیزەکان!
فرمێسکی تازەتان باش!
ئیتر سەوزە قژوڕیش سپیەکەی "چایخانەی شەعب"ی ئێمە
جارێکی دی نایەتەوە ئەم هەوارە بە ژەنگ و ژارو خۆڵەمێشییەی ئێوە.

وەك چۆن ڕستەبازنی سەوزی دەست و مەچەكی بلوورینی ژنە
سپیەكانی ئەنفال نەهاتنەوە!. وەك چۆن دووچاوی
سەوزی منداڵێكی وەسانان ئیتر نەهاتنەوە. وەك چۆن
خۆزگە سەوزەكان نەهاتنەوە. زریكە سەوزەكان نەهاتنەوە.
نایەتەوە. ئەو بە هێواشی چۆتەوە ناو كەژاوە پەمووی
خەونێكی پاییز. چۆتەوە ناو تراویلكە هەرە دوورەكان. لەوێ
ئەبێ بە كەنارییەكی سەرباڵ سەوزی باخەكانی خوا.
ئەبێ بە تیلماسكە هێڵێكی ئاسۆیی لە كراسی سپیی فریشتەیەكدا
كە یەزدان كردوویەتی بە وێنەكێشی پۆرتەرێتی بێوەژنەكان.
لەوێ ئەبێ بە نەورەسێكی نامەبەر لەنێوان سنەوبەرە
عاشقەكاندا. ئەبێ بە زنەیەك كە كیژۆڵە سەوزەڵە
ڕفێنراوەكانمان لێی ئەخۆنەوە و بەس. لەوێ ژوورە ڕەش و
سپیەكەی بە تەنیشت ژووری جووتێ پەڕەسێلكەی دڵدارەوە
ئەبێت. لەوێ سەرینەكەی شیعرێكی سپیی ئەبێت. بەرگی
بەری سترانێكی سپی و بەڵام كڵاوی گریانێكی ڕەش لەسەر
ئەكاو لە دەشتایی نوورێكدا بەردەوام وێنەی گوناهە
سپیەكان و خۆشەویستیە كوژراوەكان ئەكێشێ. لەوێ لە ئاكادیمیای
هونەرە جوانەكانی بەهەشتی خوادا ئەبێتە مامۆستای وانەی
غەمگینی گرافیك. بەڵام ئەو هەرگیز چل حۆری ناوێت، نا، چل
حۆری ناوێت، ئەو بەتەنها هەر ژنە تەنیا و خۆشەویستەكەی
ئێرەی خۆی ئەوێت!

★

کاتێ کۆچ ببوایە بە جووڵەی ڕەنگ تۆ لەناویا
کۆلاجێکی عاشقانە بووی. ئەگەر هێمنی ببوایە
بەڕووی دەریاچە تۆ لەسەر ئەو گەڵایەکی پاییزە
بووی. ئەگەر شەونخوونی ببوایە بە ژانێکی
دوورودرێژ تۆ لەناویا گەمیەیەکی شپرزەبووی.
خۆ کە وەختێکیش کارەسات ببوایە بە
خۆڵەمێشی ئەم وڵاتە، تۆ لەناویا هەڵەبجە بووی!.

★

لەم جوگرافیای حەسرەتەدا!
چەندین کورتە چیرۆکی خوێن گەرم و چەندین قەسیدەی
ڕۆح شیرینم ناسیوە. بەڵام بۆ ئەوەی وشەکانیان
لە برساندا نەمرن، ناچاربوون ببنە بارهەڵگری تەم و
مژو یان حەسحەسی گریان. لەم نیشتمانی ئاخ و
داخەدا، چەندین تابلۆی ڕەندومەردم ناسیوە،
بەڵام بۆ ئەوەی ڕەنگەکانیان لەسەرمادا ڕەق نەبنەوە،
ناچاربوون ئەستوورترین پەتووی ئازارو تاریکیی بدەن بە
خۆیاندا!. ئەی باشە تۆ نەورەسێکی ئێسك سووکی
ئەم ئاسمانە نەبوویت، بەڵام بۆ ئەوەی زەڕنەقوتەکانت
بێ پەڵوولە نەبن، نەئەچوویت و مینت هەڵنەئەگرتەوە؟
مردنی میقاتکراوت هەڵنەئەگرتەوە؟ ئەجەلت هەڵنەئەگرتەوە؟
قەزا و قەدەرت هەڵنەئەگرتەوە؟ دۆزەخە بچووکە خۆمەڵاسدەرەکانی
ئەم ژیانەت هەڵنەئەگرتەوە؟!

باشە تۆ خۆت جۆگەلەیەکی سپی و زیوین
نەبوویت و بەڵام لەبەر نان نەبووبووی
بە کۆڵکێشی دووکەڵ؟!
باشە تۆ خۆت ناونیشانی بزەیەکی سەوزی
ناسکی هەمیشە بەهار نەبوویت و
بەڵام لەبەر نامەی ناکامی عاشقان و
کڕووزەی گوڵان و منداڵان
نەبووبووی بە پۆستەچی پاییز و خەزان؟!

★

تۆ کە بەلادا هاتی و کەوتیتە سەرجادە، هەر لەوێدا
خەمێکی سوور دوا لەوحەتی پێشکەشکردین:
تیلماسکە خوێنێکی باریك لەسەر ئاوێنەی
سەهۆڵی شکڵی تەیرێکی کێشابوو: کە لە ڕێگەی
جێژواندا بە ئاسمانەوە پێکرابوو!.

★

سەوز لە کوێیە؟! بەفرێکی ڕەشپۆش پرسیی.
سەرویەکی باخی گشتیی وتی: لە هەناوی مندا.
سەوز لە کوێیە؟! گریانێ پرسیی.
ژنێکی چاو سەوزی ئەم شارە وتی: لە گلێنەکانی مندا.
سەوز لە کوێیە؟! پەنجەرەی پۆلی پەیمانگەیەك پرسیی.
قەڵەمی سەوزی خوێندکارێ وتی: لە مۆتیڤەکانی مندا.
سەوز لەکوێیە؟! گەلەری زاموا پرسیی.

وێنەکێشێکی منداڵی کەرکوکی کراس سەوز وتی:
لە تابلۆکانی پاشەڕۆژی مندا!.

★

سەوزێ لە نزاری شڵەژاوی
بەردەم چۆمێکی خنکاو.
سەوزێ لە پەلکە ڕێحانەیەك
ئەو وەختەی دڕکەزیەك لێی ئەداو
ئیتر نە (با) ئەتوانێ سەرو ملی
پێ بەرز بکاتەوەو نە دوولێویشی
ئەکرێتەوە بۆ قومە ئاوێ.
سەوزێ لە فانۆزێکی سەوز
ئەو کاتەی فانۆز بەناو ڕەشدا
ڕێ ئەکاو لە پڕێکدا پەڵە شەوقی
سپیی ئەچێتە سەر جەستەی
کەسیرەی تەیری نێوداوێ!.
ئەو چرکەساتە
ئاو ئەگریاو.. با فرمێسکەکانی ئەسڕی.
با ئەگریا و.. دارستان فرمێسکەکانی ئەسڕی.
دارستان ئەگریاو.. سێبەر فرمێسکەکانی ئەسڕی.
سێبەر ئەگریاو.. هەتاو فرمێسکەکانی ئەسڕی.
هەتاو گریاو.. خوا فرمێسکەکانی سڕی
بەڵام کە خودا خۆی گریا

ئیتر کەس نەیتوانی چاوەکانی ئەو بسڕێ!

★

تەیرێکی تەنیا لە "شین" دا

هەناسەیەك لەناو "زەرد" دا

شەوی خولیا لەناو "مۆر"دا

ئازاری سپیی لە "سوور" دا

هەر هەموویشیان لە دواییدا

لەناو شیوەنێکی سەوزا

ئەمانە تۆ نەبن ئەی کێن؟!

سەوزێ لە سەوزی بیر نەچوونەوە چون نەمردنی پەلکەگیا

سەوزێ لە سەوزی بیرنەچوونەوە چون نەمردنی..

سەوزێ لە سەوزی بیرنەچوونەوە

سەوزێ لە سەوزی

سەوزێ

سەوز!

سلەیمانی
2004/4/18

# خەوێکی خۆش!

دوێ شەو

کە هاتیتە خەوم.. دایە!

پڕتکردم لە ئاونگ و لە پەپوولە و

لە شەبەنگێکی بە ورشەی ڕەنگاوڕەنگ و

بەڵام.. دایە!

لەو خەوەدا وەك زەردەپەڕ بەنگ نەبوویت و

زۆر زوو ڕۆیشتی!

بە درێژایی ئەمڕۆ من دایە!

لە شاری خۆشەویستیدا

پێکەنینی قەسیدە بووم لەسەر مێزم و

لەسەر جادە دڵخۆشتر بووم

لەو بارانەی هەتاو باوەشی پیائەکرد.

دڵشادتر بووم لەو منداڵەی

بۆ یەکەمجار لەگەڵ بووکەشووشەکەی باوەشی

قسەی ئەکرد!

بە کەیفتر

لەو پاساریە بزێوانەی

هاتبوونەوە نێو باخچە و
لەگەڵ گەڵا تەڕەکاندا
گەمەی دوای بارانیان ئەکرد!
دڵخۆشتریش
لەو دوو دڵدارەی بە دزی
شەقامەوە، کۆڵانێك دالدەی دابوون و
هەندێ قسە و هەندێ پسکەپسك و چرپە و..
نامەیەکیان تیا وەرئەگرت!"
دوێ شەو کە هاتیتە خەوم
دایە!
پڕتکردم لە منداڵی و
لە بۆنی پیشۆك و نەعناو
لە بۆنی بەڕووی تەقیوی ناو ئاگردان!
لێوانلێو بووم
لە گۆرانیی سەر دیلانێ و
لە تامی بەفر و دۆشاو و
هەموو ژوورەکەت پڕکردم
لە دانوولە و لە گێلاخ و
لە مانگەشەوی ناو چیغ و
لە ئاوی گۆزەی سەرسەربان!
ئەمشەو من زوو ئەنووم دایە!
خەوم چاوەڕێی هاتنتە

دە وەرەوە
بەڵام توخوا وەختێ هاتی
بۆ خەوێکی کورت و کەمی
وەك تەمەنی "بێکەس" مەبە!
بۆ خەوێکی درێژی وەك
غەریبیت و کۆچت وەرە و بیرت نەچێ
ئەم شتانەم لەگەڵ خۆتا بۆ بهێنە
ـ هەتا ئەم شیعرە تەواوکەم ـ
ئەو قامیشەی سواری ئەبووم. سدارەکەی کەشافەم و،
نان و هێلکەی سەیرانێکی "هولۆبە"م و،
جووتێ لەو قۆندەرانەی لە جەژنا پێی ئەگرتم و، مزراحێك و،
عانەیەکی ڕۆژانەم و یەك کۆلارە و دوو ماجومی و
یەك مارمارۆکەی پێچ خواردووی سەر تەندوور و،
کەفی سەر جامی حەمام و ئەو پشتێنەی هەموو جارێ
لێم ئەکەوت و، پەپوولەیەکی پاییزی ناو هەیوان و،
تۆپەوانەی سەر گۆزەیەك کە هەموو جارێ ئەمکرد بە تۆپ و،
لەگەڵ یەك بوخچەی نەکراوەی قسەی خۆشی پوورە حەلاو،
ئاخر شتیش، یەك شلکێنە و یەك کەلانە
کە ساڵی جارێ ئەمانخوارد!
هەموویانم بۆ بهێنە
ـ هەتا ئەم شیعرە تەواوکەم ـ
ئەمشەو من زوو ئەنووم دایە!

کانوونی دووەمی 2004

ئەم کۆمەڵە کورتە شیعرە، بە هەمان ڕیتم و ئاهەنگ و جووڵەی شیعرەکانی "کازیوە" و "ئاوێنە بچکۆلەکان" و "باڵندە بچکۆلەکان" نووسراون‌و ئەمجارەیان ناونیشانی "فلاشەکان" م بۆ داناون. بەڵام دیارە بە بیرۆکەی تازە و لە گۆشەنیگای جیاوازەوە کە لەڕاستیدا هەر ئەویش، واتە شیعری بیرۆکەی چڕو پڕو وێنەی ناوازە، هەوێنی ئەم شیعرانە پێکئەهێنن. بە ڕەنگ و ڕوو هەموو لە یەکتر ئەچن، بەڵام بە جەوهەر هەریەکەو بۆ خۆی دنیایەکی سەربەخۆیە.

ش. ب

# دوو ماسیی

لەناو زستاندا ئەمنووسی

چاوم بڕیە

چاوی باران

دێڕی دەفتەر

بوونە جۆگە

چاوم بڕیە.. چاوی جۆگە

پەیڤەکانم بوونە ڕووبار

چاوم بڕیە.. چاوی ڕووبار

خولیاکانم

بوون بە زەریا

چاوم بڕیە چاوی زەریا و

لە پڕێکدا

گەرداوێکی خەیاڵ هات و

فڕاندمی و لەو ڕۆژەوە

خۆم و پێنووس

بووین بە دوو ماسی عاشقی

ناو ئۆقیانووس!

# ڕاسپاردە

(با) گەڵای پاییز ئەداتە
دەست شاعیرێ
شیعرێکی لەسەر بنووسێ
(با) ئەوەستێ و لەبەر باران چاوەڕوانە
هەتا شیعر
شیعرەکەی لەسەر ئەنووسێ!
وەریئەگرێتەوە و ئەیبا
ئەیداتە دەستی عاشقێ
تا وێنەیەکی بکێشێ
(با) ئەوەستێ و لەناو ڕەنگدا چاوەڕوانە
تا عاشق وێنەی ئەکێشێ.
لەویشی وەرئەگرێتەوە ئەیبا
ئەیداتە دەستی هەژارێ
تا بە زەردەی برسێتیی خۆی
خەمەکانی دابپۆشێ
(با) ئەوەستێ و لەژێر هەورێکی نەباردا

چاوەڕوانە
هەتاکوو زەردەی برسێتیی دایئەپۆشێ
لەویشی وەرئەگرێتەوە و بۆ دوا قۆناغ
ئەیبا و ئەیبا و ئەیداتە دەست
بێوەژنێکی ئەو خوارە
تا لەناو ڕۆحی گەڵادا
دوو فرمێسکی چاوەکانی
خۆی بنێژێ!

# چارەنووس

شەوقێك و

مێشێك و

مێژوویەك.

شەوقەكە كەوتۆتە پێش حەرفی منداڵێ و

منداڵیش (مەولەوی) و (هەورامان) ئەنووسێ.

مێشەكە ئەیەوێ

ڕێ بگرێ لە حەرف و

لە پەنجەی منداڵ و

بە عەبا بەژنی شەوق داپۆشێ.

جارێك و دوو جار و سێ جاروو..

ئەمجارە مێژووەكە هەڵئەسێ و

دەس ئەبا لە تاقی ژوورسەری چرادا

مێش كوژێ دائەگرێ و

مێشەكە ئەكوژێ!

## لەودیوەوە

وەختێ چاوم نا بە کونی مێژووەوە
لەودیوەوە برینێکی قووڵم بینی
ڕایکێشام و
کەوتمە ناوی و درەنگانێ هەستامەوە.
کە چاویشم نا بە کونی برینەوە
لەودیوەوە ئازارێکی قووڵم بینی
ڕایکێشام و
کەوتمە ناوی و درەنگانێ هەستامەوە.
لە دواییشدا کە چاوم نا
بە کونی ئازار خۆیەوە
لەو دیوەوە من دەروون و
ناخی ژنی ئەم وڵاتەم
هەمووی بینی و
ڕایکێشام و
کەوتمە ناوی و ئەمجارە هەڵنەسامەوە!

# کانییەکی تازە

لە خوار کەرکووك
هەڵبەستێکی کورتەباڵام دەستگیر کرا
لە پشتەوە بە قافییەی
شاعیرێکی کۆشکی سوڵتان
دەستیان بەست و
لە پێشەوە بە پشتێنی چیرۆکێکی
قادسییە چاویان بەست و
لە مابەینی
دوو گردی جەوەل حەمرینا ڕایانگرت و
دەسڕێژێك و هەر لەوێدا
تێکەڵ بە خاك و خۆڵ کرا.
دوێنێ لەوێوە هاتنەوە
وتیان خۆمان بینیومانە لەو ئاستەدا
لە مابێنی دوو گردی جەوەل حەمرینا
ئاوێکی ڕوون بە قوڵەقوڵ
هەڵئەقوڵێت و
خەریکە ئەشبێ بە فوارە و هەڵئەچێت و
عاشقانیش ناویان ناوە
کانیی شیعر!

# چاڵێك

چاڵێکم کردە بێدەنگی
لە هاوار.. مشتێ دوو مشت و
لە جەسووری.. خاکەنازێ و
لە زانیاری.. چەند گرامێکی تی ئێن تی و
کردمە ناوی و
دامپۆشێوە و
دوورکەوتمەوە و
پەنجەیەکم نا بە ژاندا و
تەقاندمەوە
گرمەیەك بوو بە تەپ و تۆز و غوبار و
وەختێ کە غوبار نیشتەوە
بێدەنگیم دی
لەت و پەتە و ورد و خاشە و
لەو جێیەدا پیاوێك لە شێوەی بێشکچی
ڕاوەستاوە و
پەیقی ڕووناك دەوریان داوە و
قسە ئەکا بۆ ئازادیی!

# پەیامی باڕەشێك

لەو بنارەدا باڕەشێك
وتی: تەنها یەك ڕەنگ هەیە
وتی: تەنها هەر ڕەش هەیە
هەموو شتێ و بەفریش ئەبێ
هەر لەو ڕەنگەی من بپۆشێ
یان ئەوەتا ئەبێ سەری خۆی هەلگرێ
یاخود بمرێ!
وتی: تەنها یەك ڕەنگ هەیە.
وەختێ باڕەش لەناو دۆڵێکدا هەڵیکرد
لەو ساتەدا بەفر خەوی لێکەوتبوو
چووە سەر باخ.. گوڵان هەموو ڕەش هەلگەڕان.
چووە سەر گرد..
هەرچی دار و هەرچی بەردە ڕەش هەلگەڕان.
چووە سەر دەشت.. پەلکە گیاکان ڕەش هەلگەڕان.
وەختێ باڕەش ئەمەی بینی
لە خۆشییاندا ئەوەندەی تر باڵیگرت و

پڕ بە زاری
ئەو شاخ و کێوە پێکەنی و
وتی: بەفر ئاوەها مرد!
شەو درەنگان بێ خەم بێ خەم
بۆ خۆی لێی نووست
بۆ بەیانی کاتێ کە چاوی کردەوە
بەفری بینی
سێ ڕیز.. سێ ڕیز
ئەمجارەیان ڕەنگاوڕەنگیش
بەسەر دنیادا ئەباری!

# ئەو تۆپەی نەهاتەوە!

لەو پارکەدا چرایەکی داگیرساوی ئازادیی بووم

پیاسەم ئەکرد..

سنەوبەرێك باریکەلە

بەرەو ڕووم هات

ئەڕۆیشت و تۆپێکیش لەبەر قاچیا بوو

بە نووکی پێ هێواش هێواش تێی هەڵئەدا بۆ سەرەوە

هێندەی بگاتە بەر سنگی و دیسانەوە

ئەهاتەوە سەرپشتی پێ و

جارێ دە جار و سەد کەڕەت

تۆپ نەئەکەوت!

دارسنەوبەر هەر ئەهات و چاوێکیانی لەسەر من و

چاوەکەی تری هەر لەسەر تۆپەکە بوو!

گەیشتە لام

وتی: ڕۆژباش

ـ ژیانت باش

زیاتر لێم هاتە پێشەوە و دەستێکی خستە سەر شانم و

تۆپەکەی نا بە دڵیەوە!

ـ ببوورە.. نامناسیتەوە؟!

ـ سنەوبەر نیت؟!

ـ سنەوبەر یاریزان بووە؟!

لەم ساتەدا شووتێکی لێدا ئاسمانی و

تۆپ بە حەواوە ڕاوەستا و نەهاتەوە و

لەسەر پارکی ئازادیمان بوو بە مانگێکی نیگا شین.

ئەمجارەیان دارسنەوبەر تێپەڕیبوو

کە ئاوڕی لێدامەوە و، لەو دوورەوە هاواریکرد:

ـ من (یاسین)م

شێرکۆ

یاسین

سلێمانی

شوباتی 2003

## پێکەوە

ئەو وەختەی شووشە
شەرابێ شکا
دڵی هێشوویەك
بە دار مێوەوە
لە تاودا.. وەستا!
من چاوم لێبوو
کەمانچەیەك مرد
وەختێ لە گەرووی
باڵندەیەکدا
نەغمەیەك کوژرا!

# پەرتبوون

خەیاڵم ڕایکرد
بەرەو بنارێ
لە ڕێگە خۆیدا
لە دار هەنارێ
خەیاڵم پەرتبوو.. خەیاڵم وەریی.
هەناریش پەرتبوو.. هەناریش وەریی.
هەر دوو پێکەوە بوون بەو دەنکانەی
هەڵبەزینەوە و دابەزینەوە و
پەڕینە کەل و
بوونە دوا ڕەنگی
دەمە و ئێوارێ!

# باخەڵ

چوومە باخەڵی کۆنسێرتێکەوە
لە خەوما بووم بە: پەڕێکی دەم با.
چوومە باخەڵی چیرۆکێکەوە
لە خەوما بووم بە: شەپۆلی زەریا.
چوومە باخەڵی تابلۆیەکەوە
لە خەوما بووم بە: زەردەی سەر چیا.
چوومە باخەڵی خۆشەویستەوە و
لە خەوما بووم بە
شای عاشقانی
هەر هەموو دنیا!

# له دەشتێكدا

عاشقێ بەناو دەشتێكدا ئەڕۆی

دەشت ڕووت و قووت و لەش خۆڵاویی بوو

عاشق ئەڕۆیشت و عاشق بەردەوام

هەر لەبەر خۆوە ورتە ورتی بوو

لەو ورتە ورتە و لە ناخافڵدا

دوو وشەی لێكەوت

یەكێكیان زەرد و ئەویتر سپیی

عاشق تێپەڕی

عاشق ناكام بوو

عاشق ئاوابوو

هەر لەو جێیەدا و

ساڵ وەرنەگەڕا

چڵە نێرگزێ بە تاقی تەنیا

لە قاقڕەوە

سەری دەرهێنا!

# مۆتەکە

ڕائەکشێم
پەتوویەك ئەدەم بە شەوما
لە پەتوودا وێنەی پڵنگێکی تیایە
شەو درێژ و.. پڵنگ درێژ
تل ئەدەم و ئەویش لەگەڵما تل ئەدا.
لە ژێرەوە سەرنج ئەدەم
کەڵبەکانی لەسەر ملمن.
ترسی خەت خەت لێم ئەنیشێ
هەر دوو چاوم ئەنوقێنم
هەتا خەوم لێئەکەوێ..
"لە دەشتێکدام
خۆم ئەبینم بووم بە مامز
پڵنگەکە بە دیم ئەکا و
دوام ئەکەوێ
ڕائەکەم و ڕائەکەم و پڵنگ هەردێ
دێت و دێت و هەناسەمان تێکەڵ ئەبێ

دێت و دێت و لە پشتەوە..

بستێکی ماوە بمگرێ..

لە پڕێکدا

دائەچڵەکم

ئارەقێکی سارد دەرئەدەم..

پەتوو لەسەر خۆم لائەدەم

ماڵەوەیە؟!

ورد ئەبمەوە.

پڵنگ لەبەر قاچەکانما

تێکشکاوە و گرمۆڵەیە!

# چیرۆکی پەڕەکاغەزێ

من نەمزانی
کاغەز بەوە نیگەران و
کاغەز بەوە وەڕس ئەبێ و
یاخیی ئەبێ..
تۆ لەسەری بنووسیت و
بەلاَم ئاکام خەیالَی تۆ
شتێکی تازەی پێ نەبێ
کە پێی بلَێ!
من نەمزانی
هەتا ئەمڕۆ
وەختێ لەگەلّ بادا ڕێکەوت
ئەو ساتەی من لە مالّ نابم
هەلّیبگرێ و
بیفڕێنێ و
لە بری منی بێ خەیالّ
بیداتە دەست یەکەم هەتاو

تا بە قەڵەمی گورگەزێ

هەر بە تەڕی

دوو خونچەی لەسەر بنووسێ!

# كاريكاتۆر و دیکتاتۆر

سبەینێ، پێکەوە
کورسییەك
شمشێرێ
ڤاتێ جل
شەش دەستی قوربانیی ئەیانبا و
ئەخرێنە سێ سووچی ژوورێکی بێداری
مۆزەوە.
کورسیەکە
تا ئێستە
لە شمشێر بەولاوە
زیاتری نەدیوە، هیچی تر، کەسی تر
تاوەکوو خواوەندیش زاتبکا و بوێرێ
لە سەری دانیشێ!
شمشێریش بەردەوام بەردەوام
سێ دەیەی خەزانە
مشتاومشت لە ئاوی ناو ڕۆحمان

دەردێنێ و ئەینۆشێ.

بەردەوام، بەردەوام، بەردەوام

سێ دەیەی دووکەڵ و خەزانە

لە بەرگی هەڵبەست و هەناری

کوژراوی گوێ دیجلە و فوراتە

ئەیبات و ئەیپۆشێ!

سبەینێ

قاتەکە ئەبینین لە کوچە و شەقامدا

پڕ بەبەر (بەزین)ە

شمشێریش ئەبینین لە تاودا وا هەڵدێ

پێش کلکی عوجاج و پێش کەپووی

ڕەشەبا ئەکەوێ!

سبەینێ.. سبەینێ

هەموومان کورسیەکەیش ئەبینین

وایلێدێ

سەگێکی هەڵەبجە ئەتوانێ لە سەری بگەوزێ و

سەگێکی (نەجەف)یش بە نەخش و نیگار و

بە ئارم و دروشمیا.. هەڵمیزێ!!

# کیف

کیفێ هەیە

کیفی شێرێ

پڕە لە پەیڤی کوژاوە.

پڕە لە ژمارەی تەلەفۆنی کوژراو.

پڕە لە سوتووی ناونیشان

لە زریکەی ئاو و گڵ و

پڕە لە پەنجەی منداڵان.

کیفێ هەیە

کیفی شێرێ

هەر ئەوەندەی باسکی خاوەنی درێژە و

بەڵام چەند ڕووباری خنکاو..

چەند شەقامی لاق قرتاو و

چەند پەنجەرەی کوێرکراوی لەناودایە..

مەگەر ڕۆژێ شێر بگیرێ..

شێر بکوژرێ.

یاخود هەڵبێ

ئەوسا ئیتر نەهێنیەکان

لە دەمی کیفی مەرگەوە

هەڵڕژێن و

بە لووزەوێ

بێنە دەرێ!

# گەڕانەوەی باوکم

ئێوارەی شەشی ئەیلولی هەموو ساڵێ
باوکم لەگەڵ سێبەری پەڵە خوێنێکدا
بە سەیواندا دائەگەڕێ و
ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ.
هەر وەکوو خۆی چۆن بووە وا
ڤاتێکی چرچ و چوواوەی لەبەردایە
وەك بە قەرز
لە گەردەلوولی دەشتێکی وەرگرتبێ.
بۆینباخێکی هەرگیز نەکراوەی لە ملدایە
هەر وەکوو خودی بێزاریی بۆی بەستبێ!
هەر وەکوو خۆی چۆن بووە وا
چارەکێك و سەلکێ تووری لە گیرفاندا و
ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ!
بە یەکەوە خۆی و سێبەری پەڵە خوێن
لەسەر کورسیەك لە حەوشە دائەنیشن

من هەڵئەسم
تەپڵەکێك و پەرداخێك و چەقۆیەکی بۆ ئەهێنم.
بە پەنجەی شەو سەری چارەك هەڵئەپچڕێ.
ئەمجارەیان من ئەمەوێ هەستم بۆ ئاو
سێبەری پەڵە خوێنەکە دەستم ئەگرێ
ئەو لە جێی من چۆڕێ شیعری بۆ تێئەکا و
ئەوسا ئیتر باوکم قوم قوم
لەگەڵ هەناسەکانی خەیامدا و
لە دەنگی عەلی مەرداندا
خەمی سپیی ئەخواتەوە.
من بێدەنگم
پەڵە خوێنەکە پێی ئەڵێ:
چیتە بێکەس تۆ هاتویتەوە بۆ ماڵێ
کەچی بە قەد خەمی سەر تانجەرۆ پەستی!
باوکم دەستێك ڕووە و لای من
ڕائەکێشێ و ئەوسا ئەڵێ:
لەم بپرسە!
من چاوەڕێم ئەکرد زیاتر
لەناو پرسیاردا داگیرسێ و زیاتر زیاتر
لەناو ترسا گڤەی بێت و
زۆرتر.. زۆرتر
بچێ بە گژ مێژووی دز و مێژووی باو دا و

توندتر.. توندتر یەخەی یەقینەکان بگرێ و

ببێ بە ڕەخنەی ڕەشەبا و

خەمێ نەبێ تیا هەڵنەکا

لەم بپرسە!!

سەرەتای مارتی

2003

# دوو پەیکەر

یەکەم پەیکەر
پیاوێ لە شیش و کۆنکرێت.
دووەم پەیکەر
ژنێ لە گوڵ و قەڵبەزە.
(پیاوە سێ جار
سکی ژنەی سووتاندبوو!)
وەختێ کە بوومەلەرزە هات
یەکەم پەیکەر درزی بردوو
جەستەی تەقی و
پارچەپارچە بەلاداهات
بەڵام نە گوڵ
کەوتە خوارێ و
نە قەڵبەزەش هیچی لێهات!

# کورسی تەنیایی

تەنیایی منی کردووە، بە کورسیی خۆی
کورسیەك لە: تەختەو پووشووی
چاوەڕوانیی!
کورسیەك لە: ئەوقبوونی کاتژمێری
بەردەم عومری سەرەولێژ و
یەك لە دوای یەك
خلبوونەوەی
چرکەکانی!
تەنیایی منی کردووە، بە کورسیی خۆی.
بەیانیان دەستم ئەداتێ و هەڵمئەگرێ و
بەدوای خۆیدا
بەخشەخش
لەگەڵ مەراقیا ئەمگێڕێ
لە گۆشەیەکی شێداری یادگارداو
لەناو ڕەنگێکی نسرما بەرامبەری
خەیاڵێکی پەرت دامئەنێ!

له دووكه‌ڵما

وه‌ك بیره‌وه‌ری سووتاوی

سنه‌وبه‌رێ دائه‌نیشێ

چاو ئه‌بڕێته خاڵێكی دوور

یه‌كدوو قاوه

له فنجانی بێزاریدا ئه‌خواته‌وه

ئیتر بۆ خۆی له بێهوده‌یی ناو ژوورما

درێژ ئه‌بێ و

هێنده نابا

چون سێبه‌رێكی قه‌تیس بووی

ناو ده‌راڵێ

قووڵ قووڵ خه‌وی لێ ئه‌كه‌وێ!

ته‌نیایی منی كردووه

به كورسیی خۆی.

وه‌ختێ له سه‌رم هه‌ڵئه‌سێ

چووینه‌ته ناو یه‌كتره‌وه:

ته‌نیایی بووه به من و، ئه‌و به كورسیی و

ئه‌مجاره‌یان..

ئیتر من ده‌ستی ئه‌ده‌مێ و

به‌رامبه‌ر خاڵی كۆتایی دائه‌نێم و

به له‌رزه له‌رز پیریم ئه‌چێو

وه‌ك دوا زه‌رده

# ئەو هێلکەیەی وڵاتێکی لەناودایە!

له هێلانه کۆترێکدا
یەك هێلکە ماوە جێ مابێ و نە دزرابێ!
ئەو هێلکەیە وڵاتێکی لەناودایە!
ئەو هێلکەیە لەناو توێکڵەکەی خۆیەوە
شپرزەیەکە زەردباو و سەرنج ئەدا و
چاوەڕوانە:
له ئاسمانێکی تازەوە
خۆشەویستی هەڵفڕێت و
خۆشەویستیی بگمێنێ و
خۆشەویستیی بێت و لەسەری کڕکەوێ و
له ژێر دووباڵی ئارامدا
ئایندەی سپیی
هەڵبێنێ!

2003/9/20

# دنیای منداڵیی

ئەچمەوە ناو

قۆزاخەی سپیی منداڵیی

بە دەستێ خەون ئەچنم و

دەستەکەی تریش جێدێڵم

لەناو بەرۆکی دایکمدا

بۆ نسێیەکی خەماویی

ئەچمەوە ناو

بینینەکانی منداڵیی

بە چاوێ ڕەنگ ئەخوێنمەوە و

چاوەکەی تریش جێدێڵم

لەناو چاوانی دایکمدا

بۆ گریانێکی ئەسپایی.

ئەچمەوە ناو

گوێ بیستەکانی منداڵیی

بە گوێچکەیەك دەنگی قوربانیی ئەبیسم و

گوێکەی تریشم جێدێڵم

لەناو غوربەتی وڵاتدا

بۆ گوێگرتن لە تەنهایی!

ئەچمەوە ناو

پرسیارەکانی منداڵیی

بە پرسیارێك دابونەریت شێت ئەکەم و

پرسیاری دیکەیش جێدێڵم

لەناو ژوورەکەی باوکمدا

بۆ چەند شۆڕشێکی دوایی!

کۆتایی 2003

# بەراورد

**سەرنج لە شۆڕەبی ئەدەم**
**ئەڵێی دایکمە و لە حەوشەدا**
**بەسەر خەمێکی پایزدا**
**دانەویوە!**
**کە سەیری شاخێکیش ئەکەم**
**ئەڵێی باوکمە و**
**چۆتە سەرشانی ئازادیی و**
**لە زوڵم و زۆر ڕاپەڕیوە!**

کۆتایی 2003

# له وێنەیەکدا

له شەوێکی کڕێوەدا
له ژوورێکی بچکۆلەدا
مندالێ وێنەی ئەکێشا:
خانەڤینی کرد بە تەیرێ
شابالٚ ڕەش و بەرسنگ سپیی
وایکردبوو
لەنێو بالٚدا نەوت هەلٚقولێ و
له سنگیشدا کانیەکانی خۆشەویستیی
"مندالٚەکە بەسەر وێنەکەوە
خەوی لێکەوت"
خوشکەکەی هات
خۆی دانەواند
خۆی کرد بەناو وێنەکەدا
له قەراغی کانیەکدا گولێ چنی و
له نەوتەکەیش سەتلۆکەیەکی هەلٚهێنجاو
بردی بۆ ژووری شاعیرێ

لەوبەرەوە، لەو ساتەدا شاعیرەکە

وشەکانی لە جەهەننەمی ئەنفالدا ئەسووتان و

کەچی بۆ خۆی لە سەرمادا هەڵئەلەرزی!

# گۆڕانەکان!

دوای نۆی چوار بوو
دارسێوێکی شاعیر بووم و
شێت و شەیدا بەناو کەرکووکدا ئەگەڕام
لە پڕێکدا لەسەر ماڵێکی قەڵاوە
کچێکی جوان
یەك شەربەی پڕ پێکەنینی کرد بە سەرماو!
تا سەر ئێسقان
بە ئاوی عەشق
تەڕی کردم!
وەختێ کە چوومە ئەولاوە
تەماشام کرد لەسەرشانم
زەردەگوڵی قۆریاتی تورکمانی و
لەسەر سنگم یاسەمینێکی ئاشووری و
لەسەر دەسم شەوبۆی غەزالیی ئەرسکان
کە گەیشتمە بەر ئاوێنەکەی ماڵەوەیش
وەختێ تەماشای خۆمم کرد

دارسێو نیم و شاعیر نیم و گۆڕابووم و

ئەمجارەیان

من بووبووم بە:

عەلی مەردان!

# جەبار جەباری

له سەردەمی کاسکێتەکەی گیڤارادا
وەختێ لەگەڵ دارهەناری شیعرەکانی
نیرۆدادا
ئەگەیشتینه دڵی کەرکووك
هەر له ڕێوه به خۆمان و زەمیلەیەك پەپوولەوه
سەرمان ئەدا له ماڵی جەبار جەباری
ئەو.. ئەوساکه
هەر ستوونێکی ڕۆژنامه.. ژوورەکەی بوو
هەر درەختێ لەناو ماڵدا هاودەمی بوو
یەك کتێبخانەی بچکۆله دەزگیرانی و
گۆزەیەك ئاو.. خەمی تەڕی و
پاندانێکیش.. چراکەی بوو.
ئەمڕۆ که هاتم بۆ ئێره
بەر له ئێوه و پێش هەموو کەس
چوومەوه بۆ لای جەباری
که (با) دەرگای لێکردمەوه..
تەماشام کرد:

ستوون بووبوو بە تەلارێ لە کریستاڵ

ڕۆژنامە بووبوو بە ئاسمان

هاودەم بووبوو بە دارستان

کتێبخانە بچکۆلەکە بووبوو بە باخچەی منداڵان

گۆزە ئاو بووبوو بە سیروان

پاندانەکەیش..

بووبوو بە بورجی تریفە و

کوردستانیش بە دەزگیران!

# نەریتە خۆشەویستەکان!

هەر هەورێ بێ، بە ئاسمانی هەڵەبجەدا
کە تێپەڕی
بۆتە نەریت، ئەبێ بۆ ساتێ ڕاوەستێ و
بێتە خوارێ و تۆزێ بگری و ئینجا بڕوا..
کە مانگ لەسەر ئەویش هەڵهات، قەدەرێکە
لەو شەوەدا هیلالێکی بێوەژنە.
هەر (با)یەکیش بەسەر ئەودا و بەلای ئەودا
گوزەر بکا..
بۆتە نەریت، لائەدات و دائەنەوێ و
پرچەکانی ماچ ئەکات و ئینجا ئەڕوات..
هەر باڵدارێك وەختێ بەسەر ئەودا فڕی
نەریتێکە، لە ئاسۆدا بە باڵ ئەنووسێ
شانزەی سێ و ئینجا ئەڕوات..
هەرکاتێکیش هۆنراوەی ئەز
پێی خستە ناو خەمەکانی هەڵەبجەوە و
چووە ئەوێ

**ئیتر هەرگیز جارێکی دی نایەتەوە بۆ لای من و**

**لەوێ لە باوەش کێلێکدا ڕائەکشێ و**

**بۆ خۆی ئەنوێ!**

# هۆشم کلیله و لێم ئەکەوێ!

هەموو جارێ شان بە شان و هەر لەگەڵ هاتنی تۆدا..
هەورێك خۆی ئەکا بە ڕۆحما و پڕە لە تریفەی تەڕ و
پڕە لە لاسکەگیای بەردەم پرژەی ئاوێکی چاوشین و
پڕە لەو وردە ماسییانەی کە خەیاڵم لەگەڵ خۆیدا
شەپۆل شەپۆل بەرەو دەریاچەی قەسیدە و خەو ئەیانبا!
هەموو جارێ هەر لەگەڵ هاتنی تۆدا..
سەفەرێکی نارنجیی دێت.. کە من هێشتا نەمکردووە
باخچەیەك دێت.. کە من هێشتا نەمنووسیوە
خەوێکی سەوز.. کە من هێشتا هەر نەمدیوە!
هەموو جارێ کە دێم بۆلات
لەماڵەوە ئەم عومرەی خۆم
وەك بلوزێکی کۆنە ساڵ
لە کەنتۆردا بەجێدێڵم و
لە پەلکی دارسێوی عومری تۆ، ئەپۆشم و
ئەوسا ئیتر دێمە دەرێ!..
هەموو جارێ کە دێم بۆ لات

وەك کلیل بێ لە ڕێ هۆشم لێ ئەکەوێ!
هەموو جارێ کە دێم بۆ لات
من نازانم ئەوە ئەندێشەی پەرت پەرتی
خولیاکانمە؟ یان پەڕە پەڕەی کاغەزی دوا مسوەدەی
شیعرەکانمە بەرەو لای تۆ با ئەیانبا..
من نازانم هەموو جارێ کە دێم بۆ لات
نیگای خۆمە پێی ئەبینم؟!
یان هەر چاوەکانی تۆیە.. هاتوونەتە ناو سەرمەوە و
وان لەگەڵما؟!

# دوو زمان

جیاوازی من و زۆر شاعیر هەر ئەوەیە:
ئەوان زۆریان سەخت و گران
بە زمانێکی بوغرنجی ناو باوبۆران
بۆ عەشقی خۆیان ئەنووسن
بۆیە عەشقیش لەوانەوە چەند نزیکبێ
تێیاننناگا!
جیاوازی من و زۆر شاعیر هەر ئەوەیە:
بە زمانێ سادە وەکو ئاوی ڕەوان
بۆ عەشقەکەی خۆم ئەنووسم
بۆیە عەشقیش ئەگەر لەوپەڕی دنیایش بێ
لە من ئەگا!

کانوونی دووەمی 2004
سلێمانی

# راكشان

له لامی وەختێ مانگەشەو بە ئەسپایی
ڕائەکشێ لەسەر "گۆیژە"
ساتێ کە منیش ڕاکشام بۆ خەوبینین
بە هەردووکتان
هێدی هێدی دامئەپۆشن
تۆ بەو سەرپۆشەی پەپوولە
چنیوێتی و
مانگیش بە قژی تریفە!

مارتی/ 2004

# بولبولێکی نەقاش

ڕەز بولبولێکی نەقاشی تەواو مەستکرد.
کە هەڵفڕی، لارە لارە، خوار هەڵفڕی.
لە خوارەوە
دار هەنجیرێکی بەدیکرد
بۆ وچانێ چووە سەری!.
لەو ساتەدا هەستیکرد ئێجگار تەنیایە
ئەوسا ویستی لەسەر گەڵای پانی بەردەم
هەر بەخەیاڵ
وێنەی یارەکەی بکێشێ!.
بەڵام قەڵەمی پێنەبوو.
لەو بەرەوە
گوڵی لقی دار هەنارێ
قەڵەمێکی سووری دایە.
وردە وردە
وێنەی کێشاو
وێنە جوڵاو.. وێنە کەوتە جووکە و

وێنە چووە تەنیشتیەوەو

کە ئەم فڕی.. وێنەیش فڕی و

بەیەکەوە ساتەوەختی خۆرئاوابوون

لە ئاسمانی شەرابیدا

جووتێ بولبولی

سەرخۆش بوون!.

# سڵاو

"با" سڵاویکرد لە دارێ
دار هەر بەسەر، سڵاوی پێگەیاندەوە.
مەل سڵاویکرد لە ئاوێ، لەو بەرەوە
ئاو یەك بزەی بۆ ناردەوە
ئاو سڵاویکرد لە گوڵێ
گوڵ یەك لەنجەی بۆ ئەو کردوو
وەڵامی خۆی وا دایەوە.
بەڵام وەختێ کچێکی جوان
سڵاویکرد لە هەموویان.
دار بەرەو پیری ڕایکردوو
مەل لەسەرشانی نیشتەوەو
ئاو باوەشی پێداکردوو
گوڵەکەیش خۆیدا لە قژی!

# تیرۆریست

لەسەر بانگهێشتی "یانەی مەل"
بە شەقام و بە کۆڵانی لێژی ئاودا
مراوییەکی جل سپی کەمانچە ژەن
زوو شەبەقیی، سەفەریکرد
بۆ دوورگەی عەشق
تا لە شایی
دوو نەورەسدا
ئامادەبێ و
دوو سێ بەشی
سیمفۆنیاکەی
"گۆمی مراوی"ش بژەنێ!.
ئەم گەیشت و
لە پاش قەیرێ
لە ئاسۆیەکی تەڵخەوە، داڵێکی ڕەش
بەدیارکەوت و هاتە پێشێ و
یەکدوو جارێ بەسەر کۆڕی زەماوەندا

خولیخواردوو

له پڕێکدا

لەژێر پەڕی چڕی سنگدا

دەمانچەیەکی دەرهێناو

لەبەرەو خوار، کەوتە تەقەو

ئاهەنگەکەی

له نەورەسی دڵداران و

دوورگە تێکدا!.

# چوارچێوە

چوارچێوەیەکی بێ وێنە بەرامبەرمە و
چەندین وێنەیش
لەسەر مێزم چاوەڕوانن!
یەك چوارچێوەو ڕیزێ وێنەو
هەر هەموویشیان خۆشەویستن!.
وێنەی گزنگی منداڵیم.
وێنەی خۆرنشینی دایکم.
وێنەی هاوارێکی باوکم.
وێنەی شیعری هەرزەکاریم.
وێنەی یەکەم ماچی مانگی
هەنگوینی خۆم و ژنەکەم.
وێنەی مەستیم
لەبەردەم بورجی ئیڤڵدا.
وێنەی.. وێنەی.. وێنەی
یەك هێلانەو پۆلێ وێنە
دڕدۆنگیەك لەناو دڵداو

تیامام کامیان هەڵبژێرم!

چاویلکەکەم خستە لاوە..

ئەمجارەیان چوارچێوە خۆی

لەسەر دیوار هاتە خوارێ و

بێدوودڵی دەستیدایە وێنەیەکیان

هەڵیگرت و

خستیە ناو ڕۆحی خۆیەوە:

وێنەی خۆرنشینی دایکم!.

# تاکێ گۆرەوی

تاکێ گۆرەوی مایەوەو
تاکەکەی تر گژەبای پاییز ڕایفڕان.
تەنافەکە بە دەنگێکی باریك وتی:
"ئەمە کۆتایی ئێوە بوو..
لە ئێستەوە، نە ئەو هیچ کەسێ ئەیەوێ و
نە تۆیش کە هێشتاکە ماوی!
ئێوە بە جووت نەبێ ناژین."
بەڵام ئەمە قەت وانەبوو
لە قەراغ شار
مێرد منداڵێ تاکە گۆرەوی دۆزیەوەو
لەسەر تاشەبەردێ دارشەقەکەی داناو
گۆرەویەکەی لە پێکردوو
تاقە قاچیش
لە دڵەوە سوپاسیکرد!

# ونبوون

من لە باکووری غەریبیم.

بزربووم و وێڵ و بێواز

لەسەر کورسییەکی بەدبەخت

بەرامبەری ئاوێ گرینۆك دانیشتووم.

جۆگەیەکی گرینۆك، گڕۆز، گرینۆك

ساتێ چییە بێدەنگ نابێ و داناسەکنێ!

پێئەچێ ڕووباری دایکی

لە شەوێکی باوبۆراندا

ئەمی تەنیا جێهێشتبێ و

خۆیشی ڕەدووی

کەڵەزەریایەك کەوتبێ!.

جۆگەیەکی گرینۆك، گڕۆز، گرینۆك

من بزرو، ئەو گرینۆك!

ئەز نازانم ئەم بە کێ ژێر ئەبێتەوە

لە دوای دایکی و؟!

منیش لە دوای کوردستانم

ئەبێ کێ بمدۆزێتەوە؟!

# گوێچکە

هێشتا دنیا لە خەو دابوو

ئەو لە ژووریٚ و

ئەم لەسەر لقی درەختیٚ

"تەیریٚ گوێیگرت لە بیتهۆڤن"

کە هەڵفڕی

نۆتەکانی هەموو خستە بن باڵەوەو

دوور بردنی!

لەسەر ئاوێکی ڕاوەستاو

پێنج شەش نۆتەی هەڵدایە خوار.

ئاو بزووت و

هاژەی تازەو

نەبیستراوی دا بە ڕووبار!.

لەسەر دارستانیٚ غەمبار

مشتیٚ نەغمەی ڕژانە خوار.

دارستان سەری هەڵبڕی و

کەوتنە سەما

پژوپۆی دار!.

لەسەر ماڵی چیرۆکنووسێ

سەبەتەیەك گمەی پیانۆو

ڕێژنەیەك لە بارانی ئۆپەرێتی

هەڵڕشتە خوار

هەتا زووتر

چی پەخشانە و چی چیرۆکە

باڵلێکدەن و

ببنە شیعر!

لەسەر چیای دوای بۆردومان

چیایەك کەڕ

دووسێ شەپۆلی نەسرەوتی

سیمفۆنیای ژمارە نۆی

ڕژانە خوار

ئیتر چیا ڕەوەزێکی

بوو بە چەلۆو

لاشانێکی

بوو بە کەمان!

گوێچکەی درەختە کەڕەکان

کرانەوە!

گوێی دەربەند و گوێی تاشە بەرد

گوێی سێبەر و شەختەبەندو

سەر شەقام و بەر پەنجەرەو

نهۆمەکان... کرانەوە!

تەنها گوێیەك

کە ژانی ڕۆحی خۆی نەبیست

تەنها زێیەك

کە گوێی لە هاژەی خۆی نەبوو

گوێچکەکانی

بیتهۆڤن.. بوون!

# کچە کڵاوچن

لەو گەڕەکە پێخاوس و جلدڕاوەی
ڕۆژهەڵاتی ئەم شارەدا!.
لەو ساڵەدا
کە "با" سوور و بەفر سوور و
خاك کوژراوو
وەرزەکانمان بێوەژن بوون.
کچە کڵاوچنی ماڵێ
لەبەر دەرگاو، لە هەیوان و، لە ژوورەوە
کڵاو هاودەمی چاوانی و
کڵاو هاودەردی پەنجەی بوو.
پارووی دەمی
لەناو دەزووی چنیندا بوو.
خەمی لەناو گلۆڵەداو
خەیاڵیشی پەڕاگەندەی
کۆچی دوور بوو!.

كچە کڵاوچنی گەڕەك

ئیستە بۆ "سەرێ" خەریکە

کە جوانترین سەرە لای ئەو.

سەری کوڕێ.. سەری عەشقێ

کە شەو نییە لەناو خەوێکی شینباودا

سەری و سەری، بە جووت هەردوو

سەرنەکەنە سەر یەك سەرین!.

بەڵام کوڕەی گیراوی ناو

شەوەزەنگی کۆنکرێتی "ئەبو غرێب"

کەی بەر ئەبێ؟!

کچە کڵاوچنی گەڕەك

یەکەمجارە ئەو حەز بکات

هەر بچنێ و هەر بچنێ و

گلۆڵەکان تەواو بن و

بەڵام کڵاو تەواو نەبێ!

سەری مانگ بوو. کچە کڵاوچنی دڵدار

لەگەڵ دوو ماچی زۆر سەوزا

کڵاوەکەی نارد بۆ زیندان

بەڵام وەختێ ماچ گەیشت و

کڵاو گەیشت

سەر بە پەتی سێدارەوە

ئەیجریوان!

# زویربوون

له دەشتایی پەخشانێکدا
تەمم شوبهاند بە خەمی خۆم
خەم تەرەبوو، وتی: هەرگیز لەمن ناچێ!
تۆ غەدرئەکەی
ئەز هەمیشە لەگەڵتام و
ئەو ناوبەناو پەیدا ئەبێ!.
لەگوێ ڕووباری ڕۆمانێ
تەنیاییم شوبهاند بە پاییز
تەنیاییشم لێ زویر بوو
وتی پاییز ساڵی جارێ تۆ ئەبینێ و
هەرچی منم
بیست و چوار سەعات لەلاتم!
لەناو ژووری شانۆیەکدا
چرپاکەی خۆم
شوبهاند بە ڕەنگی بێزاریی
بێزارییشم لێ زویر بوو

وتی ئاخر غەدر مەکە!
ڕێکئەکەوێ تۆ هەندێ جار
لەسەفەری و لەسەر چرپا پاڵناکەوی و
هەرچی منم لەسەفەربی و لە هەر شوێنێ و
بە پێوەبی و یان پاڵکەوی
هەر لە گەڵتم!.
لە مەزرایەکی شیعریشدا
سەمەلێکی گوڵەگەنمم
شوبهاند بە قەڵەمەکەی خۆم!
ئەمجارەیان قەڵەمەکەم لێ تەرەبوو
وتی ئاخر تۆزێ وەفا!
لە ساڵێکدا سەمەل یەکجار پەنجەی تۆیەو
بەڵام ئاخر لەکەیەوە من پەنجەتم!
ئەمەی وت و بە تووڕەیی
لەڕەشنووسم چووە دەرێ و
بەجێیهێشتم!
کە قەڵەم ڕۆیشت
من نە تەم و
نە پاییز و
نە چرپاکەو
نە سەمەل و
نە یەك وشەم

لەگەڵ نەما!

ئەی نابینن

چەند دەمێکە

هیچ نانووسم!

# کۆتایی کورتە چیرۆکێکی سپیی

چرایەك بۆی گێڕامەوە:
بەر لە چەند ساڵ
کورتە چیرۆکێکی سپی
لە سەردابێکی نسرمی چاپخانەدا
بەر لەوەی دابەشبکرێت و
جادە بیگرێ بە دەستەوەو
پەنجەرە بیخوێنێتەوە.
بەیانییەك
وردە وردە لە پەناوە
هەر لەسەر سك خۆی خشاندوو
لە دۆسییەی هاتە دەرێ.
تۆزێ بە پێوە ڕاوەستاو
هەناسەیەکی هەڵکێشاو
چاوی بە چوار دەورا گێڕاو
لە پڕێکدا دەستی بردوو
قلّپ.. قلّپ

سەتلۆکەیەك مەرەکەبی کرد بە خۆیدا!
نوقم.. نوقم
هەتاکوو دوا وشەی خنکا.
چونکە ئەیزانی دوای ڕۆژێ
بەخوایشت بێ یاخود بە زۆر
ئەبێ بچێ و
لە ئاهەنگی
لەدایکبوونی شمشێری
دیکتاتۆرێکدا هەڵپەڕێ!

# دیاریی

له یادی جه‌ژنی زایینی
دار هه‌ناری‌ێکی "هیران"دا
هه‌ورێ، به‌پێ، له "نازەنین"ه‌وه هات و
له به‌رده‌می دارهه‌ناردا
کۆڵه‌پشتی دیاریی دانا
"بوخچه‌یه‌ك بارانی تازه"
له "شه‌قڵاوه" وه به‌سواری بایه‌کی شین
هه‌ڵاڵه‌ی قژ سوور گه‌یشت و له به‌رده‌می دارهه‌ناردا
ئه‌ویش دیارییه‌که‌ی خۆی دانا
"شووشه‌یه‌ك بۆنی ژنانه".
له "سه‌فین"ه‌وه ته‌یرێکی عاشق هات و
له به‌رده‌می دار هه‌ناردا
ئه‌میش دیارییه‌که‌ی خۆی دانا
"چه‌پکێ قاسپه!"
له کۆیه‌وه، کارمامزێکی قاوه‌یی، ته‌وێڵ سپی
گه‌یشته لای دار هه‌نارو

ئەویش دیارییەکەی خۆی دانا

"پڕ پیاڵەیەك میسکی تازە"

لە "ئاسۆس"ەوەو لە پاشکۆی سروەیەکدا

پەپوولەیەکی ڕەش هات و لە بەردەمی دار هەناردا

ئەویش دیارییەکەی خۆی دانا

"زەرفێکی پڕ لە دوا بزەو زەردەخەنەی

کاڵی، مامۆستا "سنەوبەر".

دوای هەموویان، کە شەو داهات

هەر لەناو هیران خۆیەوە

لە ماڵێکی سپیەوە

چرا بە دەست

زۆر بە کاوخۆ

"تەحسین کاوانی" خۆی هات و

لە بەردەمی دارهەناردا

ئەمیش دیارییەکەی خۆی دانا

"مەتارەکەی لاقەدی خۆی

کە پڕپڕبوو لە مانگەشەو و خەرمانەی

شیعری صافی"

# چیرۆکی مۆمدانێ

مۆمدانێ بوو.. پیرۆزەیی
لە ژووری سپیی کچێکی چاوڕەشدا بوو.
لە چاوەڕوانی مۆمێکدا
قژ بە شەوبۆ، لەسەر ڕەفەی تەنیشتی کچ
ڕوو لە دەرگا ڕاوەستابوو.
مۆمدان وەکوو کچە تەنیاو
مۆمدان وەکوو کچە عاشق
شەو هات و ڕۆی
مۆم نەهات و مۆم دیارنەبوو.
ئێوارەیەك بە شەلەشەل و کەساسی
هەواڵێ هات!
"مۆم لە کەمینی شەوێکدا
بە دەستی بەردێ کوژرا بوو!"
هەمان وەرزیش
ماڵەیش کچیان نەدا بە عەشق!.
شەوێك زستان

لە دەرەوە، بای بەفر کەوتە هات و چۆو

لە ژوورەوەیش

کچ ئاگری لە خۆی بەرداو

مۆمدانیش لەسەر ڕەفەوە

خۆی فڕێدایە باوەشی و

بەیەکەوە

هەردوو سووتان!

# هەرمێیەك

لە ساڵەکەی قیامەتی هەشتا و هەشتا

لە بەغدادا

لە نێو میوەدانی جوانی ئەو ماڵەدا

لە نێو هەموو میوەکاندا

هەرمێیەکیان

لە هەموویان دڵتەنگترو

چاو تەڕ ترو

بێزار تر بوو

چونکە بە زۆر چوونە سەری و

بە پرچەوە ڕنیبوویان

چونکە بەزۆر لە باخچەکەی

"نالی"یەوە هێنابوویان!

# لە ئێوارەیەکدا

بەر لەم عەشقە

هەر یەکەمان جۆگەی ژیانێ بووین جیاواز

کەنارمان جیاو شەپۆلمان جیاو

هاژەمان جیابوو.

لە پڕێکدا ئێوارەیەك خۆشەویستیی

لە دەشتێکدا

لە ڕاستەوە دەستی من و

لە چەپەوە دەستی تۆی گرت

ڕایکێشاین و هەردووکمانی دا بە یەکداو

لووزەوێك و

ڕژاینە ناویەکترەوە

لەو دەمەوە

نە من کەناری خۆم هەیەو نە تۆ.

نە من شەپۆلی خۆم هەیە و نە تۆ.

نە من هاژەی خۆمم هەیەو نە تۆ.

نە من ناوی خۆم و نە تۆ

ئەوەی ئێستاکە هەمانە

تێکەڵبوونەو توانەوەیەو کەف چڕێنی

بەردەوامی دوو ئاوانە!.

# سەعات

ئەو سەعاتەی لە دەستیا بوو

سەعاتی قوربانیەکەی بوو!

سەعات، شپرزەبوو، سەعات.

سەعات، داخ لەدڵ بوو، سەعات.

ڕۆژێکی تر

لەناو ژوورێکی تووڕەدا

ئەم گوێی لێبوو

کە بەویان وت:

"سبەی کاتژمێری یانزە. یانزەی تەواو.

ئەچیتە سەر هێلانەی سپی تەوارێ

لە قەراغ شار!"

سەعات، شپرزەبوو، سەعات.

سەعات، داخ لەدڵ بوو. سەعات.

بۆ سبەینێ بەر لەوەی "ئەو" لە خەو هەستێ

سەعاتی غەمگین خۆی باداو خۆی دواخست و

بەپشتاو پشت دە خولەکێ بەرەو دواوە گەڕایەوە.

که ئەو ڕۆیشت و لە دەروازە

چووە دەرێ

سەرنجیدا لە مەچەکی دەستی چەپی

لای ئەو هێشتا وەختی مابوو

بەڵام لە سەعاتی دەستی شارەکەداو

لە کاتژمێری زەماندا

نیو سەعاتێ

لە یانزەی مردن لایدابوو

کە گەیشتیشە بەردەمی هێلانەکە،

بەرەو چیا

تەوار دەمێ بوو فڕیبوو!

## پێچەوانە

خۆشەویستیت
بارانێکە
سەروەختێ کە من تینوومەو
ڕائەکەم و ئەچمە بەری
ئەو لە پڕ خۆش ئەکاتەوە.
خۆشەویستیت
بارانێکە
کاتێکیش من تینووم نییەو
لە ژوورەوەم
ئەو لەپڕ دائەکاتەوە!

# بێباڵ

بەدبەختی بوو!.
حیکایەتێکی ناکامم
بەر لەوەی شیعر بیخوازێ
بەلادا هات!.
وەختێ گیرفانیم پشکنی
ئەوەی پێی بوو:
هەندێ گیای وشکی ناو عەقڵ و
دووسێ خەیاڵی بێ شەوق و
چەند ئاوازێکی بێباڵی
ناو هێلانەی
ڕێزمان بوون!

# بزن

له هندستان
شوێن پەنجەی شاهان دیارنەمان.
جێ پێی فیلەکان دیار نەمان.
نەڕەی شێرو، حیلەی ئەسپی
میرەکان و، گرمەگرمی
تەپڵی جەنگی شازادەکان
هیچ دیارنەمان!.
له هندستان
ئەو وێنەیەی
هەر زیندییە
ئەو جێ پێیەی
کە هەر ماوەو
ئەو بارەیەی
کە هەر ئەژی
هی بزنە لەڕی "گاندی"یە!

# ڕەنگدانەوە

کە دوابەدوای بۆردومانێ

کەوتمە نووسین

تەماشامکرد:

خەیاڵەکانم چاڵ چاڵ و

وێنەکانم پڕ دووکەڵن!

کە دوا بەدوای ڕەشەبایەك

کەوتمە نووسین

تەماشامکرد:

دەم و چاوی وشەکانم گرژومۆن و

سەرو قژیان پڕ لە خۆڵن

کە دوا بەدوای

ماچەکەی تۆیش

کەوتمە نووسین

تەماشامکرد:

هەر زنەیەو

هەر کانییەو

لەسەری دێڕو ژێر دێڕ و
لە پەنجەمدا و لەناو دەستما
یەك لە دوای یەك
هەر هەڵئەقوڵن!

# جووزەلە

کیژۆڵەکە
لە ژێر چیلکە و بارە زەلدا
وەکوو نەنکی لێهاتبوو
کۆم کۆم لە بنار شاخەوە
ئەچۆوە بەرەو ئاوایی
زەلێك لە پشتی سەریەوە
بە ئەسپایی، کیژەی دووان
"ئەی چاومامز!
چۆن ئەهێڵم بێتاقەتبی!"
ئەمەی وت و
ئیتر هەتا ناو گوندەکەو
هەتا ماڵێ و
تا کیژۆڵە باری دانا
بە جووزەلە
ئەم گۆرانیی
"حەسەن زیرەك" ی بۆ لێدا!

# جۆلانه

ئەو جۆلانەیەی، شەوەکە، لەگەڵمان بوو.
لەوساکەوە، هەموو جارێ، کە ئەمبینێ
ڕامئەگرێت و تووڕەم ئەکاو لێم ئەپرسێ:
ئەرێ "پەری" پێست هەتاوی
ناوقەد هیلال
جارێکی دی، کەی دێتەوە؟!
تا من بیگرمە باوەش و
لەگەڵ خۆمدا ڕایژەنم و
لە پووزەوە تا پشتی مل
سانتیم، سانتیم، ماچیکەم و
تۆیش لەسەر کورسی بەرامبەر
دابنیشی و
شەوپرژێنمانکەی بە شیعر؟!
ئەرێ بەڕاست کەی دێتەوە؟

سلێمانی
مایسی 2004/5/24

**من شمشاڵێکی سەرەڕۆو هەرزە نەبووم، تا ڕێگە بەم**
**هەموو لێوێ فووم پیا بکاو، نە کلوە بەفرێکی ساوایش هەتا**
**بە یەکەم هاڵاوی دەمی سکڵێ بتوێمەوەو نە خونچەیەکی**

نەدیدەیش بەگڤەیەك زراومچێ. نا من وشەیەکی زیت بووم.
گەرچی وەك ژێ باریك بووم و وەکو تاریش ناوسك بەتاڵ،
بەڵام کاتێ کە پەنجەکانی شیعرو عەشق، بەیەکەوە، لێیانئەدام،
من پڕ ئەبووم لە پەپوولەو لە حەیران و ڕێژنەی ساڵ!.
باڵندەیەکی داودۆز[1] بووم، وەختێ دایکم. بێوەژنە مروزەکەم[2]،
کۆترە ڕەشەکەی "ئیسکان"م، لە بوولێڵێکی نەیاری ئەم شارەدا،
لە پاییزی پاییزاندا، تەنها جێهێشت، تەنها و تەنها. هەر
خۆی و دەستەوارەیەك نانی گریاو، خۆی و هەندێ لە فرمێسکی
ڕاونراوو، خۆی و چەند ورتە ورتێکی ئاگردانێکی ترساوو،
خۆی و ئاوێنەی دیواری حەپەساوو، تەنیاییەکی بەسام و،
خواوەندێکی کەڕەواڵەو، مشتێ نزای ئێوارانی سەر بەرماڵ و،
پڕ بە کۆشیش قەرزی دوکاندارێکی زیادنووس و، بە زستانیش
نووزە نووزی لێفەیەکی هەرزاڵ هەرزاڵ!
دە ماڵئاوا، ئەی کۆتری ڕەش لەناو هێلانەی ڕۆحێکی
زۆر سپیدا. دە ماڵئاوا گمەگمی بێوەژنێ لە بێ پیاوی و
لە دوخان[3] و لە خۆڵەمێشی دابڕان!. تۆیش ئەی ڕەفەی
ژووری شیعرم بە یادگارت ئەسپێرم، بەو خەونانەیش کە هێشتاکە
نەهاتوون و نەماندیوون. سڵاو ئەی کچە دراوسێی کراس
شەرمن و سنگ جەسوور. کچە خەیاتی سەر ڕێگەی تاڵە دەزووی

---

[1] داودۆز: بەو مەلانە ئەوترێ کە پێشتر هەست بە بوونی ڕاو ئەکەن.

[2] مروز: بەدبەخت.

[3] دوخان: دەردو داخ

چاوەڕوانی و دەرزی ژان و تەقەڵی زام. من چاوبازی و
خۆشەویستیم هیچ بەڵێنێکی تیا نەبوو، ملوانکەکە، تاقە خۆزگە و
یادگارم لای تۆ، کە تووتیەکی ڕەنگاڵە لەسەر گوڵەکەی نەخشاوە،
هەڵیگرە، بەشکوو ڕۆژێ ئەو تووتییە لە سنگتەوە هەڵفڕێت‌و بگاتە لام.
ئەی کچی جوانتر لە جوانیی و ناسکتریش لە جەستەی ئاو، ئاوڕشێنی
دەمەو عەسری هاوینانیشت بەسەر چوو. بە دورمانی شەوی درێژت
ئەسپێرم! لە دوای ساتێ ئەبینە دوو تراویلکەو لە یەکتری
بزر ئەبین. لەوانەیە هەرچەند ڕۆژێ نیگەرانییەك لە شێوەی
گەواڵەیەکی تەنکدا لە دەم و چاوت بنیشێ، بۆ چەند ڕۆژێ کەمێك
لە ڕوومەتی حەزوو تۆزێك لە بزەت بڕوشێ، ئەوسا ئیتر وەك
زۆر خەون و داوە دەزووی ناو دورمان و تامی نوقڵ و بازنێکی
شکاوی دەست، منت لەبیر بچێتەوە. سڵاو ئەی کچە دراوسێی
کراس شەرمن و سنگ جەسوور! ڕاسپاردەی هەناسەکانی شیعرم،
ئەگەر جارجار، سەرێك لەو کۆترە ڕەشە بەیت، سەرێك
لە گمەی ڕژاوی بەر دەرگاکەی، تۆ ئەوساکە، پەنجەرەیەك لە
ساماڵ وگوڵەباخێ لە پێکەنین، لەناو خەم‌و لە لێڵایی تەنیاییمدا ئەکەیتەوە!.

★

لە بوولێڵەوە بەرەو ژوور بەسەر ترسا هەڵزنام و ئیتر چوومە
ناو دالانی شەفەقەوە. ئەم دەربەندو دەرالانە جێی زەمانی
پەیکەرتاشن و، ڕەوەزەکان، مەچەك و بازووی بەردستان.
زاخان[4] زاخان، دەریاچەیەك لە مێژووی بەرد. هەموو بەردێ

---

[4] زاخان: بەردەڵان.

حیکایەتێکی خۆی هەیە. من بەسەر چیرۆکدا ئەڕۆم. بەسەر
جوگرافیای ژاندا. هەفتەیەکە لەناو ئەم ڕۆمانی سێوو
گێلاسەدا، با بە تەورەوە هەڵئەکاو بەرد ڕائەکا، لە
خوارەوە، لە دامێنی ئاگرگرتووی بەردەڵاندا، ژنێکم دی
لە دووکەڵی ماڵەکەیدا، وەك قۆریەکی تەنەکە ڕەش ئەچۆوە،
ئەکوڵاو ئەکوڵا، دەستێ نەبوو ئەو داگرێ. ئەتووت
دەوەنی سوتاوە، دەوەن زمانی چیای خۆی بیر چوو بۆوە.
ئەکوڵاو ئەکوڵا، هەر بە تەنها کەفی ئەکرد. ژنێك لە
پوختەی بێکەسیی، لە پرسیاری بێ وەڵام و لە تەماشای
پەڕاگەندە و بێهوودەیی. دۆڵێکی پڕ، لە کەلاکی ئاژەڵەکان،
ئەسپێك دوو ئەسپ و دە بارگیر، سەد سەر مەڕی هەلا
هەلا. کەلاك.. کەلاك.. کەلاك، دە داڵ
بیست داڵ، بازنەی مەرگ خولیان ئەخوارد. ئەڵقەئەڵقە خولیان ئەخوارد.
هەفتەیەك بوو غەزەبی سوڵتانی بەغدا، لە ئاسمانی مسینەوە داباریبوو.
پیرە مێردێ لەسەر چیچکان بە دیار لاکی گوێ درێژەکەی خۆیەوە
دانیشتبوو. هەر ئەیوت و ئەیوتەوە "هیچ. هیچ. هیچ نەما
هیچ!" لاك.. لاك.. لاك.. لاك. کێوەکان لووتیان گرتبوو
ڕەنگەکان بوورابوونەوە. چەند درەختێ لە تاواندا ڕایانکردبووە
سەر گردێ و بۆ ڕەگەکانیان ئەگەڕان. بە لای ئاوێکی سەرسام و
گێژو وڕدا، سوڕامەوەو، سەلامم کرد. بەڵام ئەو هیچ، حەپەسابوو
نە وەڵامی سڵاوەکەمی دایەوەو نە سەریشی بۆ لەقاندم. پەپووسلێمانکەیەکم
بینی سەری ڕووت و کڵاوەکەی لێکەوتبوو. لە ترساندا لەسەر بەردێ

دانەویبوو نوێژی ئەکرد. ئەشکەوتەکان زاری داپچڕاوی شاخ
بوون "باپیرانمان لەم ئەشکەوتانەدا هەموو، بە چوارمشقی
دائەنیشتن و قەفی سمێڵیان با ئەداو قلیانەکانیان ئەکێشاو
سەری خۆیان ئەکرد بە توونی ناو قسەی دوکەڵاوی و پڕ بوون
لە کرمی تەمەڵیی. باپیرانمان شەقیان لە دوارۆژ هەڵئەداو
کەوشەکانیان ئەکرد بە دەمی یەکتر‌داو سەریان بێ زەنگ و
بێ مۆم و دڵیان مێش و گوێدرێژەکانیان لە کچ و ژنەکانیان
خۆشتر ئەویست" پاڵکەوتبووم داڵێك لەسەر کەلاکی
ئێسترێ نیشتبۆوەو ئەویش دیسان نوێژی ئەکرد. ئەم داڵەیان،
بە دەنووك و ناوچەوانیا، بە ڕەنگ و ڕوو، هەر لە حاجییە سووخۆرەکەی
دوکاندارە زیاد نووسەکەی دایکم ئەچوو. لەولامەوە مەلای دێکە
بانگی ئەدا. لەبەر بۆگەنی کەلاك و مرەمرِی چەقەڵەکان، مرقەمرقی
بەرازەکان، دەنگی سیسرکی دەوروبەر. نەمانئەزانی چی ئەڵێ.
مێردمنداڵێ هاتە لامان ئەتوت گوێرەکەی قوڕاویی ناو خم خۆرکە.
لەو دوکەڵانەی سەرەوە داپیرەی لێ بزربووبوو. وەختێ چووبوو،
بۆ سەر گۆڕی ئەسحابەیەك. تا لە قسنەکەی بخوات و تاقە مریشکی
کولانەی بۆ نەزرکات. پێمانوت بچێ ناو سەڵاو بانگی مەلاو
بچێ ژێر بەرد و ژێر قسن و ناو گیرفانی ئەسحابان و ژووری
خودای بۆ بگەڕێ!. شەو لەگەڵ خۆیدا ئەیبردم. مانگەشەوێکی
بێباك و تریفەیەکی دڵڕەق و ڕوخساریشی ئەوەی کە پێوەی دیار
نەبوو پەڵەی تەم بوو. ئەڕۆیشتین و پرپشکی ژێر سمی ولاخ،
ئەبوونە وردە ئەستێرە و پەرت پەرت ئەبوون و پەلکەگیا دائەچلەکی و

قەڵبەزەیش سەری سوڕئەما. لە ناکاودا ڕێوییەکی کون لێتێکچوو
چاو داگیرساو بە بەردەمدا فرتەی ئەکرد. خوڕە خوڕی زۆر ئەسپایی
هەندێ جۆگە لە لاواندنەوەی ژێر لێوی دایکم ئەچوون "ئیستە
چاوی بڕیوەتە چاوشینی عەلادینە بەد بەختەکەی بەرامبەری. لە گڕی
شیندا ئەمبینێ. ورد ئەبێتەوە بزانێ چەند لاواز بووم. لە نەینۆکی
گڕی شیندا کە پێکەنیم پێئەکەنێ. سەر هەڵئەبڕێ و بە خوا ئەڵێ
ئاگای لێمبێ. بە تەزبیحێکی درێژی کلێتە سەوز، قەرزەکانی
مانگ ئەژمێرێ. هێشتا هێلکەکان نەکولاون، سەلکە پیازێ
ئەجنێت و چاوەکانی ئاو ئەکەن و گریانی ڕاستیی و ئاوی پیاز تێکەڵ
ئەبن و بە سەرەویرە شڕەکە ڕوومەتە کۆنەکەی ئەسڕێ" گوڵ ئەستێرەیەك
خەریکە لەو سەرەوە، بۆناو ڕێڵێ[5] دائەگەڕێ. هەنگاوێك و
دائەگیرسێ، هەنگاوێکی دیو خامۆشیی. دوو شەقاوو، ورشەیەك و
تروسکەیەك لەسەر بەردێ هەڵئەپەڕێ. من پێموایە لە کچێکی
گوڵ ئەستێرەی دراوسێی خۆی چاو دائەگرێ و لەوانەیشە شاعیر
بێت و شیعر لەسەر بەرد بنووسێ "کچە دراوسێ باریك بوو.
لە ئاسکی سەر فەرشەکەی خزمێکی مافوور فرۆشی ئێمە ئەچوو.
ڕۆژی سێجار تەماشامان بەریەك ئەکەوت. سەرنجەکان
شریخەیەکی بێ دەنگیان لێوە ئەهات. پڕاوپڕی ئارەزوو بوون.
تەماشاکان سوور سوور سوور سوور ئەبوونەوە. بانگکردن بوون
بۆ ناو جێگا، مەمکی شاراوە ئەجولاو بەلام هەرگیز خۆی
نیشانی پەنجەکانی من نەئەدا. پەنجەکانی من شێت بووبوون.

---

[5] ڕێڵ: جەنگەڵ. بێشە. دارستان.

شاردنەوە شێتی ئەکردن. پرسیاری لەشی داپۆشراو، چون تەنینەوەی ئاگرێ لە پووشووی ناو لەشی مندا سات لە دوای سات گەورەو گەورەو گەورەتر و خوار ناوکیان ئەکرد بە بڵیسەی ڕەق و تا ژێر لێفەو کاری نەهێنیی بۆ دواجار بەفراوێکی پێدا ئەکرد!. کچە دراوسێ هاوینان لە سەربانەوە شەمامەو حەزی خاڵ خاڵ و جارجارەیش وردە زیخی تێئەگرتم!. لە کەلێنی دوو قامیشی بلاوەوە، لە چیغەوە، دەستی ئەهێنایە دەرێ و بە درۆ بانگی ئەکردم. زرەی بازن و خورپەی دڵ، ئاگری جەستەمیان خۆش ئەکرد. ئالۆش بووم و هەڵئەگیرسام. سپیی بووم و ئەبووم بە سوور. درەنگانیش، لە ئاسماندا ئەستێرەیەکی خەیاتم ئەدۆزییەوەو بانگم ئەکرد، ورد ورد ئەهاتە خوارەوە ناو چیغەکەو ئەستێرە ڕووت ڕووت ئەبۆوەو منی ئەدروو بە خۆیەوەو جووت ئەبووین و، وەختێ هەڵئەوەشاینەوە، پێکەوە خەومان لێئەکەوت!"

لە ڕێ دارێکم لەگەڵ بوو. سەری ئەگەیشتە پشتێنم. ئەسمەرێکی خاڵ خاڵاوی و دەم و چاوی گرێ گرێ و بەردەوامیش قاچ قوڕاویی. ئەچوو بۆ لای دار قەزوانێکی ئامۆزای لەوبەر تەیەت. تا نیوەی ڕێ هاوڕێم بوو، دەستی هەر لەناو دەستما بوو. لە ئاستی خز و ماهیدا و لە بەردەمی سەگەکانی ئاواییدا، فریای دەست و فریای قاچ و فریای شیعرە گچکەکانم ئەکەوت. چاو ساغم بوو، هەندێ جاریش چەند قولانجێ پێشم ئەکەوت. ئەمدووان و ئەیدووانم. ئەو لە خێڵی نزارێکی جەنگاوەرو جەربەزە بوو.

وەکوو ئێمە هەڵپاچین و داپاچین و هەڵکەندن و سووتاندن و
دەرکردن و شەونخوونی زۆری دیبوو. بەڵام وەك خۆی
پێی ئەوتم: هۆزەکەی ئەو، چەندین ساڵە، ڕۆژێ لە
ڕۆژان زۆڵێکیان تیا هەڵئەکەوت، ڕاکاو بڕواو بچێ و
ببێ بە سێدارە!.
هێشتا ئەوەڵی کۆچم بوو. من خۆم بەخشیبوو بە بەفرو
بەردستان و ڕەشەباکان. کەچی گوندیەکان وایان ئەزانی
هەر ڕێبوارم و من بۆ تۆو شەتڵ و باسوفکرین وام لە
لایان، چونکە هەر دارێکم پێبوو، چونکە بەرگی بەرم
ڕەش و، خاکیی نەبوو. لەسەر پردە نەگبەتەکەی چەمی
تەیەت کە دوو کاریتەی پەراسووی لێمابۆوە. پەڵە هەور
لە سەرەوەو. من لە بەیناو، ئاوی شێتیش لە خوارەوە،
هاژەی ئەهات. لە خوارەوە مردن هەر ئێجگار ئاشکرا،
بی دەمامك چاوی قوڵی و لووتی زلی و ددانی خۆی نیشان
ئەدام. لەبەر ڕۆحی هەندێ شیعر من هەگبەکەم فڕێ
نەدا. دو پیاو لەوبەر پردەکەوە وەك کەژەکان پێکەنینیان
بە ڕۆیشتن و پەڕینەوەو لەرزە لەرزی قاچم ئەهات. وەختێ
گەیشتمە مەرزەکە. دوو شیعری پەردە نەپۆشم، ترسیان
لێنیشت. زیاتر خزانە بنەوە. لەبەر بۆنی پیسی سنوور،
دوو سێیەکیان هەر لەوێدا بەسەر خاولی و شەرواڵێکما ڕشانەوە.
داوای پشوویان لێکردم. کە دانیشتم هەر لە زاری گەلیەکەدا. ژنێکم دی
بە سواری ماییینێکەوە. ژن: یەکێك بوو لە پەریەکانی چواردەوری

عەرشی خوداو، مایین سپی و کەللە بچووك. منداڵێکیش لە پێشەوە جڵەوەکەی ڕائەکێشا. ئای خودایە ئەم هەموو جوانییە چی بوو؟، لە پڕێکدا، لەناو قێزو ناشرینی ئەم مەرزەدا، وا پەیدا بوو!

لەم کەناری ڕووبارەدا، درەختەکان، بەهۆی (با)یەکی لاسارو چەتوونەوە، کە ڕەنگە ڕاسپێردراوی ئەو دەربەندەی ئەوبەر بووبێت، ئەبینم پاییزیان لە دەست بەربۆتەوە. ئەوەتا پاییز ڕژاوە. کریستاڵی زەرد شکاوەو لەبەر قاچی هەموویاندا ورد ورد بووە. لەم کەناری ڕووبارەدا. تەنیایی بەهۆی عەشقێکی زۆر دوورەوە، کە ڕەنگە ڕاسپێردراوی، کچە دڵڕەقێکی شار بێت. دڵنیایی ونکردووەو وا بێهودە، نێو ئەو هەموو گەڵایانەی بۆ ئەگەڕێ. لەم کەناری ڕووبارەدا، باڵندەیەك بە هۆی بەردی ڕاوچییەوە. کە ڕەنگە ڕاسپێردراوی، ئەم قوللەیەی سەر مەرزبێت. فڕینیان ڕاوکردوەو خوێندنیان ڕاوکردووەو، ئەمیش بێهوودە ناو شنەو ناو شەماڵ و ناو لۆچەکانی شەپۆل و قەیی خەونی لوولکراوی بۆ ئەگەڕێ!.

شەوە زەنگە و گرێکی دوور دەلیلمانە. لە بێزاریم هەڵئەنووتم. هەندێ جاریش ئەکەوم بەسەر خەیاڵداو دائەچڵەکم. مەملەکەتێ لە کوێرایی، مەگەر هەر خوا لێرەدا چاوی ببینێ. هەر دەنگ هەیەو ڕەنگ دیار نییە. کاروانێ هات، ملی هەمان ڕێی گرتبوو. چوومە ناو ڕیزی کاروانی قاچاغەوە. باریان ئەخست. سیپە

چا بوون. لەناو ڕەشدا هەڵتووتابووم. سەرما بە سوژنەوە
هات. سەر قافڵەچی ئاگرێکی لەبەر دەممماندا کردەوە. ئەتوت
لەناو حیکایەتی شەهرەزاد دام. لەبەر شەوقی پرتەقاڵی
ئاگرەکەدا لەسەر چیچکان دانیشتبووم. لە غەریبیی ناو وڵاتی
خۆم ئەترسام. لقی ئاگر ئەشکایەوە. لە کەرت کەرتبوونم ڕائەمام.
لە خۆڵەمێشدا دایکم و لە پشکۆدا کچە خەیاتی دراوسێم ئەبینییەوە.
بە دەم وەنەوزی فرتاوو سەرسمی زۆری خەیاڵ و نووچدانەکانی
بەختەوە. کازیوەم دی لەناو دەربەندی خەواڵووی کەزیی
تەڕدا، لە خەو هەستا. ئەوەتا وا، قۆزاخەیەك لە ڕۆشنایی
ڕەنگ نارنجیی هەڵ ئەبێت و خوا یەکەم شیعری گزنگی
خۆی لەسەر لوتکە ئەنووسێ. چاوم لێبوو لەسەر دوندی سەری
سەرێ ڕائەوەستاو شیعرەکەی خۆی بۆ ئاپوورەی دارستان و
لێرەوارێ ئەخوێندەوە. چاوم لێبوو خۆر لەسەر قەڵان دۆشکانی
ڕکی ملە لە بریسکەی ئاوی خەرەند ورد ئەبۆوە. لە کونێکی
ژێر دەوەندا کەروێشکێ زا. لە نێوانی دوو بنچکدا مارێ
جرجێکی قووت ئەدا. لە ماکافێ[6] جۆگەیەکیان جیا کردەوەو
هەر لەولاوە جۆگە سوێی بۆوەو تەنیا مردا!. ڕۆحم گەڵای
هەڵفڕیوی دەم باخن[7] بوو، (با)یەك لە شارەوە هات و
هەڵیگرت و بە دەم پرووشەی زەردەوە گەڕایەوە بۆ لای
کزەی گیانی ئەولا. هەستم تەنك، تەنك تەنك،

---

[6] ماکاڤ: جۆگەی گەورە کە جۆگەی بچووکی لێ ئەبێتەوە.

[7] باخن: ئەو شوێنەی بای لێوە دێ.

هاڤیبوونی[8] تێدا دیاربوو.

سەر قافڵەچی پرسیی: ڕاتکردووە؟! بە قسەما. بە ڕۆیشتنما،

بە ڕوانینما زەق زەق دیاربوو شلەشاریم.. ڕاتکردووە؟!

"ئاگام لێنەبوو من مۆمم و لە ژێر چاودێری فوویەکی

ئامادەدام. بێئاگابووم من ماسیم و لەژێر چاودێری

قولاپ و چەشەیەکی ئامادەدام. بێئاگابووم لەو

تارمایی و لەو سێبەرەی لە دوامەوە، شوێن پێی قەڵەم و

وشەم و خولیاکانی هەڵگرتبووم!. بەیانیی بوو ختوورەیەك

هەر لە خۆوە، یاخود برووسکەی ڕێکەوتێ هات بە

دڵما و زەنگێکی لێدا لە سەرماو چوومە دەرێ. وەکوو

دەنگێ بە گوێی نەستما بچرپێنێ "هەستە سەر پێ و بچۆ دەرێ"

چوومە دەرێ سەر شەقام و هەر ئەوەندەو پیکابێکی چەکدار

هات و یەکانەکان دابەزین و بە ڕاکردن چوونە ژوورێ!"

من سترانێکی سەرەڕۆو هەرزە نەبووم. یان خونچەیەکی نەدیدە،

وەختێ تەنیا، تاق و تەنیا، کۆترە ڕەشەکەی "ئیسکان" م

لە بوولێڵی هێلانەیەکی پاییزدا. بۆ ڕێکەوتە چەمووشەکان،

بۆ نا ڕێکەوت. بۆ بەفرو باو، بۆ تفەنگ و چاوی نێزەو

جیڕەی چەکمەو بۆ پشیلەی سەر حەسارو، بۆ خوایەکی کپو خوێن سارد

بەجێهێشت و چوومە دەرێ!.

★

"با" لێرە شەنگترە، ئەو وەختەی ئەجووڵێ و هەڵئەسێ و دەست

---

[8] هاڤی بوون: غەریبیی.

ئەکا بە سەما. گوێت لێیە ئەو لێرە ئازادە و گۆرانیی خۆی ئەڵێ و ئەو وەختەی بیەوێ هەڵئەکاو نەیەوێ هەڵناکا. (با) لەولا هەمیشە غەمگینەو لە سیلەی کۆڵاندا تروشکەی کردوەو کڕووزەی ژنێکی بێکەسی لێوە دێ. بەرد لێرە سەربەستەو ئەزانێ بۆ بەردەو ئەپەیڤێ و ئەنۆڕێ و پێناسەی خۆی هەیەو گەر کوژرایش ئەزانێ لەسەر چی ئەکوژرێ!. من چوومە ناوناخی بەردەوە. ئەو وەختەی لە "گەلی بەدران"دا ژوورێکی گا بەردی قایمی خۆی دامێ. قەڵەمم لە بەردو کاغەزم لە بەردو پێخەفم هەر بەرد بوو. لە بەرددا قەسیدەم هەڵئەقوڵی و لەسەر ئەو خەیاڵم تا ئەودیو تخووبی خەوبینین هەڵئەفڕی.

"شەوێکیان لە نێوان کەروێشکەی خەوەوە، تووتییەك هاتە ژوور سەرینم. ڕەنگاڵە. سەیرمکرد بە شێوەو بە پەڕو بە باڵ و بە شاژێی دەنگەوە لە خەمی من ئەچێ و هەر هەمان تووتییەکەی ملوانکەی دیاریمە بۆ کچەخەیاتی دراوسێ. هەر ئەتوت جمکێکی ئازارمەو دەمێکە ڕۆیشتووەو ئێستاکە دێتەوە. دووانم لە پێشدا بەیتێکی لە گاتای ئاوێستا بۆ خوێندم و لە پڕێ کەوتمە ناو خەونێکی زەردەوە وەك ئەوەی خۆرنشین خۆی بێت و بە زەردەی دامپۆشێ. لە پڕیش، بەرانێك بە قۆچی قەف قەفی گەورەوە لە بەردەم ئەشکەوتما ڕاوەستا دۆدێکی[9] زەنگداریش لە ملدا. بێ ئەوەی ڕاڕا بم سواری بووم.

---

[9] دۆد: ئەو ملوانکەیەی لە ملی ئاژەڵ دەکرێت.

بەرانمان باڵدار بوو. باڵەکان زەرکەفتی و قۆچەکان
قاوەیی و دۆدەکە شینێکی ئاسمانی و تیسکی موویش کاڵێکی
پەمەیی. تووتییەکە پێی وتم: ئەزانم زۆر تەنیای،
من هاتووم سەفەرێ پێکەوە بۆ دنیای ئەفسانەو جیهانی
ناو خەون و شیعر بکەین. سەفەرێ: کات و شوێن، سەردەم و
چاخەکان هەر هەمووی پێکەوە لوول ئەکاو ڕابوردوو ئێستاکە و
دوا ڕۆژیش بەیەك جار تەی ئەکا.
تووتییەکە لەنێوان دوو قۆچدا هەلگورماو، بەرانیش دوو باڵی
لەسەر یەك پێکداداو. شاقوڵی بۆ سەری هەڵفڕین. یەکەمجار
بە کووچەی (با) یەکی باریکدا تێپەڕین. دەنگی تیژ، ڕەنگەکەی
شیریی بوو. بەرەو ژوور لە ئاستی کەوانەی نەیزەکێ، شانماندا
لە شانی زیوینی بارانێ، شەلاڵ بووین بە ڕێزەی دڵۆپی
زەیتوونیی. کەوتینە مەیدانی گڤەوە. بە جارێك باخچەیەك
لە پرشنگ هەڵوەری. گەلای پیر دەوریاندابن، داری ڕووت
ڕیز بووبوون. هەندێکیان بۆ گوڵی ڕابوردووی ناو دڵیان
ئەگریان. بەشێکیان ئەژنۆیان خوێناوی و هەر دەستیان
هەڵئەبڕی بۆ ئاسمان، لێرەدا، دووسێ پۆل مەلمان دی.
چراوگی پچووکیان، ئەوەندەی هێلکەیەك، کردبووە ملیان و
زەردو سوور، شینی کاڵ، سپی و سوور، بریسکەی ئاوێنەی
بەرسنگیان ئەسووتا. لەسەرڕا، دەنگێ هات، وەك دەنگی
بەسامی خواوەندبێ پێی وتین: بەم لادا، بە ڕاستدا،
من قۆچی بەرانم وا باداو وەرچەرخاین. لە هەوای شینباودا

تەلارێ لە بەفر دەرکەوت و دەروازەی زێڕینی کراوەو
خاتوونێ نیوە ڕووت باڵابەرز لەوێدا وەستابوو. خاتوونێ،
قژ درێژ تا بەرپێ. پرچەکان گوڵدار بوون. گوڵەکان
پێڵوویان ئەتروکان. لەسەر شان پەپوولەی پنپنۆك،[10]
ئاپوورەی بەستبوو. لە چاویا چەند زنەی جریوە هەڵئەقوڵان.
لە بەران دابەزین. پێشمان کەوت، هەر لەسەر مورەغەی پشتی
ئەو بە پیتی گریکی سێ چوار دێڕ نووسرابوون. بە شێوە لە
شیعری ئەسینای کۆن ئەچوون. هەرسێکمان خۆمانکرد
بەکۆشکی مۆزیك و هەڵبەستا. درەختێ ئێمەی دی و
پێکەنی. شمشاڵێ ئێمەی دی و هەڵپەڕی. داڵانێ لە بلوور
لەگەڵ خۆی بردینی و بردینی. بە ڕێگەی شووشەدا سەرکەوتین.
لاماندا، لە کەنار گۆمێکی ڕەشباودا. ئۆدیبی کوێرمان دی،
قوڵپە قوڵپ ئەگریا. ئازاری گرمۆڵەو، ئەماندی ئاگرێ
لە سنگیا لرفەلرف ئەسووتا، ئەماندی تا ئەبووە خۆڵەمێش
خۆڵەمێش هەمدیسان ئەبۆوە ئاگرو لە شێوەی مارێکی درێژدا
دووکەڵی بە چەند قەف لەسەری هەڵئەسا. ئەگریا و ئەگریا،
سەری هەر لە کۆشیا و لە گوناه ڕائەما. نەوەستاین. خاتوونی
یاوەرمان دەلیل و تا چووینە بەردەمی سەکۆیەك لە داستان.
سەکۆکە لە بیچمی قەڵغان و شمشێر و نیوەیشی لە شێوەی زینێکی
گەورەدا نەخشابوو. بە دەستە ڕاستیشدا ئەسپەکەی تروادە
کەللە بەرز لەسەر سم بۆ حیلە وەستابوو. هۆمیرۆس لەوێ بوو.

---

[10] پنپنۆك: پەپوولەی خاڵدار.

شكۆیەك لە شیعرو هەیبەتێ لە سیمای خواوەندو جادوویەك
لە سیحری ناو زمان لەوێ بوو. سەد زەمان وەك گوڵی
دەمەشێر لە جەستەی ئەوەوە ئاڵابوون. لە نێوان دوو
شێردا لەسەر بەرد، بەردێكی مەڕمەڕین، دانیشتوو.
كە بەران شێری دی قۆچی خۆی لە ترسا لە پشتی منەوە
شاردەوەو خەریكبوو بتۆقێ و لەوێدا چۆك دادا. توتیەكەیش
بێ ورتەو دەنووكی لاڵ بووبوو. هەر بەسەر یەزدانی شیعرەوە
پۆلێ مەل بە نزمی ڕاست و چەپ بە یەكدا ئەهاتن و هەڵئەفڕین.
ناوبەناو بەرسنگیان هەڵئەسوو لە قژی شاعیر و گمەیان
ئم ئمە ئەڕشتە كۆشیەوەو باڵیشیان لە مەوجی ژاوەڕۆی[11]
ئەلیازەو ئۆدیسیای بەردەمی وەرئەدا. پۆلە مەل هەر هەموو
سپی بوون. یەكێكیان نەبێ ڕەش، قەترانیی. ڕوومكردە
تووتییەكە: ئەو ڕەشە دایكمە لەگەڵیان!. من خەون لە
خەونا ئەبینم چوومەوەماڵەكەی ناو "ئیسكان":
"درەنگە پاییزەو. لە سووچی بەردەرگای دەرەوە.
گەڵاتووی زەردەڵەی هەڵوەریو. هەڵلەرزیو. خزاونە
یەكەوەو لەسەر یەك بێ شەرم پاڵكەوتوون. ئەوانە هەر
هەموو مەراقی ڕۆژانەی دایكمن و لەبەر بای تەزیودا ئەلەرزن.
بەرمیلێ ڕەش ڕەشو ناو سكی قوپاوەو بێ نەوت و شێرەكەی
شكاوەو كوتومت هەر ئەوەو بێدەنگەو هیچ نالێ. تەنافێ
دوو پارچەی پێوەیە، كوڵوانەو دەسماڵێ، هەردووكیان

[11] ژاوەڕۆ: چۆمی زۆر ڕوون.

قەرزارو هەردووكیان هەر ژن و تەڕتەڕو ئەو وەختەی
زوقمیان گرت تا هەتاو ناخەون. دوو سۆلی زۆر ماندوو،
دوو سۆلی بێتاقەت وەك قاچی خاوەنیان. جووتێ سۆل
لە خزمی ڕەزیلی دەوڵەمەند شەریفتر. چاو ئەنێم بە شووشەی
پەنجەرەی ژوورەوە: ئەبینم خۆی و خەم خۆی و خواو
تەنیایی پێكەوە چوار مشقی بێ جووڵە لەسەر ئەرز پشت لە من دانیشتوون.
بەڕەكە هەر هەمان بەڕەیە وەختی خۆی كە خودا بە دیاریی بۆیناردین.
ژوور پڕە لە ئاخی بە هاڵاو، چون كتلیە ڕەشەكە قوڵپ
ئەدا گریانی ناوەوەو كەف ئەكا زوخاوو بینیان خنكاوە
چرای چاو. كۆتری ڕەش بە پەنجە نانی ناو قوڵینە ئەژمێرێ.
چەند ماوە؟!، عومری من ئەژمێرێ. هەناسە ساردەكان،
گەرمەكان، تاریكیی و كلۆڵی و، پینەی جل، هێلكەی پیس،
هێلكەی پاك ئەژمێرێ. كۆتری ڕەش ئەستێرەی كشاوی
ناو جەستەو، ژنانی مێرداری گەڕەك و بێوەژن لە
ڕیزی پاییزدا ئەژمێرێ. من چاوم هەر لەسەر شووشەیە
كۆتری ڕەش بۆ خوداو بۆ قاپێ مزرۆكەو بۆ وێنەی پیاوێكی
سەر دیوار، بۆ تەیری سەر بەڕەی ژوورەكەی خۆی ئەدوێ،
هەر ئەمە كە ئەدوێ. من دەنگی بە چرپە و یان بەرزی
خودایەك نابیسم بۆی بدوێ. هەر ئەمە كە ئەدوێ. ئەیبینم:
فەقیانە، گڵونكە پاڵوانەی[12] هەڵنەنیشتووی غەمبارن. سركەیی
ناوچەوان وەك هەوری نەبارە، لەسەرچاو نوستووەو ژاكاوەو

[12] پاڵوانە: جۆرێ لە پەڕەسێلكەی باڵ درێژی قاچ كورت.

لە تەختی کراسدا هەر شەوی دەیجوورە کە دیاربێ. ئەیبینم:
خولیاکان بە کۆمەڵ ئەچنە پاڵ سەرین و ئەیکەنە ورتە ورت.
ئەبینم: خەمەکان بە دەنووك خۆشیەك ڕاوئەنێن بۆ
حەوشە، تا ئەنوێ. ئەیبینم: لە کونی ژوورەوەیش پاییزە،
ئەوەتا گڕی شین لە چاو زۆپادا ئەوەرێ. گەچکاری
سەر دیوار لە خۆوە زەرد ئەبێ و ژاڵەکەی سەر بەڕەیش
بە تەڕی ئەوەرێ. لێفەی شڕ ئەکۆکێ و ئەکۆکێ و دۆشەکی
بێ هەناو هەناسەی خەونێکە ئەتاسێ و سەبەتەی نانەکەیش
لەولاوە. کزۆڵە کزۆڵە، چاو بۆ ئارد. چنگێ ئارد ئەگێڕێ و
نایبینێ. من گوێشم هەر لەسەر شووشەیە. ئەبیسم،
من دەنگی زیقەڵەی کراسی شیتاڵ و ڕزیوی ئەبیسم ئەو
وەختەی داملەی[13] هەژاریی لێیداوە. دەنگی چاو بە
تەڕی. دەنگی بۆن ئەو وەختەی لە ڕشتەی مێخەکدا
بۆ بەختی خۆی ئەگری. دەنگی ڕەنگ ئەو وەختەی
باگژەی ساڵ ئەیباو ئەبێتە بێوەژن. من پەیڤی سوراحی
لێو شکاو ئەبیسم ئەو کاتەی کە ئاوی ناو جەستەی ئەشێوێ و
زمانی ئەشڵەژێ و لاڵ ئەبێ. من دەنگی لەرزۆکی بەتاڵی قاپەکان
ئەبیسم ئەو دەمەی لە ڕەفەو هەڵگرتن بێزار بوون. من دەنگی
جاجمە کۆنەکە ئەبیسم ئەو ساتەی بە تەنیا گۆرانیی بۆ یادی
بووکێنی خۆی ئەڵێ. من دەنگی ناخۆشی دۆڵابە کەتەکەیش
ئەبیسم ئەو دەمەی بەگرِیی بانگ ئەکاو قاچێکی نەماوەو

[13] داملە: شەپڵە لێدراو. ئیفلیج.

خەریکە داکەوێ. من زیکەی تەقەڵ و من نووزەی دەرزیەکەو
هاواری سەتڵەکە ئەبیسم گوێم لێیە: تەقەتەق تەنەکەی
نەوتەکە چی ئەڵێ. تەقە تەق ڕەحەتی دەم پەل و زار وشکیش
لەگەڵ ئەو چۆن ئەدوێ. لەرزە لەرز پەنجەکان چی ئەڵێن.
یان چمکی کەواکەی خشەخش چی ئەڵێ. چاو لەسەر پەنجەرەو
گوێ لەسەر شووشەکە هەڵناگرم. لەگەڵ خوا جێیدێڵم. کە
سەرم هەڵنەبڕم تووتییەکە پێم ئەڵێ: ڕۆیشتبووی لە کوێ
بووی؟!. بەرانیش سەیرێکم ئەکات و بزەیەك ئەیگرێ!"

هۆمیرۆس لە هەوری شیعردا بارانەو ڕاماوە. قژ لۆکەو
ناوچەوان بەرانیی بۆ دوور دوور ئەیڕوانی. توتیەکە
پێی وتم: باشیعرت پیرۆزکەم. دوو دێڕی بە دەنووك
هەلگرت و هەڵفڕی و گەیشتە سەر ڕانی هۆمیرۆس
دێڕەکان کەوتنە نێو باوەشی. کە دەستی لێوەدان،
ئەوانیش بوونە مەل لەگەڵ پۆل هەڵفڕین. تووتییەکە
هاتەوە و چرپاندی بە گوێمدا تەماشای لای (چەپ) کە. بەچاوی
شیعری خۆم ئاوڕم دایەوە ڤینۆسەو بە بەرگیی ساماڵی
مۆسیقاو شیعرەوە وەستاوە. جوانییەکەی سەرخۆشە. خەریکە
لە خۆشییان وەك لێوی خەندەران شەق ئەبا. جوانییەکەی
ئاڵ ئاڵەو لەزنەی گونەدا خەریکە سەرئەکا. جوانییەکەی
پڕپڕە لە زەوقی بزۆزو شەهوەتی مکۆڕو،[14]

[14] مکۆڕ: یاخیی.

بازرەقەی مامزی نەسرەوتی ئارەزوو پڕپڕە لە گچکە
خواوەندی هەوەس و لەماچی شەرابیی یاقوتی و لە زڕەی
فنجانی عاشقان. ڤینۆسەو هاتۆتە بەردەرکی ڕۆشنی
قەسیدە و، خەیاڵی هاوینان بەشنە و بە شەماڵ ئاوڕشێن
ئەکات و نیگایشی تەیرێکە باڵ شین و لە سەرخۆ هەڵئەفڕێ بۆلامان:
"چوومەوە ناوچیغی سەربانی جاران و بەرماڵی کچەکەی
دراوسێ و بوومەوە بەیەکەم هەڵبەستم و ڕۆیشتمەوە کۆڵانی
خوێن گەرمی ناو "ئیسکان":

درەنگە پاییزەو، شەوێکی بێ مانگەو. خۆم ئەکەم بە حەوشەی پچووکی خەوتوودا
گوڵەکان نوستوون و حەساریان نووستووەو دەرگای کوڵ
نووستووەو پەردەکان نووستوون و هەر ژوورێك زیگارەو[15]
بەخەبەر. چاو ئەنێم بە شووشەی ساردەوە. ڕوومەتم
بەکزەی داچڵەکین ئەترسێ. هاڵاوی ناو دەمم پەڵەیەك
ئەخاتە سەر شووشە. بە پەلە ئەیسڕم. پێش ئەوەی بیبینم،
خڕەخڕ. کورت. درێژ. دەنگێکە دێ و ئەڕواو لە پڕیش
ئەوەستێ. ڤینۆسی دراوسێی خەیاتە. مەکینەی سنجەری
خەیاتیی ڕەنگ ئەدورێ بەڕەنگیی ترەوەو حەز ئەدوورێ بە
حەزی ترەوەو، شەوکارەو، تا بەیان بارانی دورمانە.
سەفەری درێژی شەوانەی بەکرەو دەزووە. هەنگاوی
هێواش و یان خێرای تەقەڵە. ورد. درشت. شاقوڵی و

[15] زیگار: شەونشین.

ئاسۆیی. خڕەخڕ. لە ناکاو بەتەنها قۆڵێکی پەمەیی و
قاچێکی نارنجیی ئەبینم. لە ئەرزی بەرپێدا تەمەنە
جیاجیاکان ئەبینم، ڕەنگاوڕەنگ، کەوتوون و بۆ
ناسین، پێش جەژن، شەویانە. ڤینۆسەو خەیاتی ژنانە.
دەرزی هار دەنووکی لە چینەی چیمەنی قوماشدا هەڵناگرێ‌و
لە ڕیزی دورمانی درێژدا هەر هەموو تەقەڵێ ئەبێتە
وشەیەك بۆ من و دوو تەقەڵ دوو باڵی پەپوولەو
سێ تەقەڵ ئەبێتە ڕستەیەك، ڕستەکان ئەبنە جادەی ڤیر
ڤینۆسیان پیا ئەڕواو ڕێ ئەکات بەرەو من. بەرەو
لای قەسیدەی پەروانە. ئەیبینم: پرچی کاڵ بۆ سەر
شان بۆ سەر سنگ شەبەنگی تلۆزینی[16] پەخشانە. لە فەرشی
دیواردا ئاسکێك ئەبینم. بارەی دێ. هەر ئەڵێی بارژنی
ئارەزووی مەمانە. درەختێ ئەبینم لە تابلۆی دیواردا،
بەردەوام تەماشای وا لەسەر کەتان و حەریری سەرڕانە.
گەواڵەی هەورێکیش لە سەرێ دووگیانی هەتاوو بارانە.
ئەیبینم، گوێم لێیە. گۆرانیی "بارانەو بارانە" بە نزمیی هەوەسی
تەڕ ئەکاو سەر پەنجەی تەڕ ئەکاو جلەکان تەڕئەکاو، ڕەنگەکان
تەڕ ئەکاو، ژوورەکەی ئەبێتە پاناوکەی[17] مۆسیقای بەردەمی سێ ڕیزی
بارانە. کراسی کیژۆڵە بزێوەو لە ئاستی مەماندا قوماشی
بێ ئارام خڕ ئەبێ و، کراسی سەرە ژن، قوماشیی بە ئارام. بە ویقار

---

[16] تلۆزین: هەڵبژاردەی هەرەباش.

[17] پاناوکە: گۆماو لە دەشتدا.

دان ئەگرێ بە خۆیدا و تێکناچێ. ڕەنگی تەڵخ. کراسی بێوەژن
قوماشی دڵتەنگەو وەڕسەو ڕایەڵ و تان و پۆی چەپاوو
سەرکوت و تەقەڵیان فرمێسکی دەزوەو. دامەنیان،
بناری گریانە. هەڵئەسێ بەرسنگی کراسێ بە سنگی
ئەپێوێ. دەستی من لێرەوە لە تاودا بۆ سنگی ئەلەرزێ.
لەویەوە دەرزیەك کە ئەشکێ لێرەوە من نووکی قەڵەمم
قرچەی دێ. پێی ئەڵێم بێ ئەوەی گوێی لێمبێ:
ئەو شەوەی بمدوریت بە باڵای تەنیایی و خەمتەوە
ناو شیعرم پڕ ئەبێ لە دەرزی و هەتاکوو بەیانیی مەراقم
وەك دەزووی ئاڵۆزکاو گییر ئەخواو لە پەلکی فرمێسك و
چاومەوە ئەئاڵێ. ئێستاکە تەماشام وەك دەزووی
قرچۆکە هەر ئاخێ هەڵکێشم ئەو لە پڕ لەویەوە
ئەپچڕێ. لە دووریت ئەوەندە پچڕاوە تەماشام،
هەست ئەکەم تەنیاییم خەریکە کوێر ئەبێ!.
من چاوم هەر لەسەر شووشەیە. ئەوەتا کراسێ هەڵئەگرێ
لە تەختی کراسدا توتییەك ئەبینم. خەیاڵم دەزوەو
ئەپچڕێ و ئەچمەوە لای تووتی و بەران و ڤینۆسی خواوەند و
بەردەمی هۆمیرۆس. تووتییەکە بە سەرە دەنووکێ خەونەکەی
داچڵەکان. پێی وتم: ئەمجارەیش ڕۆیشتبووی بۆ لای کێ؟!.
بەرانیش بۆ گاڵتە قۆچێکی لێدام و تووتییەکە وتیەوە:
هۆمیرۆس شیعرەکەی پیرۆز کرد. با بڕۆین وەختمان
درەنگ کرد!. هەردووکمان چووینەوە سەر کۆڵ و

سەر قۆچی بەران و بە کاوخۆ هاتینە دەرەوە. خاتوونی
یاوەریش هەتاکوو بەردەمی کۆشکەکە بە خۆی و
یەك چەپك شیعرەوە، ئامێزی پڕکردین لە نۆتەو پەپوولەو
شیلانەو زەنگیانەو لە خەونی ئەفسانەو، لەویەوە: هەڵفڕین!

★

"گەلی بەدران" ئەسپێك لە بەردی داستان و ئەسپێك لە بەردی
ئەفسانە. لە وردە زیخی کلکەوە هەتا تاشەبەردی کەللە،
پلە پلەو ملە ملە، سەرسام بوون بەرز ئەبێتەوە هەتا ئەگاتە
سەر یاڵ و لە یاڵەوە بۆ نێوانی هەردوو گوێچکەو ئیتر لەوێ
چاو ئەترسێ و با ئەخلیسکێ و سەرنجەکان ئەڕژێن و ئەلەرزن و
ئەگەڕێنەوە بۆ دواوە. ئەو شەوەیان ئەستێرەیەکی عەجول و
گلاراوی ئەو ئاسمانە کەوتە بازبازێن بە سەریاو لە پڕێکدا قاچی
لە تیسکی یاڵ گیراو کەوتە خوارێ و لەبەر کەوێلەکەی مندا،
جریوەی لەشی هەمووی پژاو کە وەختێ من چوومە سەری
تەنها یەك شیعری زیندوو بوو. هەر بە باوەش هەڵمگرت و
بردمە ژوورێ و لە دیوانە تازەکەمدا نووسیمەوەو بۆ ڤینۆسە
خەیاتەکەم کرد بە دیاریی. گەلیی بەدران: جێی خۆحەشاردانی
سروود. جێی خۆشاردنەوەی ڕاستییەکان. وەختێ درۆ
حوکمڕانەو گەر ئەوانی بەردەست کەوێ یەکە یەکە بە قەمەکانی
تاریکیی سەریان ئەبڕێ. گەلی بەدران تەنیایی و بەردو
زاووزێی ئەو مەراقانەی کە هەمیشە وەکو ژنی شفتەژێن و
دوو دوو بێشکەی کوڕو کچی ئەم دەربەندی خولیایانەم

ڕائەژەنن. تەنیاییم سەیری بەرد ئەکا. خوێندنەوەی بەرد
خوێندنەوەی ژانە ئەو وەختەی کە ئەمەیێ. خوێندنەوەی منە
بۆ دنیا لە ساتەوەختی یەکەمی لە دایکبوونی غوربەتا.
ئەچمە بەردەمی هەموویان. درشت و ورد. پان و درێژ و قۆقزی و
بەرز و نزم و یەکە یەکە نەبزی دڵ و دەستیان ئەگرم
هەموو پڕن لە پرسیارو لە ڕامان و لە سەرسوڕمان. بەرد
هەر ئێمەین لە ڕۆژگارە دوورەکاندا، ئەو بەڵگانەی، ئەو
هەناسەو ئەو دڵانەی لە جێی خۆیاندا ڕەق بوون و بەڵام
ماون. بەرد هەر جەستەی یادگارە کۆنەکانی ناو
زەمانن، پێمان ئەڵێن نەهێنییەکانیان هەڵبێنین. زمانیان
بدۆزینەوە. ئەو بەردە تەخت و پانەیان، هەبێ و نەبێ،
جێی هەڵفڕینی سیمرخی خوداوەندو یەکەم شانۆی چنگ نانە چنگی
ڕووناکیی و زوڵمەت بووە. هەر لەسەر ئەم. هەبێ و نەبێ،
کیژۆڵە جوان و ڕەندەکان قوربانیی بوون بۆ خواوەندێ تا فەڕ
بدات بە باران و بە کێڵگەکان. تەنیاییم سەیری بەرد ئەکا،
بەم لاپاڵ و ڕکانەوە، هەزار نەهێنیی سروشت و خواوەندەکان
بەدی ئەکا، تەنیاییم سەیری بەرد ئەکا، خودا یەکەم وێنەکێشی
گرافیکە. خودا یەکەم نەقاشیشە لە ڕۆحی ڕەش و سپیدا
کار بکات و ناوبەناویش پەراوێزەکان ڕەنگبکا. خودا یەکەم
هونەرمەندە لە نەهێنیی بەرد گەییبێ و چاوی تێکەڵ بەرد
کردبێ و بەردی هێنابێتە قسەو گوێچکەی دابێ بەم
کێوانە. ورد بەرەوە: لەم ڕیشاڵ و دەزوولانەی،

لەو تەژانەی[18]. بەرد بە بەردیان. ئەچنەوە سەر
ڕەچەڵەکی ئەو شاخانەی هەر یەك دیوار تابلۆیانە:
"لەم ئاستەدا، ئەوە ئەژدیهای دۆزەخەو
پەلاماری شێرێك ئەداو شێریش چۆتە سەر کلکان و
لە هەڵمەتی چەپۆکانە. ئەوە خۆرە تازە تازە هەڵهاتووەو
پیاوێك کڕنووشی بۆ ئەباو چلێ زەیتوون بەم دەستیەوەو
کۆترێکیش لەسەر شانی نیشتۆتەوەو ڕەنگی شەفەق وا لە بەریا و
مەزدەیەکی جاویدانە. لەو ئاستەیشدا، ئەوە دوو پیاون
ڕم بەدەست بەوری نێچیریان گرتووەو ئەیبەن بۆ شاهی
شاهانی ئەو زەمانە. ئەویتریان پەپوولەیە و لەناو قژی
ژنێکدایەو ئەویتریان قۆچی گامێشێکی ڕەشەو ئەوەی
ئەولا بەرازێکەو ڕاوکراوە. ئەوی سەرپەڕ، ئەهریمەنەو
تاجی مرواری و یاقووتی لەسەر ناوە" من تەنیام و هەموو
ڕۆژێ لەم زاخان و لەم چەقەنە بەردانەدا. مێژوویەکی
دوور لە لامە. دوێنێ ئاناباز هات بۆ لام. بە زرێپۆش و
کڵاوی ئاسنین و ڕمی دەست و چەپکێ تیری بەرپشتێن و
کەوانەوە. ماندوو ماندوو. وەختێ دانیشت.
ئەشکەوتم پڕبوو لە ڤیژەو لە هۆبەهۆی مەیدانی شەڕ.
لە تەپ و تۆز. لە گرمژنی بەردی زل. لە دەنگی بەریەککەوتنی
قەڵغان و شیر، لە ڕمبەی کەوتنی ئەسپ و لە حیلەحیلی
خوێناوی و لە ناڵە ناڵی سەربازی بریندارو لە نێڵەنێڵی

---

[18] تەژە: کۆڵەکە. ستوون.

ئاگری سەر قوتکەکان. دوێنێ ئاناباز هات بۆ لام.
پەست و ژاکاو، ئەتوت ئاوێنەی خۆڵاوی و تاشەبەردێکی
شکاوە. تێی گەیاندم. "بۆکریسکان" سەر لەشکری
سوارەکانی لەم دەربەندەدا کوژراوە. تێی گەیاندم. لە مەملەکەتی
ئەفلاتوون من دەرئەکرێم. وەختێ هەستا. چەند پشکۆیەکی
هەڕەشەی تێگرتم و بە تووڕەیی وەك ڕەشەبای لەخۆبایی چووە
دەرێ. ئەیانبینم هەموویان یەك یەك ئەبینم: ئەسکەندەری
گەورە و پچووك، خالیدی کوڕی وەلید و. هۆلاکۆو سەعدو
تەیموورو، هەموو ئەو کەڵەشمشێرو ڕم خوێناوی و
دووکەڵانەی ڕەو ڕەو لەگەڵ بای دەۆزەخدا هاتنە سەرمان!
ئەیانبیسم هەموو دەنگەکان ئەبیسم. هەموو دەنگە جوانەکانی
ئەرزو ئاسمان، ئەو شەوەیان کە مانگ گیرا. دەنگی زەردەشت
بەم ناوەدا هات و چۆی بوو. تاڤگە بوو یاخود هاژەی
خۆرەتاو بوو. هات وچۆی بوو. نوور بوو لە شێوەی چناردا.
سەرئەکەوتە سەر ڕەوەزو هەڵەمووت و دائەبەزی و
بازی بەسەر تەم و مژو نائومێدی و ڕقدا ئەدا. قەسیدە بوو
بەڵام لە شێوەی دایکمداو ئەهاتە بەر ئەشکەوتەکەم،
دوراو دوور ماچی ئەکردم و هەر ناوی مەزدەی ئەهێنا!.
چاوم لێبوو لە گەوەی سەری سەرەوە، تاریکیەك ڕێگەی
پێگرت، تاریکیی دڕ بوو شاڵاوی دۆزەخین و، وازی
لە نوور نەئەهێنا. زۆرانێکی چنگاوش بوو. چاوم لێبوو،
چەخماخەیەك لە هەورەوە هاتە خوارێو لەناو قەدی

تاریکیی داو، چون تاشە بەردێ پەرت پەرتبوو. هەر لەناو
دڵی بەردەوە، ڕووناکیی سەری دەرهێناو، پێغەمبەریش
بانگێکیدا "سرمدییە ئەم زۆرانەی نێوان من و
تاریکایی. نێوان گوڵەگەنم و کوللە. نێوان ڕق و خۆشەویستی.
ئەزەلییە ئەم جەنگانەی نێوان خێرو نێوان شەڕو. تا هەتایە
بەردەوامە ئەم بردن و ئەم هێنان و زۆرانانە. من وا
هاتووم ئەوە چنگێ وشەی تازەتازە بۆ ناو دڵتان.
ئەوە گرێکی ئێجگار نوێ بۆ ناو ڕۆح و بۆ سەر ڕێتان.
من وا هاتووم دار بە دار و بەرد بە بەردی ئەم دەربەندە
پیرۆز کەم و مانگی گیراو بەر بدەم و کێڵگەی ساڵێکی بەخشندە،
ساڵی ساڵاو، ساڵی سەمەلی کەڵەگەت، ساڵی هەتاو،
لەگەڵ خۆمدا بەرم بۆماڵی هەژاران!"

⋆

ئەو شەوە لە کەنار خەوێکی سپیدا سەوز بووم،
چرۆمکرد. گەورە بووم. بووم بە دار سنەوبەر.
تەیرێك هات سیحراوی و گەردن شین. زۆر
بێدەنگ. ئەسپایی. لە سەرم نیشتەوە. دوو نامەی
لەگەڵ خۆی هێنابوو. نامەکان لە ڕەنگی تەنیایی و
غەریبی و، لە ڕەنگی گەڕەکی ئیسکان و لە جادەی
مەولەوی و لە دەنگی دیلان و سەرخۆشیی بێکەس و
تینویەتی تانجەرۆ و برسێتی قانیع و لە ڕەنگی
عەشقەکەی من ئەچوون. یەکێکیان لەم باڵ و

ئەویتر لەو باڵی پێچرابوو. بایەکی شیعر دۆست
ڕاستاڵ[19] و جێی بڕوا. خوێندەوار. هەر لەبەر چاوی
خۆم. بە پەنجەی وژەیەك. هەردووکی کردنەوە.
نامەکان یەکێکیان هی کۆترە ڕەشەکەو ئەویدی
هی کچە ڤینۆسی خەیات بوو. من نەمهێشت ئەو شەوە
"با" ی هاودەم، فەقیرە چاو لێکنێ و، بەردەوام، تا یەکەم
تەتەری هەتاو هات. ئەو نامەی خوێندەوەو خوێندەوە!.

★

لە بەردستاندا چاوی ئەز. بەردە نێرو بەردە مێکان لە یەکتر
جوێ کاتەوە. بەردی شاعیر و بەردی تر. بەردی وەرزشکارو
بەردی ئەندازیارو بەردی پزیشك، زارۆکە بەردو کوڕیژگە
بەردو بەردی پیر لە یەکتر جوێ ئەکاتەوە. ئەمێستاکە لەم
ناوەدا نە بەردی نەجمە بەشان و نە بەردی سیخوڕی چاوزەق،
نە بەردی عەرەبی قەومی و نە بەردە پۆلیس. لەناو ئەم بەردانەدا
نین. ئەم بەردانە لێرە هەموو بە یەك زمان ئەپەیڤن و
هەموو هاوخوێنی یەکترین. لە بەردستاندا چاوی ئەز هەموویان
یەك یەك ئەناسێ. ژنە بەردەکان هەمیشە قژیان سەوزەو
گوڵ بە سەرو سنگیان بەرزو لەشیان سپی و پێست لوسترن.
کچەکانیش ئەو بەردانەن ئاوەسوون[20] و لە ژێر ئاودا
نیگا ڕوون و پێئەکەنن. جوانەکانیان ئەو بەردانەن

---

[19] ڕاستاڵ: کەسێك جێی بڕوا بێت. جێی بڕواو متمانە.

[20] ئاوەسوو: ئەو بەردەی لەبەر زۆر ئاو بەسەردا هاتن لووس ئەبێ.

لەبەر ئاوێنەی ڕووباردا بە شانەی چڵ و پەلکە گیا پرچ و
کاکۆڵ دائەهێنن. بەردی وەرزشکار بەردێکە لە
ڕەوەزدا ئەیانبینی هەموو چوونەتە سەر شانی یەکتریش و
قەت نایشکەون. بەردی شاعیر ئەو بەردەیە تۆزێ
تەریك، تۆزێ دوورتر لەوانی تر، ئەچێتە بەر مانگە شەوو
شیعر ئەنووسێ. بەردە گەنجە سەرچڵەکان، ئەو بەردانەن
لە کەڵەکی سەر کانییەکانی ژناندا ڕاوەستاون و هەر خەریکی
چاو باشقاڵێن. پیرێژنە بەردەکانیش ئەو بەردانەن،
ساردو سڕو لەبەر دەرگای تاشەبەردە زلەکاندا دانیشتوون و
بزانن کێ دێت و ئەچێ و هەر خەریکی هەڵەوەڕین. بەردی کاسب
ئەو بەردەیە لە سەرەڕێدا وەستاوەو جڵەوی ئەسپەکان
ئەگرێ و لە ملیەوە ئەیپێچێت و قەت ناهێڵێ ئەوان
بەربن. زارۆکە بەرد. ئەو خڕکە بەردە زۆرانەن،
لە دامێندا کۆمەڵ بوون و وەختێ بە لایاندا ئەڕۆی تەقەتەق و
زیقە زیق و خڕەیان دێ. بەردە بوکیش بۆ خۆی دیارە. ئەوەیانە
یان گوڵاڵە یان هەڵاڵە یان تیلماسکێ لە شەفەقی بەسەر سەری
خۆیدا داوەو تۆزێ شەرمنەو تەماشای بەرەو خوارە. بەردی هەژار
ئەو بەردانەن لەناو بەردەکانی تردا ونبوون. جێگەیان لێژ یان
هەورازە. بەردی دەسەڵات ئەوانەن، لەسەر قوتکە ڕۆنیشتوون و
جار بە جارێ تفێ هەڵئەدەنە خوارێ و لووتیان بەرز و فیزیان زل و
دانابەزن و تێکەڵی بەردی تر نابن. بەردی عاشق هەمیشە
وا لە نسێداو کزەو ماتەو چاوەڕوانە!.

بەردی ئازاو قارەمانیش ئەو بەردانەن لە دیواری سەنگەر
دان و بەر لە جەنگاوەران سنگ بە گوللەوە ئەنێن و
شەهید ئەبن. بەردی غەریب ئەو بەردانەن تاك و تەرا و
پەرش و بڵاو کەوتوونەتە چۆڵەوانی و یان پێدەشتێ و دەورو
بەریان هەمووی گڵەو هەمووی خۆڵەو لە خۆیان زیاتر نابینن.
لە بەردستانی ئێرەدا، دوو بەردی دیکەی جیاواز هەن. لە هیچ بەردێکی تر ناچن.
یەکێکیان بەردێکە ڕەش ڕەش ڕێك بەرامبەر تەماشامە،
ئەوە دایکمەو، ئەویتریان بەردێکە سوور بریقەی دێ و
ڕێك بەرامبەر چاوی دڵ و چاوی ڕۆحمە: کچە ڤینۆسی خەیاتی
گەڕەکە سپیەکەی خۆمان!.

★

نە زەرنەقووتەو نە خونچەو نە (با)ی زارۆڵ بووم
کە هاتم. وەختێ گەیشتمە بەردستان. من باڵندەی
ناو قەسیدەو چڵە هەتاوێکی سوورو (با)ی یاخیی بووی
ناو سروودی تازەی شار بووم وەختێ هاتم. بەڵام هێشتا
تەماشام و گۆرانییەکانی سەر زارم زریانی کێو لێی نەدابوون
دەست و پلی قەڵەمەکەم هەر ناسك و بەم بەردانە نەڕوشا
بوون. وەختێ هاتم من باڵندەی ناو کتێب و جوانووی
شیعری سەر شەقام و ڕۆژنامە بووم وەختێ هاتم.
بەر لە گیتارەکەی منیش، چەند بلێسەی ناو کەرکووك و،
چەند کەوی خەمی دهۆك و چەند تاق تافکەرەی هەولێریش
گەیشتبوونە بەردستان. هێشتا سەرەتای ناسینی من و بەرد

بوو. لە ئەوەڵی خوێن جمانی گوڵەباخ و سروودا بووین
تازە ئەلف و بێی بەردەڵان فێر ئەبووین و بە باڵەکانی
ئازاردا هەڵئەزناین. لە بەردستان. ڕۆژێ لەوێ. لە پاڵ
گابەردێکی زلدا. من ئەڕۆیشتم بۆ لای پەڕەسێلکەیەکی شیعر،
هەندێ باڵی ڕەش و سپی بۆ فڕینم لێ وەربگرم. ئەویش بەرەو
ڕووی من ئەهات. ئا لەوێدا یەکمان ناسی. کلێپەیەکی
ناو کەرکووك بوو. ناوی فەرهاد. ڕەنگی لە بەڕووی
ڤاوەیی و دەستەکانی لە تاژان و چاوەکانی وەکوو چاوی
بازی برسی و بە جەستەیش مامزێ باریك. لە شۆڕیجەوە
هاتبوو. چی دووکەڵی ئەو شارەیە لە دەروونیاو، هەرچی
هەوری سەر خاسەیە لە چاویا بوو. وەختێ ئەدوا،
هەر پەپوولەی پەیڤی ڕەش بوو لە زاریەوە ئەتروکان و
کە دەستیشی ڕائەوەشان یادگاری چون باویلکە
هەڵئەوەری و کە باسی دایکیشی ئەکرد هەموو جەستەی
لەناو دەنگیا ئەبوو بە چەند تۆپەڵێ ژان. چاوەکانی
یەکسەر گوڵی ئاڵیان ئەگرت!. ژێیەکی گەرووی
کپ ئەبوو. ڕەنگی سیمای وەکوو توێکڵە پرتەقاڵی
لەبەر گڕدا هەڵئەکرِوزا. فەرهاد لە خۆشەویستیدا،
وەکوو بەردە مۆرەی ناو گیرفانی گەلی بەدران وابوو.
ئەو ڕۆژەی تەم دەم و چاوی نەگرتایە. ئەو ڕۆژەی
خەم پشوویەکی لەو دەرو دەشتە بدایە، هەر بۆ چەند
ساتێ لێی دوور بوایە. قسەی خۆشی وەکو بوغورد، مۆمی

بۆنخۆش دائەگیرسا و بەرامەکەی تا ئەوپەڕی دەربەند
ئەڕۆی. بەیانییەك هێشتا بەرد زۆریان نوستبوون
چەند درەختێکی کوڵ نەبێ لەگەڵ بایەکی زۆر بلێی
ناو گەلیدا کردبوویان بە ژاوە ژاو. جۆگەلەکە،
بە دوو لق داری شکاوە، چاوەکانی هەڵئەگلۆفی و
شۆڕەبیەك دانەویبوو بەسەر ئاودا و سەری ئەشت.
لە پەڵەیەك تەمی جیڕدا دار قەزوانێکی زۆر تەمەڵ.
بە نەخورێنی یەکەم جگەرەی قامیشی ئەو بەیانییەی
ئەکێشا. پیرە بەردی قەوزە گرتوو. قەلە ڕەشێکی
خستبووە سەر پشتی خۆی. دیار بوو بەکرێی گرتبوو. زۆر بە
وردی، قژە سەری ئاڵۆزکاوی بۆ ئەدۆزی و جاربەجاریش
پشتی ئەخوران. بەردە ڕەشەکەی دایکیشم هەر وەکوو خۆی
ڕاڕاو شپرزەو دوودڵ بوو. بێتاقەت بوو نەیئەزانی،
بە کوێ گەییون نامەکان. لەو ساتەدا فەرهادم دی.
وەکوو شەبەقی دەم گەلیی پێئەکەنی. فەرهاد یان مۆم،
ئەمڕۆ مۆڵەتی لە چرای وەرگرتووەو، سبەی شەویش، هەر
لێرەوە لە بەردی بەردستانەوە. بە ڕێگەی هات و نەهات و
بە بەردەمی دێوی سپی و دێوی ڕەش و بە کەناری ئاوی زەردو
ئاوی سوورو ئاوی ڕەشدا، قۆناغ قۆناغ، ڕێی سەفەری
درێژ ئەبڕێ و هەتا دواتر ئەگاتەوە لای منداڵانی شۆڕیجەو
لای زامەکانی پیرێژن!.
من ڕوومتێکرد: فەرهاد ئەزانی ئەو بەردە ڕەشە

دایکمە؟!. ئەویش وتی: منیش لای خۆم هەر
نزیکی ئەشکەوتەکەم. شۆڕەبیەك بۆتە دایکم.
هەموو ڕۆژێ ئەچم بۆ لای دەستەکانی ماچ ئەکەم و
ئەویش بەردەوام سەری خۆی داخستوەو لەناو کۆشی
ئاودا ئەگری. دوێنێ پێموت: دایە بەنیازم
سەرێکبەم لە "گەلاڵە" ئیشێ، کارێ، سابوونێ
شانەیەك، جامێ، کیسێ خەنە؟ هەندێ نوقڵ
بۆ ئەم جەژنە؟. بەڵام سەد ئاخ، چاوی لەسەر
ئاو هەڵنەبڕی و هەر ئەگریاو هیچی نەوت!

★

ڕۆژێکی نوێ بە دوو دەستی سپیەوە لەناو مەملەکەتی
بەرددا. یەکەم پەنجەرەی کردەوە. تیرێژێکی باریکەلەی
زیو لە ملی دەم بە خەندە پرسی بە کەسمان نەکردوو
هاتە ژوورێ. دەربەندەکە باوێشکێکی درێژی داو
بە بەری دەست تەمی سەر تەوێڵی سڕی و زوقمی لە
پێڵوی کردەوەو، کەمێ جووڵا. دوور دوور ئەسپێك
ئەیحیلان و نزیك نزیك تووتەڵەیەك ئەیقروسکان. قەلەباچکەیەکی
کلۆڵ. چاوێکی کوێر، کۆڵوانە ڕەش، لە گوندێکی یەك قاچەوە،
بەو بەیانییە هاتبوو بۆ لای پیرە دارمێوێکی مێوژ فرۆش،
بۆ جەژنانە. لەبەر دەرگای مێوەکەدا لەسەر بەردێك
هەڵنیشتبوو. چاوەڕێ بوو پیرە دارمێو لەخەو هەستێ.
من هەستابووم. بەسەر پێوەو بەرەو ئەوبەر "ڕۆژباش"ێکم

لە بەردە ڕەشی دایکم کرد. ئەویش دەستی بۆ هەڵبڕیم.
شەونم بووبوو بە پوولەکەی بریقەدار هەموو لەشی داپۆشیبوو.
لەو ساتەدا، لەناو ناخما، وەکوو هەستکەم تۆڕێك هەیەو،
تۆڕ ئەیەوێ ماسیەکی ڕۆحم بگرێ، وا بوو. دەستمدایە
ئاوێنەکەم تەماشامکرد: من خۆم بووم و من خۆم نەبووم.
جارێك سەرم ئەبوو بە بەرد. جارێکی تر بە کەللە سەری
بەران و دیسانەوە جارێکی دی بە دەنووك و سەری
تووتی. لە پڕێکدا ئەبوومەوە بە خودی خۆم. ئەو چرکەیە
لەگەڵ نەستم و خواکەی خۆم و خەیاڵێکی شووشەییدا
قسەم ئەکرد. بیری نیشتمانی شیعرو کچە خەیاتەکەی
ئەولاو ڕیشی سپیی هۆمیرۆس و ڤینۆسەکەی ناو ئەلیازەو
بیری بای شین و بای مۆرو دنیای ئەوبەر هزرم ئەکرد.
لەناو دڵی خۆمدا ئەموت. چییان لێهات؟! تووتی و
بەران نەهاتنەوە. ڕەنگە خواوەندێکی تووڕە. لە شێوەی
پیرێژنێکی سەر ئاسنینی دان کەلا. سیحرێکی وای لێکردبن،
لە شاخێکدا بووبن بە بەرد. دوور دوور ئەسپێك
ئەیحیلان و نزیك نزیك تووتەڵەیەك ئەیقروسکان.
لە پڕێکدا، وەك هاتنی لەپڕی مەرگ کە تۆ هەرگیز
چاوەڕێی نیت. وڕە وڕو گرمەگرم و ناڵەناڵێ. شڵەژانێ
لەناو دەنگداو، پەشۆکانێ لەناو ڕەنگداو، ژاکانێکیش
لەناو بۆنی گەلیەکەدا. تێکشکانێ لەناو ڕۆحی شنەبادا،
زراو چوونێ لەناو چاوی وردە بەردو پەلکە گیادا. قرچەقرچێ

له جومگەکانی هەتاودا، هەڵوەشاندنەوەی خەونی ئاو، دابڕانێ
لە نێوان سی و هەناسەدا. شلوێ بوونێ لە سەوزایی دارستاندا و
وێرانبوونێ لەناو ترساو هەڵپچڕکانی تەنیایی و ناڵەناڵێ و لێکترازانی
ماچەکان. خاوبوونەوەو ساردبوونەوەی جووتبوونەکان بوورانەوەی
سەرسام بوون و لەت و پەت بوونی بێدەنگی و، خۆت دە بە دەم گەرداوێکی
قەدەرەوە بۆ کوێت ئەبا: گرمەگرم و ناڵەناڵێ،
وەکوو ئاسمان بە قوببەکانی ئەستێرەو شووشە بەندی ساماڵەوەو
بە دەرگا و پەنجەرەی هەورو بە خانوەکانی فریشتەو بە عەرشەکانی
خوداوە بەسەر مەملەکەتی بەردو بەسەر ئێمەدا بڕوخێ، وابوو.
ناڵەناڵێ، بوولەرەیەك. خەیاڵی شووشەییم شکاو هەر لەوێدا
دوو سێ شیعرم وەکوو کاشی و فەخفوری بن، لە ڕەفەکانی
سەرمەوە بەربوونەوەو کەوتنە خوارێ و وردو خاش بوون.

دوو "تۆبۆلیف"، دوو مردنی کەتەی باڵدار، دوو جەهەننەمی
هەوایی، دوو "تۆبۆلیف"، چواربالْ لە باڵەکانی ئەفسانەی
شەوی داهێنانی مۆدێرن و چوارچاو لە فسفۆری چاوی ئەستێرەی
سووری کرملین!. بیژۆکی[21] سەدەی بیستەمین.
تەڵزمێ بوو، نینۆکێکی پەنجەی قاچی ناپاڵم بوو. بە خێرایی
سەری بردبووە ژوورەوە، ژوورە سپی و ڕووناکەکەی دڵی
فەرهاد. تەڵزمێ بوو بچوك بچوك، بە درێژیی هەر
ئەوەندەی پەنجە تووتەی دەستی سەعدو، بەژنی بەقەد

---

[21] بیژۆك: بەرهەمی نائاسایی. ددان و ئەنگوستی زیاد. حەیوانێ بەر لە کاتی خۆی بزێ.

تەنها دێڕێکی نووسینی "کۆسیجین"و، بە ئەستووریش،
هەر ئەوەندەی لایەك لە قەفی سمێڵی "ستالین" و برۆکانی "بریجنێف".

تاشەبەردە ڕیش سپیەکە. بە قورگێکی گیراوەوە. گێڕایەوە
ـ لەو لایەوە کچۆڵەیەکی دار هەنار پەرچەم سوورو سەرپەنجە
سەوز هەر ئەگریاـ تاشەبەردە ڕیش سپیەکە کەوتە
قسە: لەو وەختەدا، من خەریکی داڵدەدانی کەروێشکێ
بووم، لەو دۆڵەوە سەربەرەو ژوور چەقەڵەکان ڕاویان
نابوو. هەر ئەو ساتە، دەستم بە سەردا ئەهێناو،
بۆ دڵ نەوایی جاربەجار گوێچکەکانیشیم ماچ ئەکرد. هەر لەسەر
بەری دەستیشم هەندێ تووی وشکم ئەدایە. هەر ئەو ساتە
فەرهاد لەگەڵ شەماڵێکی کەسکا، قۆڵیان کردبوو بە قۆڵی
یەکتریدا. دڵخۆش دڵخۆش، ئەو مۆڵەتی وەرگرتبوو بۆ لای
دایکی و، ئەمیش هەر ئەویست سەرێك با لە گەرمییان،
لەو ساتەدا، گرمەیەك و بەرەو ئامێزی من ڕایکرد. بەڵام
سەد داخ و مەخابن، فریا نەکەوت و لێرەدا بەدەمدا کەوت!،
ئەم کچۆڵە دارهەنارەیش یەکەم کەس بوو چووە سەری،
بۆیە ئاوا بەکوڵ ئەگری!.
تاشەبەردە ڕیش سپیەکە، بە دەم هەنیسکی زەردەوە،
قسەی ئەکردو بەردەکان چەند بەردێکی دڵ ڕەق نەبێ
لە جێگەی خۆیان نەجووڵان ئیتر هەموو گەورەو بچووك،
هەر ئەگریان. ژنە درەخت قژی خۆیان ئەڕنیەوەو

"با"ی حەیرانێکیش ئەهات و تاڵە مووی قژی ئەوانی
بە هێواشی هەڵئەگرت و ئەیبردن بۆ ملەی کاوان. ئاو
شڵپە شڵپ لە خۆی ئەداو تنۆکەکان ئەبوون بە پەپوولەی
ڕەش و لە فەرهادەوە ئەئاڵان. برینەکان فوویان ئەکرد
بە ڕیزی قامیشەڵاندا و مەقامێکی گەرمەسێریان زۆر بە نزمیی
بۆ لێئەدان. کۆترەکانیش بە گمەگم قەسیدەیان بۆ
ئەنووسی و ئەیانخوێندەوە لەوێدا سمۆرەکان لەگەڵ خۆیان
گوێزی خەمیان بردەوە ناو کلۆرە دار. باڵندەیەکی ڕەنگاڵە
ڕەنگەکانی خۆی لە قوڕگرت ئینجا چووە لای بەردەکان.
دارسنەوبەرێ ئەوەندە دانەویبوو فەرهاد ماچکات،
لەناو قەدا شکایەوە بە دەمدا هات. دار کونکەرەیەك
لە داخدا، هێندە دەنووکی لە عەرد دا، هەتا دەنووکەکەی
شکا. هەر کلاوی کلاوکوڕەبوو لەو ناوە کەوتبوون و
بەردەکان چاویان پێ ئەسڕین. لەگەڵ فەرهادی عاشقدا،
دوو شینکە بەردی دڵدارو، سێ قامیشی مۆسیقارو،
یەك چۆلەکەی وێنەکێش و، یەك قەلەباچکەی نانەواو،
قومریەکی بێوەژن و یەك بولبولی شاعیر کوژران!.
بریندایشمان زۆرترن: گا بەردێ شانی بە خەستی زامداربووە.
شینە شاهۆیەك بە سووکی باڵی چەپی و دار گوێزێکیش قاچی ڕاستی
تەڵزمێکی بەرکەوتووەو بەڵام ئەوەی جێگەی داخە هەڵۆیەکمان
هەردوو چاوی لە دەستداوەو، بەرانێکیش قەفی قۆچێکی شکاوەو،
دوا هەواڵی سەری گەلیش، شۆڕەبیەکەی فەرهاد کردبووی

به دایکی، وەختێ کارەسات ئەبیسێ، ئەو سەرەی ئەیکا
بە ئاودا هەڵێنابڕێ بە داخەوە تا ئەخنکێ. لە دواییدا
منیش وتم: بەڵام ئەوەی شیوەنەکەی لە هەمووان گەرمتر
بوو، بەردە ڕەشەکەی دایکم بوو!.

★

لەو ڕەوەزانەی سەرەوە. بۆ بەرەو خوار
بە بێ ئەوەی دەنگی پێی بێ
چون هاتنی گوڵی پەموو، وایش بە نەرمیی
ئێوارە هات!.
تەماشایکەن!. پەپوولەی زەرد بە قژیەوەو
جریوەی سوور بە سنگیەوەو، گوڵی ژاڵە
بە دەستیەوەو، پەرچەمێکی زۆر تەنکیش
لەسەر چاوی و، ئێوارە هات!
ئێوارە هات. وەك بێدەنگیی ئەم تابووتەو
وەکو فەرهادی ڕاکشاو. هەموو شت کپ.
هەموو شت مات. لە بەرناشتنی ئەم بەردە باوکە
هەموو بەردە منداڵەکان کڕ بوون
لەبەر ناشتنی ئەم هەورە گەنم ڕەنگەو
بۆ ڕێزگرتن لەم ئازارە. ئاو خوڕەی خۆی
بێدەنگ ئەکاو، ئەیگێڕێتەوە سەرچاوەو،
"با"یش وژە وژی کپ ئەکا نەك گڤەی بێ و
خەم بشڵەژێ.

لەبەر ڕێزی ئەم پرسەیەیش

کەللەی نسێی، سەری کەپوو سوور هەڵگەڕاو

لەم کاتەدا خواخوایەتی هیچ نەپژمێ

تا تابووتی ئەم چرایە تێ ئەپەڕێ.

تەوارێکی بەسەرماکەوتووی دوێ شەویش

هەر خەمیەتی تەرمی ئەم جۆگە کوژراوە

بەڕێبکرێ و لەو ساتەدا ئەم نەکۆکێ!.

★

ئێوارە هات، نیوەی گەلیی تاریکبووەو

نیوەکەی تر، هێشتا ڕووناك

سنەوبەری بەر سێبەری ساردی کاوان

سەرمایانەو ئەلەرزن و فوو ئەکەنە دەستیانەوەو

پشتیان کووڕەو، وەکوو بگرین بۆ ئاگرێ. ئاو بە چاوان!.

بەڵام داری بەر هەتاوی زاری گەلیی

هەتا ئێستەیش بە کراسی بێ چۆغەوە

هەر هەموویان بێباکانە ڕاوەستاون!.

★

ئێوارەیەو دە دوانزەیەك لە عاشقانی بەردستان

شڕۆڵ شڕۆڵ ئەڵێی دارسێوی ڕووتەڵەن.

دە دوانزەیەك لە دەروێشانی دارستان

برسیی برسیی ئەڵێی ڕیشۆڵەی بێدانن.

دە دوانزەیەك لە یارانی بەفرو باران

تەزیو تەزیو ئەڵێی مامزی کەسیرەن.
یەك لەدوای یەك، لە ڕیزێکی هەڵوەریودا،
بەڕێی هەناسەی باریکی دەربەندێکدا شۆڕ ئەبنەوە.
بۆ دارە مەیت خستنە سەر شان
چوار چوار ئەیکەن بە دوو نۆرە
تا بگەنە گۆڕستانە بچکۆلەکەی "بۆکریسکان"
★
دائەگەڕێن و تەماشای واق وڕماوی هەرچی شتە
ئەمبەر ئەوبەر. دار بن بەرد بن، تەیرو تواڵ و ئاژەڵ بن
قازوو قولنگ بن لەسەرێ و مارو مێرو بن لە خوارێ
لەسەر تەرم و شانی ئەوان لەنگەر ئەگرن!.
★
وەختێ تابووت ئەگاتە بەردەمی ڕەزێ
لە سەرەوە بۆ خوارەوە لە ڕەش و سوور
ڕەزی گریاو. بۆڵ بۆڵ فرمێسك هەڵئەڕێژن
هەتا ناو ڕێ و هەتا بەرپێ.
★
وەختێ ئەگاتە نزیکی دارگێلاس و دار بەلاڵووك
درەختەکان بە یەکدووجارێ سنگ کوتان
بەژنی تابووت ئاڵ ئەکەن و قژی زەردی
هەندێ ڕووەك ڕەنگ ئەکەن و ئەیکەن بە سوور!.
★

لەو مێرگەوە بەرەو دەربەند پۆلێ ڕیشۆڵە بە نزمیی
هەڵئەفڕن و خەریکن سنگ بدەن لە عەرد.
لە ناکاوێ بەرز ئەبنەوەو بە یەکدا دێن، جارێکی تر
کۆ ئەبنەوەو چڕ ئەبنەوەو هەتا ئەبن بە چەترێکی
ڕەشی گەورە لەسەر تابووت. دیسانەوە جارێکی دی
نزم ئەبنەوە هەتا لای گوێ و بە هێواشی پێمان ئەڵێن:
ئای کە تەنیان!

★

چون ڕوومەت و لێوی فەرهاد زەردەپەڕێکی زۆر کاڵەو
دارەمەیتێ، بە خەفەتێکی زۆر لێژدا دائەگەڕێ و
لە پێچپێکی کەوانەیی ناو دەربەندا، تەم و مژێ
وەك بێوارە[22] هەر لە خۆوە پەیدا ئەبێ و لەبەر
دەمدا، لە پڕێکدا، هەڵئەتۆقێ و
قوتمان ئەداو، سەرنج کورت کورت ئەکاتەوە
هەتا بەر پێ. لەو ساتەدا وا هەست ئەکەم
دوو کەسیتر شانبەشانی گریانەکەم. هەنگاو ئەنێن و
غەمبارن. لەولامەوە کۆترە ڕەشەکەی "ئیسکان"و
لەم لامەوە کچە خەیاتی دراوسێ. ئەویان دەستێکمی
خستۆتە، سەر دڵی خۆی. ئەمیان سەری لەسەر
شانمە، زۆر بە ئەسپاییش ئەو ئەڵێ "ئای
کوڕەکەم! چەند بێکەسن!" ئەمیش ئەڵێ "ئای

---

[22] بێوارە: غەوارە، بێگانە.

ڕۆحەکەم، چەند ڕووتەڵەو چەند بێبەرگن!"

★

بۆ سەفەری بەرەو لای دەربەندی گریان. کزەبایەکی
سەوزەڵە لە نیشتمانی بەفرەوە. ڕێ ئەکەوێ
کزە بایەکی قژخاوی پێست تەنکی لەش بلوورینی
قەد باریك. لە دوای قەیرێ بە قژوپرچی تەڕەوە،
ئەگاتە سەرسەری ئێمەو، لە کەژاوەی غەمگینەوە،
زۆر لەسەرخۆ دائەبەزێ و دەستی تەزیو درێژ ئەکاو
پەتوو لەسەرسەری فەرهاد لائەدات و، فەرهادیش
وەکوو نووستبێ. دەم و چاوی منداڵانەی دەرئەکەوێ
کزەبا تەختی تەوێڵ و چاوی نوقاو ماچ ئەکات و
بە پشتاوپشت ئەگەڕێتەوە بۆ دواوەو. بەر لەوەی
جێمان بهێڵێ، پێمان ئەڵێ: "ئای عاشقان!
لەناو وڵاتی خۆتاندا چەند غەریبن!"

★

لە گڵی ڕەشدا چاڵێکی هەڵکەنراوو، لە بنی چاڵدا تۆپەڵێ
کرمی سپی و، بە چواردەوری گۆڕیچەیشدا، دە دوانزە
دەروێشی بەردو، لە بەرەو ژوور، گوندێك لەناو
نەخۆشیدا ئەناڵێنێ و گوندێك لەناو بێدەنگیدا پاڵیداوە
بە گردێکی کەساسەوەو، دوو هەنگاو لەولای منەوە،
مەلایەکی بێتاقەت و چاکەت دڕاو، لەسەر چیچکان
دانیشتووەو تەلقینێکی دەست خەت بڕو وشە شاشی

فرمێسکاوی بە دەستەوەو، لەولایشەوە دارە مەیتێکی دانراو.
تۆزێ دوورتر، پیرەمێردێ، لە پاڵتۆیەکی عەسکەری قۆپچە
زلدا، خۆیداوە بەسەر گۆچانداو جاربەجارێ دەستێك
بە ڕیشیا ئەهێنێ و دوور ئەڕوانێ. لەسەر بەردێ گەماڵێکی
لووز ڕەشی، هەردوو چاوی نیوە نوقاو، هەڵئەمیزێ و،
منداڵێکی پێخاوسی داسك و دەرزیش جارجار مشەیەك
ئەکات و بەسەر قۆڵی کراسەکەی کەپوی ئەسڕێ. لە ئاسمانێکی
ڕووگرژی ڕەنگ فافۆنی و بێزاریشدا، پەڵە هەورێکی زۆر قورس،
بەڵام نزم، "با"یەکی حووچ بە هەموو هێزی خۆیەوە،
لە پشتەوە بە نیخەنیخ، توند توند پاڵیپێوە ئەنێ و،
بەرەو خوارێ ئەیرەتێنێ، بەرەو سەر ئێمەو گۆڕستان.
ئیستە ناو دارەمەیت چۆڵە، جگە لە پەتووی گرمۆڵە،
چاوم لێیە ئەویش بۆ فەرهاد هەر ئەگری. لەسەری
مامە ڕووتەوە، گرمەیەك و هەورێك تەقی و هەور
پژاو هەور ڕژاو، بارانێکی شڵەژاوی لە بەرۆکەوە
چەخماخە سەر بەرەڵڵا بە پڕتاو هات. تەپ و نمی
بە قەد دەنکی کۆستمان گەورەو، دارژانی کۆتەڵەکەی،
هێندەی لووزەوی قایمی ئەم دووماتە[23] لە ڕۆحماندا بە گینگڵ و
تافە تافە. بارانێ هات. نەك بە تەنها هەردوو چاومان
هەموو چاوەکانی دیکەیش، چاوی پەنجەکانی دەست و،
چاوی قەڵەمی گیرفان و چاوی قۆپچەی کراسمان و

---

[23] دوومات: بەڵاو کارەساتی گەورە.

چاوی هەردوو گۆی سەرسنگ و، کەپوومان و،
کڵاومان و ڕیشاڵی جامانەمان و هەموو لەگەڵ
ئەودا گریان!. بارانێ هات، سێ ڕیز سێ ڕیز
جلی ئاوی و جلی پرسەی ئاودامانی بۆ دروووین و
کردیە بەرمان. بارانێ هات، ئەمجارەیان بە
دەنگی شەست و ڕەهێڵەی گرمەژنی شیوەنەوە
پێی ئەوتین: ئەی عاشقانی بەردستان! ئەی دەروێشانی
بەردستان! لە دنیادا چەندە تەنیان. چەند بێکەسن
چەند بی داڵدەن. چەند بێ ماڵ و چەند غەریبن
ئەی عاشقانی بەردستان!.

⋆

شەو دەستی گرتم و بردمیەوە ئەشکەوتم،
شیعرەکان سەرتاپا تەڕ بووبوون. وشەکان وەك
گەڵای داروبار، گژوگیا، بەردەکان، تەڕ بووبوون.
سەرلەنوێ بە چیلکەو چەوێڵی ڕابوردوو ئاگرێکم بۆ
سبەی لە ڕۆحما کردەوە. تۆزێ دوور بەرامبەر
ئاگرەکە ڕامگرتن، شەوقێکی لیمۆیی لێیداین و
دایپۆشین. وشەکان کەوتنەوە جوڵان و لەسەر ڕێی
خەیاڵی تازەدا بزووتن. دوای ئەوەی شیعرێکیان
بە لەشما هەڵزناو گەیشتە لای گوێچکەم پێی وتم:
ئەبینم هەگبەکەت داناوەو ئامادە. بە نیازی
سەفەری؟! ئەمجارە لەگەڵ خۆت بۆ کوێمان ئەبەیت و

کام دنیای تازەمان ئەگێڕی؟!. من پێموت:
ڕاست بۆی چوویت. سەفەرەو بەرو خوار. هەتاکوو

سەر گۆیژەو نزیکی قەراغ شار. گەر بشلوێ،
بە ڕێگەی نەهێنیی (با)یەکی دڵسۆزدا جێی بڕوا،
چون بادە پاکەکەی لای نالیی، سەرێکی
شار ئەدەین. ئاخ ئێوە نازانن، چەند بیری
کۆترەکەو کچەکەی دراوسێی "ئیسکان"و چەند
بیری دوا بۆنی ماچەکەی ئەو ئەکەم!

★

فانۆزی هیلاکی ئەشکەوتم، خامۆش بوو. کزکزکز،
هەر بەحاڵ تیلماسکێ لە تیشکی تاڵەمووی زەردباوی
تیا مابوو. تا سەر جێم ئەهات و نەئەهات.
خەوتووم و نەخەوتووم. بێئاگاو بە ئاگام.
وەك ئەوەی لە نێوان دوو دەستدا دامابم.
یەکێکیان ڕامکێشێ بۆ سەرێ و ئەویتر بۆ خوارێ.
ئەمبینی لەت ئەبووم. ئەمبینی لەتێکم جێمدێڵێ و
ئەویتر هەر لەسەر پێخەفە. بە کەرتی ڕاکردووی
خۆم ئەوت: تۆ لەتی ڕاستیمیی یان ئەمەی
سەر جێگە؟!. یەکێکم و دووانیشم. کامیانم؟!.
لێرەم و لێرەیش نیم. خەوتووم و نەخەوتووم.
ئەمبینی خۆم نیم و تارماییم. ئەبینم و نابینم. ئەوەتا

نایلۆنی سەردەمی دەلاقەی دیوارم، هەڵتەقی و تووتیەکە
هاتەوە ناو ژوورم. هاتە سەر هەمان تەنەکەی پشت سەرم و
نیشتەوە. بە قەد من ماندوو بوو. پێکەنی و پێکەنیم.
هەڵسام و لە دۆلکەی چاکەمدا ئاوێکی غەمگینم بۆ هێنا.
دەنووکی تێخست و یەك بینە هەر هەمووی خواردەوە ئینجاکە
دوو باڵی ڕاوەشان. لێم پرسیی: دیار نەمای لە کوێ بووی؟!
هەر هەمان مەملەکەت، هەر لە لای ڤینۆس و هۆمیرۆس؟!
ئەی بەران؟! پێی وتم: نا نا نا، ئەمجارە "خانی" مان هەڵگرت و بردمانە
لای زین و لای مەم و ناو خەونی هەرێمی بەفرستان. جێت
دیار بوو. بەرانیش لە دەرێ وەستاوەو چاوەڕێی ئێمەیە.
لێم پرسیی: بەرەو کوێ؟! پێی وتم: پێش تۆزێ
کزەبای ناو شیعرت پێی وتین بە نیازی سەفەری بەرەو خوار!.
بۆ ئەوێ و ئەمجارە هەر خۆیشت دەلیلی!
من پێموت: تا گۆیژەو قەراغ شار. زیاتر نا. ناچینە
شارەوە. ئەترسم دووچاری بەڵا بین. خۆ مەگەر
(با)یەکی زۆر ڕاستاڵ ڕێگەمان نیشاندا. هاوڕێ!.
تەنیام و تەنیاییش خەریکە بمکاتە بەردێکی ئەم ناوەو
بێزاریش بە دەنووك ناو ڕۆحم بکۆڵێ، جیا لەوەیش،
زۆر بیری ئەو کۆترە ڕەشپۆشەی ئیسکان و ڤینۆسی
خەیاتی دراوسێ و زۆر بیری ڕەفەکە و ژوورەکەی خۆم ئەکەم!
دوابەدوای قاقایەك تووتیەکە وتیەوە: تۆ چیتە؟!
شیعرێکی زۆر وڕی. چ کارمان بە (با) یە دڵسۆز بێ یان

نەبێ. نازانی. بەرانی باڵدارمان لەگەڵە؟! ناتەوێ
لە حەوشەی ماڵەکەی ئەو کۆترە ڕەشەدا دابەزی؟!
وای وت و هەگبەکەم هەلگرت و کردمە شان. شیعرەکان
داچڵەکین. شیعرێکی منداڵیان، ویزەویز، خەریکبوو
لە هەگبە بێتە دەر. زنجیرم ڕاکێشاو کەوتەوە ناو هەگبەو
بێدەنگ بوو. فانۆزم بە ڕەنگی زەردەوە دەستێکی
باریکی هەڵبڕی. ماڵئاوا. کە چووینە دەرەوە،
لە بەردەم بەرگێلەی نسرما. بەرانی باڵدارمان شپرزە
وەستابوو. لاملی تێهەڵسووم. بە گاڵتەیش قۆچێکی
لێدام و پێکەنی. ڕوومکردە توتیەکە: ببوورە بەر
لەوەی بەردستان، دەربەندی عاشقان، جێبێڵین
من ئەبێ سەرێکبەم لە بەردە ڕەشەکەی دایکم و باوەشی
تریفەی دوا شیعری پیاکەم و وەك باران ماچیکەم.
بە پەلە، چون، ڕێو ڕۆی، ئەستێرە لەوەختی کشاندا،
یان پەڵەی هەورێکی تەتەری نێو شاخان، کە نامەی
چەخماخە، بەرێ بۆ، خواوەندی باو باران. گەیشتمە
بەردە ڕەش، باوەشم پیا کردو، گریام و چەند
تاڵێ لە قژی شیعرێکم لاجێهێشت. هاتمەوە،
توتیەکە لە پێشدا لە نێوان دوو قۆچی بەراندا هەڵنیشت و
ئینجا من بە هەگبە و قەسیدەو مەراق و بە دوو چڵ
هەتاوی یادەوە سوار بووم و بە ڕێگەی هەوایی
ئاسماندا، بە ڕێگەی خەونێکی زۆر بەرزی سپیدا،

**خاوو تیژ، خەم باریك خەم بەرین، بەرەو شار،**
**بەرەو لای کۆترێکی بێوە ژن، بەرەو لای ڤینۆسی**
**خەیاتی دراوسێ هەڵفڕین!.**

سلێمانی
2004⁄11⁄27

# وتەیەکی پێویست

خوێنەری هێژا:

بەرلـەوەی ئـەم تێکـستە والآیـە بخوێنیتـەوە، بـە پێویـستم زانـی لـەوە ئاگـادارت بکەمـەوە، کـە لـەم بەرهەمـە تازەیەمـدا. ویـستومە لـە یـەك کاتـدا شـیعر و چـیرۆك و پەخـشان و شـانۆنامە، هەریەکـەو، بـە خاسـیەتە دیارەکـانی خۆیانـەوە، لەگـەڵ یـەکتردا کۆبکەمەوەو یەك تەوەریش یـان یـەك بیرۆکـەیش، لـە سـەرەتاوە تاکۆتـایی، هـەموویان، وەك پەت و دەنکەکانی ملوانکەیەك پێکەوە ببەستێتەوە. واتە ئەم بەرهەمە، یەك ژانر یان یەك هونەر لە خۆ ناگرێ. لە هەندێ شوێندا شیعر ئەبینی و لـە هەنـدێ جومگـەی تردا پەخشان و لەبەشێکی تردا چیرۆك و لەهەنـدێ ئاسـتی تـردا شـانۆنامە و تەنانـەت ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەوانی و دیالۆگی ئاسایی و قسەی ڕووتیشی تێئەکەوێ، بەلآم دیارە بـە گشتی فـەزای زاڵ و وێنـەی زاڵ زمـانی مـەجازی شـیعر و سـەبك و خـەیاڵی شـیعرییە. سەرئەنجامیش بەیەکگرتنەوەو یان بە کۆبوونەوەی هەموویان جۆرێ لە ڕۆمان دروست ئەبێ!. گێڕانەوەو سەردی شیعری شێوازی دیاری ئەم دەقەیە. ئەوەندەی من بزانم، بەم فراوانییەو، بەم شێوە درامییەو بە کۆبوونەوەی تایبەتمەندیەکانی هـەر هونـەرێك لـەو هونەرانەو بزوتنەوەیان لەسەر تەوەرێك و لە یەك تێکستی ئەدەبیدا، پێشتر لە ئەدەبی ئێمـەدا نـەبووەو نەنووسـراوە، بـۆ ئـەدەبی دەوروبـەرو جیهـانیش دڵنیـا نـیم و نـازانم، ئەوەیان بۆ ڕخنەگران بەجێئەهێڵم. هەروەها بیرۆکەی سەرەکی تێکستەکەیش تازەیـەو ئەوەندەی بۆ خۆم ئاگادارىم لەمەوبەر لە دەرگای نەدراوە! بەلآم لـە هـەمان کاتـدا، ئـەم کارەیشم درێژەدانە یان هەوڵێکی پترە بۆ گەشەپێکردن و بەرەو ژوور هەڵکشانی هەمان ئەو ئەزموونـەی کـە لـە دەمێکـەوە لـە گەڵیـدا هـاتووم، واتـە کـارکردن و هەڵکەنـدن لـە یـادەوەری و زاکـیرەی کـوردو مێژووەکەیـدا. جـا لـە ڕێگـەی خوێندنـەوەی جوگرافیـای

هەموو نەخشەكەوە بێت یان لەڕێی زاكیرەی شارێكەوە، وەكو لەم دەقەدا دەرئەكەوێ و شان بەشانش تێكەڵ بە بیرەوەری و زاكیرەی تایبەتی خودی خۆیشم ئەبێ. لەلایەكی تریشەوە (21) وشەی تازەیش كەوتوونەتە ناو لاپەڕەكانی ئەم بەرهەمەوە، كە پێشتر تەنها لە دووتوێیی قامووسەكانماندا بوون، لە فەرهەنگەكانی مامۆستایان "هەژار و زەبیحی و شێخی خاڵ و گیو موكریانی"دا بینراون و بەس. نەچوونەتە ناو دەقە ئەدەبیەكانەوە، بۆ خۆیشتان ئەزانن لە "دەربەندی پەپوولە"وەوە لە سەرجەمی بەرهەمە درێژەكاندا و تا ئیستە لەم وشە بژێریانەدا كارمكردووە.

بەڕێزینە!

زاكیرەی ناو ئەم بەرهەمە، سەردی شیعری و هونەری ناو ئەم تێكستە، تەوەرەكەی شاری سلێمانییە، بە واتایەكی تر، چەند جومگەیەكی پێكهاتەی مێژوویی ئەم شارەیە، یان یادەوەری و ئاوێنەكانی ژیانی خۆمن. ئاشكرایە شوێن و ناو لە تەواوی بەرهەمەكانی مندا ڕووبەرێكی فراوانیان داگیركردووە. ئەوەی ڕاستیبێ، من بەبێ سێ كوچكەی سورشت و ناوو شوێن ناتوانم بنووسم. بۆیە ئەشێ هەندێك لەو ناوانە، تەنانەت لای ئەوەی نوێی شارەكەم و دەرەوەی سنووری كۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی ئەم مەڵبەندە، نەناسراو بن، یان لای ئەوانەی تەمەنیان زۆر لە خوار منەوەیەو لە یادەوەری ئەواندا نەبن. بۆیە بە پێویستم زانی جگە لە ناوە زۆر ناسراوەكان، ئەوانیدی، پەراوێزی ڕوونكردنەوەیان بۆ دابنێین!.

شێركۆ بێكەس

سلێمانی: 2005/6/25

منی نووسەری ئەم دەقە، دێرزەمانە،
لەم شارەدا، چون "با"یەکی شێت و وێتی
پێخاوسی شەرواڵ دڕاوی سەرگەردان،
دێم و دەچم و، جارێك ئەبم بە شیعرێکی

مەست و سەرخۆشی مەیخانەو، جارێکی دی،
بە چیرۆکێکی کۆماوەی ناو خەڵوەتێکی سۆفیانەو،
یان بە گوناهی بێدالّدەو، یان بە پەخشانی
بێ ماڵی ئەو دەشتانەو، یان بە شانۆی
گەڵارێزان. تەنیاییشم قەلەباچکەیەکە لاواز،
مل ڕووتاوە، هەموو ڕۆژێ، لە چایخانەیەکی
بچووکی هلمدودا[1]، لەسەر کورسییەکی ماندوو،
لەسەر کورسییەکی تاکی، گۆشەگیری، بە ساڵاچوو،
هەڵئەنیشێ و دائەنیشێ و دەستی
مەراق ئەخاتە ژێر چەنەی یادو یەك لەدوای
یەك، وەکوو سیگار، تەم ئەکێشێ و،
کورسی ئەکەوێتە قسەو، دووکەڵیشم بەزمانی
خۆڵەمێشی، لەسەر دەرگا بێ یان دیوار،
لەسەر عەردبێ، یاخود لەسەر جەستەی ڕێبوار.
هەرچی ئەو بیڵێ ئەینووسێ!.

★

کورسییەکی کورتەباڵای بەتەمەنە و
ئێسك سووك و تەوێڵ پان و
دەست باریك و ناوشان تەنگەو
بەڵام هێشتا وریاو قنجەو
قاچێکی کەمێ ئەشەلێ و

---

[1] هلمدو: شێ و تەڕایی زۆر

بەڕەنگ و ڕوو زەردەڵەیەو
قژ ڕووتاوەو، وەلێ تەندروستی تەختەو
جومگەکانی گەلێ باشە!
کورسییەکی شپرزەیەو خەیاڵاوی.
هێندەی تەپڵەکی جگەرەی پڕ لە سووتوو
بێتاقەتەو
کاتێ سەرنجی لێئەدەیت
ئەڵێی هەورێکی بچکۆلەی
دلگوشراوی سەر سەیوانەو
تەمێك کەوتۆتە سەردیدەی.
کە گوێشت نا بەسنگیەوە
وا هەستئەکەی
دەنگی ڕۆحی وەکوو جەستەی
هەڵئەقرچێ و بەردەوامیش
وەکوو بڵێی لە جۆلانەی ئاگردایە.
ئا ئەم کورسییە شپرزەیە
ساڵەهایە نیشتمانی
ئەم چایخانە بچووکەیەو
خەیاڵیشی وەکوو دووکەڵ و خۆڵەمێش
لەناو گێژەی بێ ئارامی سەماوەرو
لەهەڵمێکی ڕەنج بە باچوو،
یان لە ڕەشایی تەمەنی

وەجاخدایە!
ئەم کورسییە
بە ڕەچەڵەك
کوڕی کوڕی
دارگوێزێکی نەقشبەندیی بەناوبانگی هەورامانە.
باپیرە گەورەی وەختی خۆی
پەیکەرتاشی سەر تەختە بوو
هێندەی باران دەست ڕەنگین و
هێندەی کەوێڵی ڕوو لە (با)یش
بە ئامۆش[2] بوو
ئەگێڕنەوە:
ئەم باپیرە پەیکەرتاشە
بۆ زەماوەندی سەرداری ئەردەڵان و
خاتوو ماه شەرەفی ژنی
لە پارچەکانی جەستەی خۆی
هەر بە دیاری
تەختەی یاریی، شەترەنجێکی لەش قاوەیی و
دار سیگارێکی درێژی بۆ سەردارو
لەگەڵیشیا
چەند شانەیەکی نایاب و
کلوێچکێك و

---

[2] ئامۆش: ئارام. هێور.

باوەشێنێکی نازدارو
جووتێ قاپقاپی جوانیشی
بۆ ماه شەرەف، بۆ "مانگ"ە کەی
میر ناردبوو.
ئەگێڕنەوە
وەختێ ئەم دارگوێزە ئەمرێ و
یەکەم دنیای خۆی جێدێڵێ
دار نامێنێ و گوڵ نامێنێ و تا قامیشی مۆسیقارو
یان دارکونکەرەی "نەحات" و
پەلکەڕەنگینەی شێوەکار، هیچ نامێنێ
لە کۆتەڵیا، هەموو هەموو، وەك هەورامان
بەکوڵ نەگرین!.
ئەگێڕنەوە
کە ئەچێتە ئەوەو دنیایش
لەسەر چۆمێ و لە نێوانی دوو ئاوایی و
بۆ ئەو خەڵکە
ئەبێ بە مورەغەی پشتی
گەورە پردێ!.
بەڵام ئیتر
گەمەی زەمان ئاوەهایە
وا ئەمێستا نەوەکەیشی
لەم چایخانە بچووکەدا

کەس نایناسێو
بزمارە ژان لەناو سەریا پل ئەدات و
چون وەرەسبوونی تەمەنیش
پێڵوەکانی لە باپێچی وەنەوزدایە.
کورسییەکی بێ ئارامە
هەندێ جار جێگە ئەگۆڕێ
لەم سووچەوە بۆ ئەو سووچ و
لەمبەرەوە بۆ ئەوبەرو
بەڵام هەرگیز
نە ئەچێتە سەر شەقام و
نە ئەڕواتە ناو بازاڕو
تەنها لەشوێنی خۆیەوە
ئەڕوانێتە دەوروبەرو، لەبەر ژیان و مانەوەیش
باوەشیشی بۆ هەموو کەسێ والایە!
لەسێبەردا پێستی تەڵخ و کزۆڵەیەو
چاوی کزتر. لە هەتاودا پێستی گەش و هەر بە وێنەی
پیاڵەیەکی پشتێن زەرلی پێئەکەنێ و هەروەختێکیش
شیعری لەسەر دابنیشێ ئاسوودەیە. لە کرێوەو
بەفرانباردا، دەستەکانی بێدەسکێش و، قاچەکانی
بێ گۆرەوێو، هەر بە تەنها دۆشەکڵەیەك لە
نووکە دەرزی ناو سەرما ئەیپارێزێ و نە سکاڵاو

نە داخوازیو نە تووڕەبوون و بۆڵەبۆڵ هیچی نییە!
تەنها شتێك كە ئەم لە دڵیا گرێیە
لەم شوێنەدا، ژن ناناسێ و
ڕۆژێ نایەنە باوەشیو
هاوڕێی لەناو ڕەگەزە نەرم و نۆڵەكەی
تردا نییە!.
بەشەو هەر خۆی و چەند تاكێ لەو كورسیانەی دەوروبەرو،
قەنەفەیەكی عوسمانی فێست لەسەرو، ئەسكەملێكی ڕاكردووی،
خۆ گۆڕیوی خەڵكی سنە ئەمێننەوە. لەناو یەكدا
حیكایەتی ژیانیان و ڕابوردوویان، لە ڕەگەوە، لە بنج و بێخی
دایكەوە یان باوكەوە، لەگەڵاكانی دڵداری و لە هەزنەكانی[3]
خەزان و، لە بڕینەوەی جەستەیان، بۆ یەكتری ئەگێڕنەوە.
هەموو شەوێ یەك لە دوای یەك ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی
كە لەسەریان بەجێماون ئەیخوێننەوە.
ئەم كورسیە نەجیب زادەیە
لەو وەختەوە لە شاردایە
هەزاران كەسی ناسیوە.
چەند گوڵمەزو چەند ئاشووب و چەند دوكان و
چەند ماڵان و چەند گەردەلوولی زەمان و
گێرمەوكێشەی ڕەنگ و دەنگ و
هەڵگرتن و داگرتن و چەند ئاشێوو[4]

[3] هەزن: ئازار

دەرکردن و فڕێدانی دنیای دیوە!
لە شەوێکی سپی و کپی زستاندا بوو
کورسی غەمگین گێڕایەوە:
من ڕۆژگاری بنەتۆوی و زۆر ساوایی خۆم بیرنییە!.
بۆ نەژادی هەرە دووریش ڕەنگە باهۆزێ سەر
خێڵ و یان شەپۆلی گەورەی چەمێ نەنکە هەرە
دوورەکەم و یان لە ئەسڵا هەر گڵمتکی پەنابەردێ
یەکەم کەسی مێژووەکەم بێ!.
بەڵام کاتی نەونەمامیم
دوو یادگار وەك دوو هۆرم[5]
لە هەناوی ئاوێنەکانی خەیاڵما ماونەتەوەو
لەیاد ناچن.
زۆر باریك بووم، لاواز لاواز
لە هەفتەیەکدا دووسێ جار
"با"یەکی خوێڕی ناوکەندێ قڕپوشاوی
دەنگ زیقەڵە، (با)یەکی حیز
کە لەبەر دووکەڵی جگەرەی دارکەنێکا هەڵئەهات
نەی ئەوێرا نزیکی ئەو سەر دەربێنێ
کەچی بە من وا فێر بووبوو
هەموو جارێ، لە ملەوە ئەیگرتم و

---

[4] ئاشێو: دەردو بەڵاو بەسەرهاتی ناخۆش.
[5] هۆرم: خەون لەناو خەوندا.

به جۆرێ ئەیچەماندمەوە

تا سەرم بەر عەرد نەکەوێ

دەست هەڵنەگرێ!

من دڵڕەقی ئەو (با) خوێڕیو ترسنۆکەم

قەت بیرناچێ.

بەڵام پەپوولەیەك هەبوو

ڕەنگی ڕەشێکی قەترانیی

باڵی کوتراو بە وردە خاڵی زۆر سپی

ناسك.. ناسك

هەموو جارێ بەیانیان زوو

هەر دوای گەیشتنی شەونم ئەویش ئەهات

بەبێ چرکە، گۆپکەم هەستی پێنەئەکرد

لەسەر شانم ئەنیشتەوە

ـ بەیانیت باش!

ـ بەیانیت باش!

ـ هەواڵی ڕەز؟ هەواڵی باخ؟!

ـ هەواڵی ئاو؟! هەواڵی دارو دارستان؟!

لێم ئەپرسیی.

ئەویش هەموو جارێ ئەیوت:

ـ مادام ڕەشەبا نووستوەو تەور ونە

دنیا باشە!

جارێك نەبێ

وەختێ کە هات

شڵەژابوو، لە تاواندا، باڵی گیربوو لە ڕیشاڵم

یەکەمجار بوو گوێم لە نووزەی پەپوولەبێ!.

یەکەمجار بوو من پەپوولەیەك ببینم هێور نەبێ!.

وتم: چییە؟!

وتی: لە ئاواق[6] و لە ناو لم و خۆڵ و لە وڵاتی عوجاجەوە

لەو خوارەوە، حوشتر خۆرە، عاگول بەسەر

بە هەزاران ڕەشەباوە، گەیشتوون و،

هەرچییەك باڵایکردبێ

لە شێوەی ملوانکەیەکدا

یەك "بسم الله" ی ئەکەنە مل

ئینجا ئیتر ئەیبڕنەوە!

بەداخەوە ئەوە دواجار بوو پەپوولە

ببینمەوەو نەشمزانی چی بەسەرهات؟!

لە منداڵیما من خۆشیم

نە لە ئاوو، نە لە هەواو

نە لە هەتاویش نەبینی، ئەتوت پەلکێکی هامووتام[7]

بۆ خۆیشم لەوە تێناگەم چۆن گەورەبووم!

کە وەختێکیش هەرزەکاریم بریق وباق

سەوزیکردوو

---

[6] ئاواق: چۆڵی و بیابان.

[7] هاموتا: بێ سەروشوێن.

لەبەر پەنجەرەی گەلاوە قژ بە ئاونگ

کەوتمە چاوبڕکێ لەگەڵ کچ

کچە دارسێوی دراوسێی مەمك قوتی

لەش سپی و سۆڵ.

کچە گێلاسی سوخمە ئاڵ،

گوێ بە گوارەی کەسك شۆڕی

هەتا سەر ڕنووی شان و مل.

یان کچە قۆخی عەیاری، تۆزێك بەحاڵ

موو لەژێر چەناگە هاتوو

یان کچە قەیسی، شان سووتاو

لەبەر هەتاو..

ئەوسا ئیتر بووم بە گەڕەکی مانگەشەو

بۆ دڵداران

بووم بە کۆلانی دەرنەچووی ماچی وێڵ و

بووم بە سێبەری سەرخۆشی لارە لارەی

دوای ڕامووسان و ڕاکشان!

لەو دەمەدا ناوقەدم ناوقەدی هێزو

گوڕەی ئارەزووم لە لقما گڤەی تەڕ تەڕ

وەکوو بارِژن بکەن گەلأم بە هەزار دەم.

یان ئاوێنەبم بۆ قاقای ڕووبارو چەم

دارە مێینەم ئەبردە ناو تەلان و

لە تێئالأنی شەوگاردا

پەنجەی دەست و پەنجەی قاچ و
چاوەکانمان، دائەگیرسان
ئەبوون بە شەم!.
چەندە قومری. چەند کوکوختی. گمەگمیان بۆ یادگار
بە دڵمەوە هەڵئەواسی.
چەند هەسارە. بەپیتەکانی جریوە
شیعریان لەسەر چڵ و گەڵای من ئەنووسی.
لە سەیراندا، باسکەکانم، بۆ دیلانێی کچانی شار
ئارام ئارام ڕائەگرت و هەتا گوژمیان
گەرمتر و زیاتر بوایە.
هەتا جوانیی
بۆ بەرەو ژوور هەڵبفڕیایە
من خێراتر ڕامئەژەنین.
بیرم نەبوو! باوکم گێڕایەوە وتی:
تۆ هێشتاکە لە قوماتەی گەڵادا بووی
کە دایکت سێڵاوێ بردی
دایەنێکی دار هەنجیرمان بۆ هێنایت و
شیری دایتێ هەتا نەمری!.
باوکم ئەیوت:
لەو دار هەنجیرە دوو برای شیریت هەیە
بەداخەوە لە (جاسەنە) یەکێکیان فڕۆکە کوشتی و
ئەویتریان ڕوویکردە "هانە گەرمەڵە"

لەدواییدا کچە دارگوێزێکی هانی
من ئەگەر لەسەر زەین بم
"ئەحمەد موختار"
ئەبێتە کوڕی نۆبەرەی ئەو خانمە!
باوکم گێڕایەوە وتی:
دوای مەرگی خاتوون عەنبەر بوو
لە هەڕەتی چڵ و لق و گەڵادا بووم
هاوینێ بوو، جارێك مەولەوی ڕێی کەوتە
بن سێبەرم
غەمگین.. غەمگین
هەر کە لەسەر بەردی بەر دەرگاکەم دانیشت
وەختێ دەستیکرد بە نووسین
دوو دڵۆپ کەوتنە سەر کاغەز
بە دوای ئەودا
ئیتر هەرچی چاوی پەلك و گوێزم هەیە
دارژان و کەوتنە گرین!
باوکم لە زمانی باپیرمەوە ئەیوت:
ڕەنگە درەختی وا هەبێت، لای خوای دارتاش
بۆ نموونە بەشی بیست شتی تیا ببێت، بەڵام تەنها
یەکەم بەشیان، کرا بەچی، هەر ئەوەیان ڕۆحی
مانەوەی تیا ئەبێ و، ئەوانیدی، پاشماوەکان،
بکرێن بە هەر شتێکی تر، هەر جەمادن!.

هەموو جارێ باوکم ئەیوت:
ئێمەی درەخت و دارستان
یەکەم خواوەندمان سروشتەو
دووەم خواوەندیشمان دارتاش!
یەکەم خواوەند گەورەمان ئەکا بۆ دووەم
دووەمیشیان لە دارەوە ڕۆحێکی تر
ئەکا بە بەر تەختەمانداو
تەختەیش ئەبێ بە هەزار شت!
وەختێ باوکم ئەم قسانەی بۆ ئەکردم
بۆ خۆی بوو بوو بە کۆڵەکەی ناو مزگەوتێ!.
ئەوەیش دووەم ژنی باوکمە باوەژنمە
بووە بە کۆتەی قەساب و
ئەوەیش پوورمە بووە بە تەختەی نووسین و
لە ژووری پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵەدا
هەڵواسراوە. ئەوەیش ماممە بووە بە ڕەفەی دوکانێ و
هەر گوێزەکانی لەشی خۆی لەسەر پشتی دانراوە.
ئەوەیش خاڵمە لە ماڵێکدا بووە بە پەنجەرەی ژوورێ
ڕوو لە هەتاو. ئەوەیش خوشکە بچکۆلەکەم، ئاوڵە
کوشتی و ئێستا بووە بە تیرۆکێکی نازدارو ئەوەیش
پیاوەکەی دراوسێی دەستەڕاستمان چوارەم ژنی وەختێ
هانی عومری خۆی ئەدا لە هەشتاو ئێستە بووە بە دارەڕای
سەر ئاودەست و ئەوەیش دراوسێی دەستە چەپ

ڕەزەوان بوو ئێستە بووە بە تەختەی پەرژینی
باخ و هاوڕێکانی باوکیشم: یەکێکیان بووە بە
سنووق بۆ جل و بەرگ و ملوانکەو متومورووی شۆڕە
ژنێ. ئەویتریان هەتا بڵێی هەڵەوەڕو چەنەباز بوو ئێستە
بووە بە ستوونی بەردەمی ئاش. کۆنە ناسیاوێکمان هەبوو ئێجگار درێژ،
زۆر خێرخواز بوو،
ئەو ڕۆژە دیم لە نێوانی
دوو کۆڵانی هەڵەبجەدا کردبوویان بە دار چرا.
هەر لە نەوەی دارگوێزەکان
دوو ئامۆزای مەست و سەرخۆشیشمان هەبوو
وا ئێستە بوون بە دوو لاشیپانی دەرگای
مەیخانەیەك لەناو شاردا.
هەر لەڕەچەڵەکی ئێمە عاشقێکی شێتمان هەبوو
هەمیشە هەر پیاسەی ئەکرد، بێ ئۆقرەبوو. وەك کلك
هەڵسەنگێنە وابوو. ئەو ڕۆژە دیم بووبوو، بە تەختە جۆلانەی،
دوو دڵداری شێت و شەیدا لە باخێکدا!
ئەبی بەچی؟! چارەنووسە. ئەتکەن بەچی؟ چارەنووسە.
لەبیرمدێ نەورەسێکی
پانتۆڵ لەبەری قژ زەردی ڕۆژنامەنووسی هەڤاڤی[8]
جارێك ڕێیکەوتە لای ئێمە
ئەیویست ڕێپۆرتاجێکی جوان

[8] هەڤاڤ: کەسێ کە ماڵی لەسەر کەناری دەریا یان چۆم و ڕووبارێ.

لەبارەی هەردوو ژیانی درەختەوە
بنێرێ بۆ ڕۆژنامەکەی
کە ناوی "چاوی زەریا" بوو.
هەر درەختێکی ئەبینی لێی ئەپرسی:
لەدوای ئەم ژیانەی ئێرەت لە لای دارتاشی خوداوەند
تۆ حەزئەکەی ببی بەچی؟!
یەکێ ئەیوت: من حەز ئەکەم
ببم بە پێشانگای کتێب!
یەکێکیتر: بە بۆفیەی ژووری کچێ.
یەکێکیتر: بە دۆلابی قاپ و قاچاغ.
یەکێکیتر: بە چوارچێوەی تابلۆکانی وێنەکێشێ.
یەکێکیتر: بە مێزی ناو سەماگەیەك.
یەکێکیتر: بە سیستەمی ژن و مێردێ.
یەکێکیتر وتی حەز ئەکەم من ببم بە بەلەمێ
لە تەنیشتیەوە دار گوێزێ کە تا ئەو کاتە خەریکی
تیمارکردنی برینی دوو پەنجەی دەستی ڕاستی بوو،
لە پڕێکدا هەڵیدایە:
لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەمدا زۆر هاوڕێین
من حەز ئەکەم ببمە سەوڵ لەناو بەلەمەکەی ئەودا.
درەختێکی هەشتینەك[9] لق
وتی حەز ئەکەم من ببم بە پەیژەیەکی هەشت پلە

---

[9] هەشتینەك: هەر شتێ لە هەشت بەشی وەك یەك پێکهاتبێ.

**دارێکی لووس وتی من بە داری هەڵلاج**

**هەشت نۆ داری خوشك و برا وتیان ئێمە خۆزگەمانە**

**هەر هەمووامان ببینن بە تەختەی سەر شانۆ**

**دارێکی خڕپلە وتی**

**هیوامە بمکەن بە پنە.**

**دەرختێکی جیقن وتی**

**حەز ئەکەم ببمە باڵشمە[10]**

**سەیر ئەوەبوو، لە دواییدا، پاش چەند ساڵێ**

**ئەوەی ئاواتی خواستبوو ببێ بە پێشانگای کتێب**

**بوو بە دۆلابی حاجەت و ئەوەی ئەیویست ببێ بە**

**سیسەمی ژن و مێردێ، بەختی نەبوو، بوو بە تەختەی**

**تاتە شۆرو، ئەوەی خەونی بە بەلەمیشەوە**

**ئەبینی. بوو بە دارە مەیتی مزگەوت. ئەوەی ئاواتی**

**ئەوەیش بوو ببێ بە سەوڵ کردیان بە داری سێدارە!**

**لەو ڕیزەدا من دواکەس بووم**

**کە نەورەسی ڕۆژنامەنووسی بیانی گەیشتە لام**

**وەختێ بینی من ڕوومخۆشەو**

**بەدەمیەوە پێئەکەنم و**

**هەندێ فەریکە گوێزی خۆم بۆ هێناوەو**

**گەڵێ شیعری ڕۆمانسیانەیشم لەبەرە**

**ئیتر سەرکەوتە سەرەوەو**

---

[10] باڵشمە: چوارچێوەی دەرگاو پەنجەرە.

لەنێوان دوو لقما هەڵنیشت.

دەیان پرسیاری لێکردم

هەتا ئێستەیش پرسیارەکانم بیرماوە

یەکەم پرسیار: ئەی تۆ ئاواتە خوازی چیت، ببی بەچی؟!

و: بە مێزی ژووری شاعیرێ!.

پ: ئایا خۆشەویستت هەیە؟!

و: تەماشاکە ئا ئەو کچە دار هەنارەی ئەوبەرەوە.

بەڵام تەیمانی توترکی باوك و دایك و براکەیان

ڕێی لێگرتووین، شەوێك فرسەتێ دروستبوو

خەریکبوو دەستم بیگاتێ و لەپڕێکدا پەیکوڵی

باوکی پەیدابوو. چەقیە بن پێم!.

پ: باشە ئەی ئەو؟! ئەو حەز ئەکا ببێ بەچی؟!

و: وا حەزئەکا، ئەگەر من ببم بە مێزێ بۆ شاعیرێ،

ئەویش ببێ بە کورسیەکەم!

پ: لە کام شوێندا؟! لە کام گونددا؟! لە کام شاردا؟!

و: ڕاستت ئەوێ؟! سلەیمانی!

پ: ئەی ئەگەر نەکرای بە مێزی هیچ شاعیرێ؟!

و: بەدبەختیمە! بەڵام دەسەڵاتمان نییە!

پ: ئەی باشە، ڕاتان، بەرامبەر کورسی نایلۆن؟!

و: بەڕاستی بێ ئەسڵ و فەسڵن. کەس نازانێ ئەمانە

لەکوێوە هاتوون! هەر جەستەن و ڕۆحیان نییە!

پ: لەئێستەدا گوێ لەکام مۆسیقا ئەگری؟!

یاخود دەنگی کێت بەدڵە؟!
و: شەپۆلەکان و قاسپەی کەو
ناو بەناویش گوێ لە بولبولەکان ئەگرم.
پ: ئەی شیعری کێت زۆر بەدڵە؟!
و: مانگەشەو وەختێ لەسەر بەفر شیعر ئەنووسێ!.
پ: باشە تۆ هەرچی دارگوێزە خۆشت ئەوێن؟!.
و: نەخێر هەرگیز. تیاماندایە ئێجگار چاوچنۆك و
زۆردار. ئەیانەوێ هەرچی ئاوە، یان هەتاوە،
یاخود باڵندەی ئاسمانە بۆ خۆیانبێ!. وەك ئەبینی
دەستیان بەسەر ئەرزێکی زۆردا گرتووە. جۆگە لەدوای
جۆگەو زنە هەڵئەلووشن و تێریش ناخۆن. بە سامانی
زۆری گوێزەوە ئەنازن و تیایاندایە سێ ژن زیاتری
هێناوە. لە هەموویشی ترسناکتر، هەر ئەوانە. لەگەڵ
دار کەنەکاندا، ڕێککەوتوون، ئەیان نێرنە سەر درەختە
هەژارەکان ئەیانکوژن. سەرچاوەی پواز ئەوانن.
دڵیان ڕەقەو مانای لێبوردن نازانن. گوێ لە هیچ
دارێ، ڕووەکێ، لە کەس ناگرن!
پ: باشە تۆ وەکوو بزانیت. بیستبێتت. ئەو دار گوێزە
زۆردارانە. لە دوا ڕۆژدا. ئەوان ئەیانەوێ ببن بەچی؟!
و: وەك بیستوومە!. بەشی زۆریان ئەیانەوێ ببن
بە دەرگاو پەنجەرەو بە ئەسکەمل و کەنتۆری ژووری
پاشا و کۆشکی پاشا. یان بە دیکۆری ناوەوەی تەلارەکان.

به تەختی ژێر پێی سوڵتان و پادشاکان، بە سیسەمیان،
بە کەشتییان، بە تاقمی ژووری شاژن. بە سەوڵەجان.
پ: باشە لەشکری ڕەشەبا یاخود زریان ساڵی چەند جار دێنە سەرتان؟!
و: لە ساڵێکدا چەند جارێ تووشی شەڕ ئەبین. پار زستانێ
نیوەشەوێ، لە چوارلاوە هۆرەباکان[11] هاتنە سەرمان ئێمە بەرگری باشمانکرد،
بەڵام زیانیشمان زۆر بوو.
پ: زیانی چۆن؟!
و: دە دوانزەیەکمان لێکوژران پێنج شەشێکیان مێرد
منداڵ بوون. سیانیان کچ بوون. برینداریش ئێجگار زۆربوون!.
پ: باشە جگە لە ئافاتی زریان. دوژمنێکی ترتان هەیە؟!
و: بەڵێ بەڵێ یەکەم ئاگرو ئینجا دارکەنەکان و
هەروەها ئەو مرۆڤە پیسکەرانەی
پاشەڕۆیان، جێئەهێڵن، پار بەهاربوو، هەر لێرەدا
حزبێك سەیرانێکی گەورەی کردوو، سەرکردەیەکیان دەستی
کرد بە خوتبەدان. ئەیوت ئەم خاکە بەهەشتی سەرزەمینەو
ئێرە بێشکەی شارستانی و دنیابووەو، ئەیوت وەتەن
نووری چاوە، سەیر ئەوەبوو وەختێ هەستان، لە دوای
خۆیان پیساییان بۆ ئەم بەهەشتە جێهێشت و
وەتەنیان کرد بە زبڵدان!.
پ: دوا پرسیارمان! باشە ئەی تۆ کام ژیانیانت خۆش ئەوێ ئەمەی سروشت؟!
یاخود ئەوەی ئەوەو دنیای لای

---

[11] هۆرەبا: بای ساردو توند بە مژەوە.

خواوەندە دارتاشەکان و لەبەرچی؟!
و: ئەمەی ئێستا! لەڕاستیدا لێرە سەوزین لەوێ
ڕەنگمان نییەو ڕەنگ ئەکرێین و جگە لەوەی لێرە تەڕو
لەوێ وشکین. بەڵام لێرەش هەر چەقیوین و
یەك قاچین.. لەولا ئەگەر بەخت یاربێ قاچمان زۆرەو
ئەجوولێین و جیهانیش زۆرتر ئەبینین!
یادەوەریم
لەسەردەمی درەختیما، وا تێنەگەن
هەمووی هەر لەناو باخەڵی سەوزی کچ و
یان لەناو سەمای زیوینی مانگ و بەفراو
یان لەناو ماچی نارنجی و شەوی سووری
هەناران و ئۆخژنی ڕەنگاوڕەنگابوو!
من بێ خەونەکانی مرۆڤ، دڵنیابن
ئەبووم بە گوێزێکی پووت و
بێ خۆشەویستیی منداڵ و پەنجەکانیان
بێ خۆشەویستی ژنان و، دەم و لێوو
شنەشنی پرچەکانیان
نەمئەتوانی هەرگیز بژیم!.
ئەو پەنجانە بۆ من پەلك و گەڵای تر بوون.
ئەو پرچانە بۆ من چڵ و لاسکی تر بوون.
لە سەردەمی درەختیما و لە وەختی شۆڕشی شاخدا
ئەگەر ڕۆژێ بمبیستایە

منداڵێکی ناو ئاوایی بەرکەوتووە
من چڵێکم ئەشکایەوەو
ڕیزێ گەڵام هەڵئەوەری.
بمزانیایە ژنێك بووە بە سوتماك و بە قوربانیی
من لێرەوە ئەژنۆم ئەشکاو دائەکەوتم و
هیوام کلۆری تێئەبوو!
ئەو سەردەمەی گەشتوگوزار و هەڵپەڕکێ و
سەیرانیان کوشت، ڕەشبەڵەك و
شمشاڵیان کوشت...
ئەو سەردەمەی کە دەسەسڕی سەرچۆپی و
قریوەی کەسێ دیار نەبوو
ئیتر ڕۆحی ئێمەیش چۆڵ و
نائومێدی پەناگەم بوو
من ئەوکاتە بۆ یەکەمجار
لە تەنیایی و لە بێتاری[12] و لە غەریبیی خۆم گەیشتم
لە سەردەمی درەختیما
ڕۆژ هەبوو، پڕ بوو لە کوللە
چاوی گوێزیان دەرئەهێنا!.
ڕۆژ هەبوو، پڕبوو لە دووکەڵ
لەو دارستانە زلەدا، هەناسەمان بۆ نەئەدرا
ڕۆژ هەبوو تەم وا ئەنیشتە سەرجەستەمان

---

[12] بێتار: بەڵاو دەرد. بێهۆشی.

ئەمانوت ئیتر مەحاڵە جارێکیتر هەڵسێ و بڕوا.
شەو هەبوو هەتا بەیانیی گەڵا مردووەکانمان ئەژمارد.
لە ترساندا ئەخزاینە ناو باوەشی یەکترەوە. لەبەرچاومان
ئاویان ئەکوشت. لەبەرچاومان سێدارەیان بۆ هەتاو و
"با" هەڵئەخست. لەبەرچاومان داری پیرێژن و
داری پیرەمێردیان لە شاخەوە گلۆر ئەکردەوە هەتا
کۆردەرەی[13] بن بنار. لەبەرچاومان دارچنارە کچەکانیان
ئەتك ئەکرد. ڕەزە ژنیان تینوو ئەکرد هەتا ئەمرد.
چییان نەکرد؟!
سەردەمی درەختیم تێپەڕیو
ڕۆژێ هات قلێشام
کەرت کەرتیان کردم و
خشەخش بە سواری ئێسترێ
ڕاکێشرام بۆ شاری هەڵەبجەو
چوومە لای خواوەندی دارتاش و
کردیانم بەکورسی!

قەنەفەکە: هەر یەکەم مشار ناخۆشە، دوایی ئیتر ئاساییەو ڕاهاتنە.
ئەی دوای ئەوەی بووی بە کورسی؟!
ئەسکەملە سنەییێکە: بەدبەختیەکەی من زۆرترە.
بەڵام بەدڵ گوێم لێگرتووی.

[13] کۆردەرە: دۆڵی قوڵی بن بەست.

چونکه بەژڤین[14] و چاوگی ئازارەکان هەر یەك شتە!
قەنەفەکە: ئەمشەو بۆ ئەو. شەوی ترمان زۆر لەبەرە!
ئەسکەمله سنەییێکە: من حەز ئەکەم، سبەی شەوم بۆ تەرخانکەن. مەگەر
داستانی فیردەوسی، ئەو تولانییەی ئاسیوو[15] یان هەناسەی منی هەبێت.
"ئێمەی کورسی، لە زمانی تەختەوە درەخت ئەگێڕینەوەو
لە زمانی درەختەوە ئاو ئەگێڕینەوەو زەمان ئەبەینەوە
ناو ئەو ڕۆژمێرانەی کەوتنە دۆزەخەوە.
لە زمانی تەختەوە شار ئەگێڕینەوە.
مرۆڤ ئەگێڕینەوە. لە خۆڵەمێشی ساڵانەوە
چەکەرەکان سەوز ئەبنەوەو شکۆفەکان سەردەردێننەوە.
(با)یەکان ئەگەڕێنەوە بۆ سەرەتای هەڵکردنی خۆیان. ئەو
پرسیارانەی بە نەهێنی یان ئاشکرا کوژران زیندوو ئەبنەوە.
ڕابوردوو بە کاوەخۆ ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە نا کۆن بە با بکاتەوە.
یان بە دیار تەرمەکانەوە دانیشێ و بلاوێنیتەوە
بەڵکو بۆ ئەوەی ئێستاو داهاتوو لە خەونەکانی خۆی
ئاگادار بکات و ئەوانیش جوانتر و تازەتر بدۆزنەوە.
ئێمەی قەومی کورسی تەمەنمان،
لە تەمەنی خواوەندە دارتاشەکانمان درێژترە.
ئێمەی کورسی نامانەوێ،
ئەو هەموو بینین و ئەزموون و یادەوەریانەی هەمانن

---

[14] بەژڤین: وردبوون لەژێر شتی قورسدا.

[15] ئاسیو: زیان. ئەزیەت. ژان.

بیانبەینە ناو ئاگرەوە. بۆیە بڕیارماندا هەر شەوەو

یەکێکمان حیکایەتی دەورانی درەختی و

کورسیی خۆی بۆ ئێوە بگێڕێتەوە"

کورسییەکی تر: دە قسەکانی پێ مەبڕن!

کورسیەکە: من دووجار هاتووم بۆ ئێرە

جاری یەکەم چەند لێرەبووم و چی ڕوویداو

چۆن گرتمیان؟ ئەوە هەڵئەگرم بۆ دوایی.

بەر لەوەی جاری دووەمیش بمدۆزنەوە.

لای دەڵاڵێکی ناوبازار کرێچی بووم.

ئەوسایش تازەو ئێجگار تۆکمە و

ئارەزووم سورو گەشاوەو گەرم و گوڕ بووم.

بۆ چەند جارێ کورسی بووك بووم.

ئەو ڕۆژانەی فریشتەکان لە باوەشما دائەنیشتن.

ئەبوون بە ئەستێرەو مانگ و پاڵیان ئەدا بەمنەوە،

هەستمئەکرد، وا تەختەکانم

خەریکن کەسکئەبنەوە

چاوەکانم ئەنووقان و خۆشترین خەوم ئەبینی.

ئەبوومەوە بە پژوپۆی دارگوێزەکەی جاری جاران.

تۆ نازانی کە بووك لەسەرت دانیشێ

دەستی لەسەر دەستت دانێ

ڕانی لەسەر ڕانت دانێ و

یان قاچ بدا لە قاچتەوە، تۆ چیت لێدێ؟!

تۆ نازانی، ئەوە نییە هەر بەجارێ نەتوێیتەوەو
لە خۆشیاندا بەبووکەوە نەفڕی بەرەو پەڵەهەورو
قوببەی ئاسمان. ئای خودایە! لەو خۆشییەو
لەو موچڕکەو لەو تەزوانەی جومگە جومگە و
سەرتاپامی هەڵئەگیرسان!. هەرگیز هەرگیز بووکێکیانم
لە بیر ناچێ. وەختێ دانیشت، لە ژێرەوە پووزی
سپی و خڕوخۆڵی بە قاچی ڕاستی من ئەخوران
ئەو کاتەی ویستیشی هەڵسێ، من لە دواوە،
بە پەنجەی باریکی درزم، کراسەکەیم توند توند
گرت ناچار ئیتر دانیشتەوەو لە دواییدا هەتاکوو
تێرم لێ نەخوارد بەرمنەدا!
باش لەبیرمە دوو نەورۆزیش
هەڵیانگرتم و بردیانم بۆ گردی یارە
"پیرەمێرد" خۆی بەدەستی خۆی
منی لەناو ڕیزدا دانا
ئەو خاڵانەی سەرمەچەکم.. خۆ ئەیبینن؟!
جێگە پەنجەی دەستی ئەون!
بەڵام نەورۆزێکی تریان
وەختێ سەرکەوتمە سەرەوە سەرم سوڕما
کورسیم ئەبینی غەریب بوون بە بینینم
دەوڵەمەندو لوتیان بەرزو
تاك و تەرایش شەپقە لەسەر.

ئەو نەورۆزەیان زۆر ترسام

ئەژنۆکانم کەوتنە لەرزین، نەفەسم تەنگ

دەمم وشك و جومگەکانم قرچەقرچیان پێکەوتبوو

دانیشتووی سەر من "بێکەس" بوو

زۆر قورسیش بوو، لەشم نیشتبووە سەر ئارەق

بەوەی باش بوو، لەگۆیژەوە سۆسەیەك[16] هات

گەیشتە لام. باوەشێنێکی کردم و،

وەکوو جارانی دارستان

بۆ تاوێ فێنك بوومەوە

هەر ئەوەندەی سۆسە ڕۆیشت و لە پڕێکدا

"بێکەس" هەستا، جومگەکانم وتیان ئۆخەی.

بێکەس بەرەو ڕیزی یەکەم هەنگاوی نا.

دوو شەقاو لەولای منەوە، بوو بە باڵای

کلێپەیەك و پەنجەکانیشی بە پشکۆ.

ڕێك بەرامبەر مستەر ئەدمۆنس

"بیست و حەوت ساڵە"ی خوێندەوە

دەنگی هەڵچووی بوو بە تۆفان

وشەکانیش بە مەشخەڵان

چاوم لێبوو مستەر ئەدمۆنس

بوو بە کیسەڵ

ملی بردەوە قاوغ و

---

[16] سۆسە: کزەبا، شەماڵ.

ڕەنگی نەماو دەنگی نەما.

ترسام ترسام ئێجگار ترسام

وتم ئێستا لەبەر ئەوەی کورسی ئەوم

تەورو پۆلیس دێنە سەرم

لەبنەوە دەستەکانم هەڵئەکێشن و

قاچەکانم ئەبڕنەوەو

ئەمخەنە ناو ئاگرەکەوە!

بەڵام باش بوو هیچ ڕووینەدا

وەکوو پشیلەیەك تووڕە، مستەر ئەدمۆنس

یەکدو مڕەمڕی کردوو

لە گردەکە چووە خوارێ

هیچ ڕووینەدا، هێندە نەبێ، وەختێ هەستان

کورسی ئەدمۆنس لەداخاندا

شەقێکی توندی تێهەڵدام

لەپەوڕو کەوتم بە دەمداو

دوو دانی پێشەوەم شکا!

سەرگرد چۆڵ بوو

تەنها کورسییەکان مانەوەو

بەڵام ئاگریش هەر ئەسووتا

لەوساتەدا لە کەلی وێڵەدەرەوە

"با"یەکی قژ سوور گەیشتە گردی یارە

هەڵۆیەك لەسەر شانی بوو ئەتوت بەفرە

باڵی بەرین، چاو ئەستێرە

بە دەوری سەری یارەدا، سووڕانەوە

ئاگرەکەیان خۆشتر کردوو

لەسەرخۆ هاتنە خوارەوە

"با" قژی خۆی تێئالآنم و

لەسەر عەرد هەڵیگرتمەوە.

هەڵۆ لەسەرم نیشتەوەو ماچیکردم

پێشی وتم: خەمت نەبێ

بە دوای مندا باهۆزێ دێ

کورسی ئەدمۆنس هەڵئەگرێت و

ئەیرفێنێ و ئەیرفێنێ و

هەتا "جەبەل حەمرین" ئەیبا.

خەمت نەبێ

لەو کورسیانەی ئەدمۆنس ناژین

شیعری ئازاو کورسی بێکەس

هەرئەمێنێ!

ـ بە بێکەس مەڵێن بەهارە

ئەو نایەوێ جوانیی بە دیلی ببینێ.

بە بێکەس مەڵێن وا گوڵ هات

پێشی مەڵێن نێرگزەجاڕ پێئەکەنێ

ئەو نایەوێ گوڵ لە ناو ژووری کوێرێتی و

نێرگزەجاڕیش بێ ئاسمان

قەت ببینێ
ئەو ئەیەوێ سەمای گوڵ و
سەمای ئازادی و دڵی خۆی
لەیەك ئاسۆدا ببینێ!.
بێکەس ئەڵێ: ئەگەر بەوجۆرە نەهاتن
با هەر نەیەن!

ـ "بێکەس" تۆ کرێوەی جەستەیەکی بە ژەنگ و ژاری ئازاری،
بەڵام بەهارێك لە ڕۆحتایە لە بەهەشتەکەی خودا جوانتر.
ئێمە ئەو بەهارە بە چاوی هەتاو ئەبینین و بە لووتی
منداڵان بۆنی ئەکەین و بە گوێی پێغەمبەرانیش ئەیبیسین.
ئەوەتا پەپوولەو منداڵەکانمان قۆڵیان لە قۆڵی ئەویندایەو
بە پیر سبەینێوە ئەچن و سەرتاپایان کازیوە و پرشنگیان
لێئەچۆڕێتەوە. بێکەس! تۆ ئاوێنەی ئەو خۆشەویستییەی
کە خەڵکی بە دیواری ماڵەکانیاندا هەڵیانواسیویت و لە بەرتا
ڕۆژانە سەیری ئایندەیان ئەکەن و هەمیشەیش وەك
دەشت و دەری دوای باران تازە ئەبنەوە. خەڵکی، خەڵکی
ئەوانەی پەلکە گیای مێرگەکانی پەخشانی ئێمەن و جۆگە ئاوی
شیعرەکانمانن و ئاوازیشن بۆ باڵی فڕینی گۆرانیەکانمان.
بێ ئەوان، تارومارە شیعرو، کاکی بەکاکییە کتێب و،
کوێرە هونەرو کەڕەواڵەیە جیهان!.
ـ هەتاوێك لە بەرۆکی زوقمەوە سەردەردێنێو

خۆشەویستیەك ئەبێتە گڕی کورتە باڵای مۆمێك و
شەو درەنگان بە شەقامەکاندا هات و چۆ ئەکات و
خەڵکی ئەڵێن:
ئەو هەتاوەو ئەو مۆمە "بێکەس"ە و
ساڵانەیش بەسەردان دێتەوە بۆ لامان!
ئا بەمجۆرە
ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیشت و
کورسی هات و کورسی ڕۆیشت و
ئەمجارەیان، بۆ زەمانێکی زۆر درێژ، لە باڵکۆنی
شووشە بەندی ماڵێکدا بووم
بالکۆن شین و
من سپی بووم
سەرگەورەی ماڵ، پیاوێکی کەواو سەڵتە لەبەری
کورتە بنەی، زۆر ڕووخۆش و بەخشندەبوو
بەڵام کۆیلەی قوماربوو!.
ئەم خێزانە
کوڕێکی تار ژەنیان هەبوو
لەسەر من تاری لێئەدا
لەسەر من ئەبوو بە هەڵم و
لەسەر من ئەبوو بە تیشك و
لەسەر من ئەبوو بە کۆترو
لەسەر من ئەبوو بە باران.

کوڕ عاشقی خانمێ بوو

خانم ئەتوت گوڵی دار چوالەیە

ناسك.. ناسك، نەتئەزانی

ئاو ناسکترە لە خانم؟!

یان خانم لەو؟!

نەتئەزانی کامیان زیاتر شپرزەیە

کوڕە یاخود ژێکانی تار؟!

کامیان زۆر ئێسك سوکترە؟!

کچە یاخود زەردەخەنەی گوڵە هەنار؟!

نەتئەزانی هەموو شەوێ

کامیان، کامیان ئەکەنە خەو

درەختەکەی بەر پەنجەرە؟

یان ئەو کوڕە؟!

شەوێ نەبوو لە باڵکۆندا یان لەسەر من

گەلاڕێزانێ لە شیعر و یان خەزانێ لە پەپوولەو

باڕێزەیەك لە ئاوازی

چاو تەڕ چاو تەڕ

جێنەهێڵێ!.

شەوێ نەبوو جریوەیەك، تریفەیەك،

ڕەنگێکی وێڵ دانەبەزنە ناو باڵکۆن و

بە شان و ملی عاشقدا هەڵنەگەڕێن!.

هەموو جارێ کە دەستی ئەدایە تارو

ئاواز بۆ بەرەو ژوور ئەفڕی
ئیتر عەشق ئەبوو بە تەیر و
تەیریش بە نوور!.
هەموو جارێ کە تار حاڵی لێئەهات و
ژێ شێت ئەبوو
ئیتر ئەمیش باڵی "ئیشراقی" لێ ئەڕواو
لەسەر هاڵەکان[17] هەڵئەبوو.
هەموو جارێ کە "دابڕان"ی ئەژەنی
غەریبیی ئەبوو بە هەوری سەرگەردان و
بەسەرماندا دائەباری.
هەموو جارێ کە "ویساڵ"یشی ئەژەنی
چاوم لێبوو لە بەرایی پیرۆزەیی ناو ئاسماندا
شەکرە سێو ورد ورد ئەباری.
هەموو جارێ
کە ئەو ئەهاتە سەر من و
پەنجەکانی ئەبرد بۆ ژێ
نەك هەر تەختەم
هەرچی بزماری لەشیشمە
ئەبوون بەگوێ!
ڕۆژێك عاشق میوانی هات. میوان هاتە ناو باڵکۆن و
ئۆکۆردویۆنێ بە سنگەوە. میوانێکی زۆر بۆنخۆش بوو،

---

[17] هاڵ: بەرزایی کێو.

بۆنی گەردنی مریەم و بۆنی خاچەکەی مەسیح و بۆنی
مۆردی ماڵی کەریمی ئەلەکەو بۆنی "ئەبونا"ی لێئەهات.
گەنجێکی کەمێ گردەڵە. مەدالیای سەلیبێکی کردبووە
مل. تا ئەوکاتە من نەمدیبوو هیچ میوانێ هێندەی
ئەم میوانە مۆسیقارە لە لای عاشق خۆشەویست بێ
من ئەڵێم دە ئێوە بڵێن سەد ماچی زیاتر کردووە. گوێمگرت
بزانم ئەم کوڕە ناوی چییە؟!. بوو بوو بە مەراق
لە دڵما. چایان هێنا، هەروا بۆ چەند دەقیقەیەك
ئۆکۆردویۆنی لە باوەشی مندا دانا، دەرفەت ڕەخساو،
چرپاندم بە گوێی ئۆکۆردیۆندا: لێمببورە! ناوی
خاوەنەکەت چییە؟! من واموت و ئیتر ئۆکۆردیۆن
تووڕەبوو، ڕقی هەستاو، یەك زیقەی درێژی کردوو
ئینجا وتی: تۆ کورسییەکی زۆر گەوجی! زۆر بێئاگای
ئاخر هەیە لەم شارەدا نەزانێ کێیە ولیەم یوحەنا!
عاشق ئەڵێ:
من بمەوێ خوا ببینم، زوو ئەیبینم
بەڵام ئەو دەمەی سووتانم
ئەمکا بە هەڵمی سەر "تار" و
تەنها کاتێ کە ڕامانم
لەناو ڕۆحما نوقوم ئەبێ و
تەنها کاتێ شەوی ئازار
لە شپرزەیی پەنجەما

پەرت پەرت ئەبێو

لە وردوخاش بوونی خۆمدا

کامڵبوون و نوێبوونەوەی

عەشق ئەبینم!

عاشق ئەڵێ:

من بمەوێ شەپۆلی زەریا یان هاژە

یان باو بۆران

بهێنمە ناو دەروونمەوە، ئەیانهێنم

بەڵام ئەو وەختەی تەنیاییم

بچووك بچووك ببێتەوەو

بە تەنها جێی ئاخەکانی تیابێتەوەو

بێدەنگیشم زۆر گەورەبێ!.

عاشق ئەڵێ:

لە خۆڵی ڕەشی دەیجووردا

من ڕووناکییەك ئەچێنم کەس نایبینێ

جگە لەخۆم.. جگە لەخوا!

هەندێ جاریش کە خوا تەنیا جێمئەهێڵێ

ئەوسا ئەبێ بێکەسیەکەی

ئەوو خۆیشم بەم هەناسە بێ ئۆقرانە

ڕابژەنم!

عاشق ئەڵێ:

ئەگەر ئێمە نەبووینایە

نە ئازار ئەبوو بە وەتەن

نە غەریبیی ئەبوو بە ناونیشانی ژیان و

نە بێ ئارامی ئەبوو بە شاعیر!

عاشق ئەڵێ:

شەوێك تەنیایی لێی پرسیم:

عەشق چییە؟!

وتم، تۆی وەختێ کە ئەبیت

بە پەروانەی دەوری گڕێ.

وتم پەروانەیە وەختێ

ئەکەوێتە ناوباوەشی ئاگرەوە.

وتم ئاگرە وەختێ کە ئەبێت

بەسوتوو

وتم سوتوویشە ئەو وەختەی

(با)یەك ئەیبا بۆ نادیارو

نادیاریشە وەختێ لەسەری خودادا

ئەبێ بە خەو!

منی عاشق، ئەبێ هەر بە ئەنگوستی هەناسەم ئەم

لۆکەی زمانە شیبکەمەوە، تا وشە هەڵفڕێ و دەستە

واژەکان ببنە پەڕی دەم ئەو "با" سەرگەردان و

ئاوارانەی کە نە ماڵیان هەیەو نە فەرهەنگ. من هەللاجی

ناو ئازارە سپییەکانم. لە دەنگما جەستەی تاراوگەم

هەلگرتووەو لە چاوما پرشنگە خوێناویەکان و لە تاڵە

مووەکانی قژیشما پەلکە گیای نامۆیی!.
ئا بەمجۆرە هەتا ڕۆژێ،
برسێتیی هاتەماڵەوەو قەرزاری هاتە
باڵکۆن و نان دەستیکرد بە گریان و، ئاو بێزارو،
چرا کەوتە باوێشکدان و، تار لەسەر من خەویلێکەوت
سەر گەورەی ماڵ هیوایەکی بێچارەبوو، کورسی و مێزو
چرپاو هەموومانی هەڕاجکردوو، خۆیشی سەری خۆی
هەڵگرت و خانەوادە پەرەوازەو کوڕەی عاشق بەتەنها
خۆی و تارەکەی، غەمگین غەمگین، چوونە دەرێ.
لەو ڕۆژەوە کورسییەکی لانەوازم
کورسییەکی خەیاڵ پەرت و
وەکوو سەراب داڵغەچی.
دوو سێ هەفتە بێکار بووم و قژ خۆڵاوی و
لە سووچی ناو مەخزەنێکدا هەر ئەنووستم.
هەتا ڕۆژێ تیپی "پێشڕەو" دەستیاندامیێو
کڕییانم و بە ئەندامیش وەریانگرتم. لە دوو
سێ شانۆنامەدا ڕۆڵی کۆمبارسیشم بینی.
لە ڕاستیدا هەرگیز هەرگیز ئەو دەورانەم
لە بیرناچێ کە لەگەڵ "عوسمان چێوار"دا
بەیەکەوە ئەمانبینی:
"سەر شانۆ. شەو درەنگە. ژوورێك. کورسیەکەو
مێزێکی تەختە. ڕوو لە بینەران"

کورسیەکە: شەو درەنگی کردووەو، بەلاَم من هەر
چاوەڕوانم. تۆزێکی تر چێوار ئەگەڕێتەوە. بادەو
مەراق تەواو مەستیانکردووە. دەست ئەداتە باڵم و
کەمێك لە مێزەکە دوورم ئەخاتەوە. لە ڕاستیدا
من لەگەڵ ئەم مێزەدا ناگونجێم ئەڵێی کۆیلەی
ئەوم. بۆ هەر شوێنێ چوو، ئەبێ بە دوایەوە بم.
بە هەرحاڵ، کە چێوار لەسەرم دانیشت ئەوسا
دوا دیمەنی شانۆنامەکەی ئەنووسێ.
"چێوار مەستەو دێتە ژوورەوە. لەبەر خۆوە، گۆرانیەکی
غەمگین ئەڵێ. دەست ئەداتە کورسیەکەو کەمێك لە
مێزەکە دووری ئەخاتەوە. چەند چرکەیەك
بێدەنگە و ڕاماوە. دوایی ئەڵێ:
چێوار: چاکتر وایە دوا دیمەنی شانۆنامەکە بەم
جۆرە کۆتایی پێبێنم: "ڕووناك" گەیشتۆتە
بن بەست، چارێك نەماوە و هەر ئەبێ ئەم دۆزەخی
ماڵەو ئەم مێردە دڵڕەقە بەجێبێڵێ
"لەناو چەپکێ ڕووناکیدا.
ڕووناك و نەوزادی مێردی دەرئەکەون"
ڕووناك: "بە پێوە وەستاوە بە توورەییەوە ڕووی لە نەوزادە"
تەواو. من ئیتر عەیبەی خەڵکی ئەخەمە
ئەوتەنەکەی خۆڵەوە. ئەوەی پێی ئەوترێ ئارامگرتن
وەك پەتی پچڕاو هەرگیز گرێشی نادەمەوە. من لە

ئیستەوە ئازادم. لە ئیستەوە من ئیتر لە قامچیەکانت و
زەبروزەنگت بێدەنگ نابم. تەواو. ماڵت بۆ بەجێئەهێڵم
بەڵام من تۆ تەڵاق ئەدەم. تێگەیشتی. من تۆ تەڵاق
ئەدەم. تەواو. تەواو. تەواو.
نەوزاد: "ئەویش بە تووڕەییەوە. بەڵام دانیشتووە"
تەماشا تەماشا، چەند بێشەرمە.
هەروا؟! بۆ کوێ خانم؟! بۆ کوێ؟!
ڕووناك: تۆ خۆت ماکی بێشەرمیت. بەڵێ هەرواو لەوە
زیاتریش، بەڵێ ئەڕۆم. بەرەو ماڵی نەرمینی
خوشکم لە شاخ و لە گوندی هەڵەدن
نەوزاد: ئەوان خۆیان نان نییە بیخۆن..
ڕووناك: "قسەکەی پێئەبڕێ" چش! با لەبرسا بمرم و
بەڵام ئازادبم.. ئازاد!
نەوزاد: ژن و شاخ و ژێر تۆپ و تەیارە؟!
ڕووناك: بەڵێ ژن و شاخ و نەك هەر ئەوەندەیش
ژن و شۆڕشیش.. قسەم تەواو.
"ڕووناك جانتا بچکۆلە ئامادەکراوەکەی هەڵئەگرێت و
بێ خواحافیزی. وەك "نورا"ی ناو شانۆنامەکەی
"ئەپسن" "ماڵی بووکەشووشە" ئەچێتە دەرەوەو
لە دوای خۆیەوە، لە نوورایش توندتر زۆرتوندتر،
دەرگای دەرەوە بە یەکدا ئەدا"
"دیمەنی دووەم لە شانۆنامەکەی تردا"

"سەر شانۆ چۆڵەو چێوار لەوێ نییەو بە تەنها هەر
کورسیەکە خۆیەتی. کات ڕۆژە"
کورسیەکە: ئەبوو ئێستا چێوار لێرەبوایە. لەسەرم
دانیشتایەو ڕۆڵی "گاییف"ی لە شانۆنامەکەی
چیخۆف، "باخی گێلاس"دا ببینیایە!. نازانم
ئەو قەت دوانەکەوتووە.
ـ تارمایی چیخۆف دەرئەکەوێو
وردە وردە دێتە پێشەوە ـ
تارمایی چیخۆف: چاوەڕوان مەبە!
کورسیەکە: بۆچی؟!
تارمایی چیخۆف: ئەو جارێکیتر هەرگیز
لەسەر تۆ دانانیشێتەوە!
کورسیەکە: ئاخر بۆچی؟! چیمکردووە؟!
تارمایی چیخۆف: نا تۆ هیچت نەکردووە. بەڵام چێوار
ئیتر هەرگیز نایەتەوە. چونکە بەر لە چەند چرکەیەك
ڕۆحە سپیەکەی گەیشتە لای من و ناو باخی گێلاسەکەم!
"تاریکیی. پەردە دائەدرێتەوە"
کورسییەکە: "لەسەر گێڕانەوە بەردەوامە"
ئا بەمجۆرە
شانۆ هات و شانۆ ڕۆیشت و
کورسی هات و کورسی ڕۆیشت و
منیش هەروا پەرەوازە!

کورسیە سنەییێکە: پیرە قەنەفەی عوسمانی
خەوی لێکەوتووە، ئەیبینن؟!
کورسیەکی تر: ئەو ئێستەیش خەو بەوەوە ئەبینێ
جارێکی تر بڕواتەوە بۆ ئەستەموڵ!
کورسی 2: ئەوەی ڕاستیبێ ساردەو، ئەمڕۆ ئەو
شاگردە نەگریسەیش سەتڵێ ئاوی پیاکردم و
هەستئەکەم خەریکە تووشی هەڵامەت ئەبم.
بە هەرحاڵ، تکایە بێدەنگبن
با چیرۆکەکەی تەواو بکات!
کورسیەکە: سوپاس.. سوپاس
بەڵێ هەروا پەرەوازەو بێدەرەتان
بە شاگردی لەم ئیشەوە بۆ ئەو ئیش و
لەم دەستەوە بۆ ئەو دەست و سەر بە بێتار
ساڵێك لای سەوزە فرۆشێ هەر لەسەرشان
سەبەتەی کوولەکەو بامێ و باینجان و تەماتەیان
پێهەڵگرتم!. کابرا ئەوەندە ڕەزیل بوو،
گلارێکی بە خۆڕایی نەئەدامێ!.
ئەو سەردەمە من دەستی زۆر کەسم بینی درێژ
ئەبوون بۆ سەر سنگم، دەستی تووکن، دەستی
چرچ و، دەستی نازدارو ناسك و دەستی سپی و
دەستی ڕەش و، دەستی خێرو هەروەها دەستی
تەماع و، هەندێ دەستیان پەنجەکانیان پڕ

موستیلەو، هەندێ مەچەك پڕ بازن و، یەکێك
لەو دەستە جوانانەی قەت لەبەرچاوم ون نابێ و
بە دەیان جار بەر پەنجەم و قۆڵم کەوتوون
دەستی ڕاستی نەرم و نۆڵی
"ست فاتیمە"ی ناو قەسیدەکەی "هەردی" بوو.

پەرەوازە
دیسانەوە پەرەوازە
ئەمجارەیان لە قاوەخانەی (سەرچیمەن)
لەدوکانە دێرینەکەی "عەلی فەوتاو"
کرام بە کورسی بۆ میوان
ئێمە تەنها دوو کورسی بووین. کورسیەکەی کاك عەلی
خۆی و منیش. "عەلی فەوتاو"یش گوڵ بوو گوڵ
وەکوو ئێمە، داروبەردیش خۆشیان ئەویست. هەمووی
دوو ڕۆژبوو گەییبوم، بەرگی کۆنی فڕێدام و دەستێ جلی
سەوزی تازەی کردەبەرم. بە دەستی خۆیشی ئەیسڕیم.
هەر لەوێ بوو، چەندین کوڕی باشم ناسی. زۆر ئێوارە.
پیاوێك ئەهات، وەختێ لەسەرم دائەنیشت، ئیتر
حەزمئەکرد نەڕوا. جارێ نەبوو ئەم پیاوە بێ و باسی
شیعری نالی و مەحوی و یان مەولەوی و حەمدی نەکات.
جارێ نەبوو ئاخ بۆ دەنگی خۆشی سەی عەلی ئەسغەری
کوردستانی هەڵنەکێشێ. ئەو پیاوە ناوی "دیلان" بوو!

ـ دیلان

سایەقەی دەنگێکی بێگەرد

دوو باڵی چریکەی بەرزەفڕ

تا لای خوا.

مەقامێ: لەشێوەی هەورازو نشێوی

شاخاندا. مەقامێ:

وەك زەردەی ئێواران

ئەوساتەی کە پۆلە باڵندەی کۆچەری

سێبەریان، خاڵ خاڵی

سەر بەفرە و شەقژنیان غەمگین و بێهەدان[18]

مەقامێ: هەر وەکوو خەیاڵی

ڕووباری بن بنار

غەریبەو تەنیایەو دوور ئەڕوا.

دەنگێکی زۆر سپی

ئەتخاتە سەر باڵی و چون خەونێ

لە شەوی درێژدا هەر ئەتباو هەر ئەتبا!.

"دیلان"ە

ئەو سیحرەی لە دەنگدا باڵ ئەگرێو

ئەو خەمەی بەدەوری شیعردا ئەبێتە پەروانە

"دیلان"ە

---

[18] بێهەدان: بێ ئۆقرە.

ئەم شارە لە دەنگیا بێدەنگەو
ئەو وەختەی ئەو ئەیڵێ
ئاو هاژەو
"با" وژە، ئەخەنە ئەولاوەو
"خواوەندی دەنگ خۆش" یش
خۆی بۆ خۆی گوێ ئەگرێ و
بەو دەنگە سەرسامە!.
"بەیانییەکی ئێسك سووکی پایز بوو. دنیا تازە خەریکبوو
گڕەی گەرمای هاوینی لە لەش دەرچێ. ناوبەناویش شنەی
شەماڵێ کە دیاربوو لە بەفری سەر "پیرەمەگرون"ەوە
بەڕێ کەوتبوو، ئەگەیشت و لە ساتەوەختێکی خێرادا بە کزە
خۆشەکەی فێنکی ئەکردیتەوە. "دیلان" لە ماڵ هاتەدەرێ،
قاتێکی تازەی زەیتوونی لە بەرداو، بۆینباخێکی سوور لە ملداو
تا سەر ناوك شۆڕ و قژی ڕەشی داهێنراو بە بریسکە و خوێنی
لاوێتیش لە لەشدا قوڵپی ئەدا.
بۆنی خۆڵی بەرماڵی تازە ئاوڕشێنکراو
بە سەریا هات و ئەویش پڕ بە سیەکانی هەڵیمژی. هەر لەو
ساتەدا لە کەلاوەکەی تەنیشتیانەوە گێژەڵووکەیەکی باریك
لە شێوەی منارەیەکدا چوو بە ئاسماندا و لەگەڵ خۆیدا
هەرچی پووش و پەڵاش و پەڕەکاغەزو ڕۆژنامەی دڕاو هەیە لوولیدان و وەك
بیانخاتە بن باخەڵیەوە
بردنی بۆ سەربانی باڵەخانەکەی بەرامبەریان.

دیلان دەسەسڕە سپیەکەی لە گیرفانی پشتەوەی پانتۆڵەکەی
دەرهێناو هەر بە قەدکراوی لاملی و نێوچەوانی پێسڕی. بە کاوەخۆ
سەربەرەو خوار بۆوە.
لە سیلەی کۆلانەکەدا، وەك هەواڵێکی
چاوەڕوان نەکراو، یان چون دیمەنی ناوخەوێکی قەت بەخەیاڵدا
نەهاتوو، یەکەم کەس کە لووتی بە لووتیا تەقیەوە،
ئەو ژنە شۆخ و نازدارە بوو، کە بەر لە ساڵێك هەموو شار
ناوی ئەمیان بەسەر زارەوە بوو. ئەم بینینە کوتوپڕە
ئیستێکی پێکرد، وەك ئەوەی بەسەر ڕووداوێکی دڵتەزێندا
کەوتبێ، دڵی بە شێوەی پرتەقاڵێکی گوشراو سست و پەست بوو.
ئارەقێکی ساردی دەرداو هەستیکرد گێژەڵووکەیەکی پچووکیش وەك
گێژەڵووکەی کەلاوەکە
لە ناخی ئەمیشدا هەڵیکرد. دیسانەوە دەسەسڕەکەی دەرهێنایەوە لامل و
دەم و چاوی پێسڕیەوە.
لە دڵی خۆیدا وتی "نازەنین، نازەنینی حەمە لاوەی قەرەداخی،
ئەم ڕێکەوتە ناخۆشە چی بوو؟!" گەیشتە بەردەم دوکانەکەی
کاك عەلی فەوتاو، بێئەوەی بوەستێ یان لابدات سلاوێکی
کردو تێپەڕی. ئیتر ناوی "نازەنین" بوو بە گێژاوێك و ئەمی
قووتدا. بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت،
لە جیاتی ئەوەی ڕووبکاتە ناوشار.
شەقامەڕێی ئەوبەری گرت و ڕوویکردە سەیوان.
گێژاوەکە تا ئەهات قوڵ و ئەندێشەکانی ناوسەری پوورە

هەنگ بوون و لەگەڵ هەموو ناو بردنێکی "نازەنین" دا
ئەوروژان و لە یادەوەریەکانیەوە ئەئالآن و هازەهازیان[19] بوو.
"سەیوان" تاك و تەرا خەڵکی پێوەبوو. لە گردەکەی
ئەوبەرەوە، دەنگی لاواندنەوەی ژنێك کە سۆزێکی هەڵقرچاوی
قەقنەسی باڵی پێگرتبوو. ئەوەندەی تر دڵی ئەمی گوشی
هەوا کپ و ئەرخەوانەکان بێ جووڵەو،
بە هەر چواردەوریشدا،
کێلی گۆڕەکان، خامۆشییان چڕتر ئەکردەوە. بێ ئەوەی
بزانێ بۆ، سەرێکی بۆ ئاسمان هەڵبڕی. دوو گەواڵە هەوری
سپی، کە لە شێوەی دوو باڵندەدا نەخشابوون و
لە ئاسۆیەکی بەریندا درێژ بووبوونەوە،
تەماشای دیلانیان بردە ژێر پەڕو باڵی
خۆیانەوە. خۆی لەگەڵ خۆیدا ئەدوا "
ساڵێك لەمەوبەر کارەساتەکە ڕوویدا و
چون بوومەلەرزەیەك شاری لەرزاندەوە،
نازەنین نەك هەر نەگۆڕاوە بەڵکو جوانتریش بووە!" شیعری
سەرچەند کێلێکی خوێندەوەو بۆ ساتەوەختێ بیری لە پڕوپووچیی
ژیان کردەوەو لە دڵی خۆیدا وتی "هەر تەواو بێ مانایە!"
قاچەکانی وەك هیچ پەیوەندیەکیان بە جەستەیەوە نەبێت، ئەوان
ئەمیان ئەبرد. هەنگاوە وێڵەکان بەرەو ژوور ئەبوونەوە. هەندێ
جار هەست و نەستی مرۆڤ خۆیان ئەبن،

---

[19] هازەهاز: گیزە گیز.

به چاوو بەرەو ئەو شوێنە ئەتبەن
کە تۆ پێشتر پلانێکت نەبووە بۆ ئەوەی بەسەریبکەیتەوە.
ناوێك، یادگارێك، ئەبنە نەهێنی ئەو جوڵاندنە. ئەمجۆرە
بارودۆخە دەروونیانە لە ساتەوەختی نووسینی شاعیرێ یان
نووسەرێ ئەچن کە بێ ویستی خۆیان دێڕەکان بەرەو ئاقارێ
ئەیانبەن کە پێشتر بە هیچ شێوەیەك بیریان لێنەکردۆتەوە.
لە پڕێکدا گەیشتە ئەو ئاستەی کە دوو دار ئەرخەوانی
سەر یەکانگیری لێبوو. لە سایەشیاندا،
گۆڕێکی هەڵبەستراوی بەسپی ڕەنگکراو
ئارامی گرتبوو. لەوێدا دیلان ڕاوەستاو، بۆچەند چرکەیەك
لە گۆڕەکە ڕاماو لە دواییدا لەسەر قەراغەکەی دانیشت. سەری
داخست و هەناسەیەکی هەڵکێشا. دەنگی لاواندنەوەی ژنەکە
بەردەوام بوو. "هەردووکیان منداڵی یەك گەڕەك بوون.
بە تەمەنیش هەر وەکوو یەك بوون.
بە یەك ڕۆژیش دەستی هەردووکیان
گیراو بران و خرانە قوتابخانەوە.
لەیەك پۆلیشدا بوون" سەروەری نێرگز"
هەر لە منداڵییەوە هێورو بێدەنگ و شەرمن بوو.
کورێکی سپیکەلەی قژڕەشی چاو گەورە گەورە،
گەنجێکی پڕ لە هیواو ڕووخۆش،
هەمیشە یان گوڵێکی بەدەستەوە بوو یان خونچەیەکی
ئەدا لە یەخەی چاکەتەکەی. لەناو هەموو هاوڕێکانیدا،

سەروەر لەگشتیان دڵ ناسکتربوو، جاری وا هەبوو،
لەسەر قسەیەکی ئێجگار بێبایەخ زویر ئەبوو. چەندین جار
لەگاڵتەکانی "دیلان" ئەتۆراو خۆی ون ئەکرد. دیلان ناچار
ئەبوو بچێت بۆ لای و ئەملاو ئەولای ماچبکات و ئاشتی بکاتەوەو
دڵی بێنێتەوە جێی خۆی. نە نووسەر بوو نە شاعیرو نە هونەرمەند،
بەڵام هەموو ئەو ڕۆحانەی تێدا بوو. گەلێ جار لە شەوانی
مانگە شەودا داوای لە دیلان ئەکرد بچنە قەراغ شارو
لەو بێدەنگیەدا لە ڕوخساری مانگ و تریفەی زیوینی ورد
بنەوە. پێی ئەوت "چ ساتەوەختێکی خۆشە لەو کپی و
بێدەنگیەدا تەماشای مانگ بکەیت، ئینجا دوای ئەوەی
لەم سەیرکردنە تێر ئەبیت. گوێشت لە دەنگی دیلان بێت"
سەروەری نێرگزو دیلان لە گەلێ حەزو ئارەزوویشدا پێچەوانەی
یەکتربوون. سەروەر لە سیاسەت بەدوورو حەزی بەکاری
حزبی نەئەکرد، زۆرجار ئەیوت "ئەم سیاسەتە دنیایەکی
وشك و برنگە. بەشی زۆری فڕوفێڵەو تەڵەکەبازی. جگەلەوەی
من بڕوام بە گەلێ لەو سیاسیانە نییە و لێیان بەگومانم"
دیلان تێکەڵاوی کاری سیاسیی بووبوو. گیراو ڕەوانەی
خوارووی عێراق کرا. لە دوای هەفتەیەك،
سەروەری نێرگز هەستیکرد تەنیایەو
گرتنی دیلان بۆشاییەکی لەبەرچاوی خستۆتە ژیانیەوە.
قیڕەی تیژو لە ناکاوی ڤاژوویەك دیلانی بەئاگا هێنایەوە.
دەنگی لاواندنەوەی ژنەی گردەکەی ئەوبەریش، ئەوەندەی تر

پاییزی خەماویترو دڵتەنگتر ئەکرد. ئینجا هەستایە سەرپیان‌و
بە دەستێ پشتەوەی خۆی تەکاندو وردە وردە بەرەوخوار
لەگەڵ هەمان خولیادا داگەڕا. لەدڵی خۆیدا وتی "دوای ئەوەی
بەردرام، وەختێ سەروەرم بینیەوە. هەر تەواو زەردو
لاواز بووبوو. مرۆڤی عاشق لە پووشوو ئەچێت بەخۆرە
تاوێکی بەتین ئاگری تێبەر ئەبێ. سەروەری نێرگز عاشقی
نازەنین بووبوو. بەو دواییە هەر تەواو بێ هۆش و گۆش
بووبوو. بێوازو ئەتوت ئاو لایداوە. تاقەتی هیچی نەمابوو.
من ئاگام لێبوو، چەندین شەو تا بەیانی، ئەبوو بە
تاق تاقکەرەی بەردەمی ماڵەکەیان. "نازەنین"یش هەروا
بوو بەڵێنی پێدابوو کە هەر بۆ ئەو بێ!. بەڵام نا ئەمە
قسەی سەرزارەکی بوو. چوونە داخوازی نازەنین. باوك و
براکانی بە تێڵاوە چوونە سەر ماڵی سەروەر. یەك مانگی
نەخایاند کوڕی تازە دەوڵەمەندێ داوایکردو ئەویش
شوویکرد. لەو ساتەوەختەوە ئیتر سەروەر وەك بەفری
بەر هەتاو هەر ڕۆژەو شتێکی لێ ئەتوایەوە. زۆر کەمیش
ئەهاتە دەرەوە. جارێکیان چووم بۆ لای، هەندێ
قسەم بۆ کردو ویستم ورەیەکی بخەمەوەبەر، بەڵام ئەو
وتی "تکایە با لەو باسە گەڕێین.
ئەوە مەسەلەیەکی تایبەتە بەخۆم!"
پار ئەم وەرزەبوو. لەئێوارەیەکدا کە خۆرنشین
باڵای جووتە گەواڵە هەورێکی لە ئاسۆی ڕۆژئاوادا ئاڵ

ئاڵ ئەکردو، جووتە هەوریش، دانەویبوون و،
بەسەر شاردا ئەتوانەوە. هەر ئەوساتە، لە ژوورێکی
بچکۆلەوە دەنگی تەقینی فیشەکێك هات و، دەنگەکە
ماڵ بە ماڵ و کۆڵان بە کۆڵان و شەقام بە شەقام ڕۆیشت و
خوێنیش لە جەستەی عاشقێکەوە ئەڕژایە سەر کورسیەك و
لەسەر کورسیەکەیشەوە بۆ ناو ژوورو نەئەگیرسایەوە!.
دیلان گەڕایەوەو گەیشتەوە بەردەم دوکانەکەی
"فەوتاو" ئەمجارە چووە ژوورەوە و لەسەر کورسیەکە
دانیشت و بە دەنگێکی نزم و لەسەرخۆ حیکایەتی ئەم بەیانییەو
بینینی لەناکاوی "نازەنین" و چوونە سەیوانی و ختوورەکانی
ناو دڵی خۆی بۆ "فەوتاو"ی هاوڕێی گێڕایەوە. جگە لە
فەوتاو، ئەوەی بە وردی گوێی لە وشە بە وشەی "دیلان"
گرتبوو کورسیەکەی ژێری بوو!
کورسیەکە: بەڵێ وابوو. زۆر بەوردی گوێم گرتبوو.
لە دواییشدا کە خۆم بە تەنیا مامەوە بەکوڵ گریام!
کورسیەکی سەرپەڕ: پێم سەیرە بەردیش گوێی لێبێ و بەلآم نەگری!
کورسیە سنەییێکە: لەوە گەڕێن!. من پرسیارێکم هەیە و دەمێکە
لە دڵمایە و ئەمەوێ ئێستا لێت بکەم؟!
کورسیەکە: فەرموو برا!
کورسیە سنەییێکە: ئەی باشە تۆ ئەو هەموو ساڵە ژیاوی، لێرەو
لەوێ، پیاو خراپێکت لەسەر دانەنیشت؟!
کورسیەکە: بێگومان.. بێگومان

بە درێژایی تەمەنی تەختەکانم

بە درێژایی تەمەنی چاوەڕوانیم

من لە هەر شوێنێ ژیابم.. دڵتەنگترین کاتەکانم

وەختێ بووە، ڕق لە سەرم دانیشتبێ و

ویستبێتی خۆشەویستیەك بکوژێ

جا بچووك بووبێ بەقەدەر پەلکە گیایەك،

پەپوولەیەك، مێروولەیەك

یاخود گەورە هێندەی ئاواتی مرۆڤێ

بەر لەچەند ساڵ ئێوارەیەك

من گوێم لە دڵی پیاوێك بوو

کە لەسەرم دانیشتبوو.

بیری ئەکردەوە لەوەی

چیبکات بۆ ئەوەی سبەینێ

لە نێوانی دوو باخچەدا

شەڕی نێوان جۆگەکان و

جەنگی نێوان گوڵەکان و درەختەکان هەڵگیرسێنێ!.

جارێکیتر من گوێم لە عەقڵی پیاوێ بوو

بیری ئەکردەوە لە وەی چۆن تەنها خۆی

هەر خۆی و بەس

دەرگا بێت و کلیل بێت و

ماڵەکەیش بێت!.

یەکێکی تر نیوەڕۆیەك

هەر لەسەر من
بڕیاریدا و دەستی بردوو
تۆڵەیەکی "پەڕەبێلی" خستە سەر پێو
پشت بە غەزەبێکی خودا چووە دەرێ
تا لەبەرچاوی قورئان و
بە شایەتی منارەیەك
هەر لە حەوزەکەی مزگەوتدا
شەرەفی خۆی بشواتەوەو
لە دواییشدا تێر بخەوێ!.
کورسیەکی سەرپەڕ: تکایە پرسیارەکانتان هەڵگرن بۆ دوایی
با حیکایەتەکەی تەواوبکات. ئێ باشە تا کەی
تۆ لە دوکانەکەی "فەوتاو" مایتەوە؟!
کورسیەکە: وەختێ کەوتینەوە هاوین "دوکان"
خۆی هەڵگێڕایەوەو هەموو جلەکانی گۆڕی. دوکان
خۆی پۆشتەکردەوە بەرگی تازەی کردەبەری. دیوار
خۆی سپی کردەوە. تەبەقەکان خۆیان شت و کونە
مشکیان هەموو گرت و "فەوتاو" کۆنەی هەموو
بەخشی و منیشیدا بە پیاوێکی ناسیاوی خۆی
عەرزو حاڵچی. ڕۆژی دوایی کابرایەکی باریکەلەی خوێن
شیرینو دەم بەخەندە. هاتە دوکان، تۆزێ لەسەرم
دانیشت و لەدواییدا دەستی دامێ و بەسواری قەڵان
دۆشکانی هەڵیگرتم تا ناوسەرا. لەبەردەم مێزێکی

نزمی زۆر سەرقاڵدا منی دانا، بەگاڵتەوە دووسێ جارێ
دای بەپشتما و ئەوسا لەسەرم دانیشت و هەناسەیەکی هەڵکێشا.
کۆنە چاپێکی قۆڵ شکاو، ڕیزە پوولی چوارچوار بەیەکەوە
نووساو، کاغەزی خورشیدی زۆرو، ئیستەمپا بۆ پەنجە
مۆرو، قەڵەم و دەرزی سەرخڕو، عەینەکێك و،
کاغەزی قۆپییەی ژێرو، لوولەیەك جگەرەی زەل و، تەپڵەکێك و،
هەمووی لەبەر دەستا دانا. بەم ڕۆژگارە پەنجەکانی وەکوو
دەنووکی کەڵەشێر هەر خەریکی قرتەقرت بوون، ئاگام لێبوو
لەچوار وشەیش دووانیان سەرو ملیان ئەشکا. ئەو
سەردەمەیشم پڕپڕبوو لە هەناسەی ساردوگەرم. لە ئەزموونی
شیرین و تاڵ. لە فرمێسك و زەردەخەنە. خەڵکی داماو
ئازارە جل دڕاوەکان، کوێرەوەریە لادێیەکان، پەڕاگەندە
بێماڵەکان. گەلاڕێزانی بێوەژن. هەڵقرچانی بێکارەکان.
ئەهاتن و لەسەر چیچکان دائەنیشتن، سکالایان و
زوخاویان پڕ بە هۆدەو بە دالان و ناو تاقەکان هەڵئەڕشت و
ئەمیش بە دەنووك قرتەقرت ئەیکردن بەوشەو ڕستەو
دەستەواژەو بە بەزەیی و مەرحەمەت و لەگەڵ چەردەیەك
لەخەم و دەردە دڵی خودی خۆیدا وەك بەناباشی زمان
بێ دایئەڕشتن. ئیتر کاتێ عەرزوحاڵچیەکەم هەڵئەسا.
سەرایش دەرگای پێوە ئەدا. ئەوسا منی هەر بە باوەش
هەڵئەگرت و هەر لە سەردەم ئەیخستمە سەرپشتی
مێزو پاڵ چاپەکەو مشمایەکی پیا ئەداین تا بۆ سبەی

ئەهاتەوە. بەشەو وەختم لەگەڵ حەرفەکانی چاپدا
ئەبردە سەر. لە پێشەوە هێندە ڕوویان نەئەدامێ. بەڵام
دواتر ئەو حەرفانەم یەکەیەکە هەمووناسی. ئەو حەرفانە
قسەی خۆشیان بۆ ئەکردم لە ئەلف و بێکەی ناو خۆیان
هەموو شەوێ وشەیەکیان فێر ئەکردم. چاك لەبیرمە،
حەرفی ئەلف جگە لە خۆی حەرفێکی دیکەی سەرخڕی پێناساندم
لە دواییدا "ئاو" م نووسی. شەوێکی تر دووانی تری
پێناساندم یەکێکیان ئەتوت مراوی ناو جۆگەیەو ئەویتریشیان
هەر ئەتوت دارلاستیکەو ڕوو لەو لایە. ئیتر من "ئازادی"م
نووسی. شەوێ وتیان ئەمە "ج"ەو ئەمە "ز"ەو
ئەمە "ژ"ەو، ئابەوجۆرە، تا چەند مانگێ و هەستمکرد
من کورسیەکەی جاری جاران نیم. پڕم لە چاو، پڕم لە گوێ،
پڕم لە بیر، لە هۆش و گۆش. ئا بەو جۆرە ئیتر کەوتمە
کاغەز نووسین بۆ درەخت و بۆ باران و بۆ کەژان و بۆ باڵندەو
بۆ هەر شتێ خۆم بمەوێ. شەو لە دوای شەو وەکوو لاولاو
بە پەنجەرەی وشەی نوێدا هەڵئەگەڕام. گەشەم ئەکرد.
تا واملێهات، بە تەواوی شیعری قانیع بخوێنمەوەو
لەبەریانکەم ـ قسە قسە ڕائەکێشێ— من بۆ خۆیشم لەوەو بەر
زوو ئەوم دیبوو. هەر لێرەدا، ڕێکەوتووە، هەشت نۆ
جارێ ئەوم لەسەر دانیشتووە. قانیع لە نانی برژاوو لە
کونجی و کەشك و دۆینە و لە ڕێحانەی گوێ ئاو ئەچوو.
هەر لە شار بتڕازایتایە لە هەر شوێنێ لاتبدایە ئەوت ئەدی.

لەجۆگەلەی ئاشەكاندا مراوی بوو. لە مێرگەكاندا كەنیسمەو،
لە مزگەوتدا زۆپای دارو، لە ماڵاندا هەنجیری وشك و
باسووق و، لە كێڵگەدا تیتراوسك بوو. چاك لەبیرمە
هەر لێرە بوو. نیوەڕۆیەكی بەهار بوو، كە وەختێ خۆیكرد
بە ژووردا یەك لەواشەی گەرمی پێبوو، هات و لەسەر من
دانیشت و داوای ماستاوێكی كردوو، دوای ئەوەی دەستی
بەتاڵ بوو.. دەفتەرێكی كاغەزبۆری لەبەرباخەڵی دەرهێناو
كەوتە نووسین. لەبەرخۆوە دێڕەكانی ئەوتەوە. هەتا
شیعرەكەی لەسەر من تەواو نەكرد نەچووە دەرێ. باش لەبیرمە
ئەو شیعرەیشی بۆ فەسڵی پاییز نووسیبوو!.
منیش لە باسەكەم لامدا. بابچمەوە بۆ ناو سەرا.
بیرم نەبوو خاوەنەكەم "نوری عەریزە نووس" یان
پێئەوت. ناوی باوكیم بیرچۆتەوە. پیاوێ بە ژەهرەوە
ئەخورا. ڕێزی من و ڕێزی درەخت و سروشت و
ڕێزی قەڵەم و كاغەز و هەژارانی زۆر لەلا بوو.
جگە لەوەیش شاخ پەرست بوو.
نوێژی بۆ ئاوو بۆ بەردو بۆ درەخت و خاك دائەبەست.
هەموو جارێ بە هاوڕێ نزیكەكانی خۆی ئەوت "باشە ئەگەر
ئەم شاخانە، دەستیان نەدایەتە دەستمان، وەك پێدەشت
بێدەست بونایە. ئەبوو بچوینایە بۆ كوێ؟!"
ـ ڕۆژباش! كاكە نوری عەریزە نووس!
ـ ڕۆژباش!

من خەمی سپیی دار سێوێکی مێینەی نەفرەتیم لە باوەشی
وەرزێکی دڵڕەقدا بۆ هێناوی. تۆ ئەتوانی بەو
داڕشتنەی خۆت، کاریگەرتر، لەوەی زمانی هەڵقرچاوی
جەستەم پێیەتی، زیاد لەوەی هەلاهەلابوونم پێیەتی،
چی تازەتر بنووسی؟! بۆ ئەوەی دڵی خواوەندی نێر و مێژووی
نێرو پێغەمبەری نێر نەرم بکەیت؟! کاکە نوری عەریزەنووس!
ڕۆژباش! من ئازارێکی مێینەی ڕاونراوی ئەم وڵاتی
یەکانانەم، تۆ ئەتوانی چیم بۆ بکەیت، دادم بەری بۆ
لای کێ؟! زریکەم حەواڵەی کام ئاسمان بکەیت کە نێری
لێنەبێ؟! بۆ ئەوەی چەند چرکەیەك گۆرانیی ژنێتی وێرانکراوی
خۆم بڵێم و هیچ نەبێ یەك پیاسەیش بە تازەترین شەقامی
خوێنی خۆمدا بکەم!. کاکە نوری عەریزەنووس! ڕۆژباش!
چیم بۆ ئەنووسیت؟! ئەشکەنجەیەکی نوێم بۆ هێناویت،
سەر بکات بە هەر شوێنێکدا بۆنی بۆکڕووزی ژنێتیم
ئەگرن!. بەڵام هەموو کەپوویەك ئەم بۆنەی ناگاتێ
ئەو کەپووانە نەبن کە ئاگایان لە دەردی گوڵەگەنم و
لە گینگڵی شەوانەی باخەکانمانە، ئەوانە نەبن، بارانیان
تیا ئەبارێ و ڕۆحیان چۆتە ناو ڕۆحی شیعرەوەو هەتاو
چاویانە!. چیم بۆ ئەنووسیت؟! لە قیژەم ڕەوانترو ڕوونتر
بێت؟! لەو غەدرانەی لە جەستەم کراون دیارتر بن؟!
من ژنێکم لە پەلکی وەریو، ئەو دەمەی باگژەی پیاو، بۆ
شوێنی نادیارو گۆڕیچەی بیرچوونەوەی ئەبات. ژنێکم لە

هاواری کەڕەواڵە. لە تەماشای نابینا. لە زایینی نەزۆك.
لە بژوێنی مردوو. لە ئاسۆی هەناسە سوار. لە ڕێگای بێ ڕێگاو
لە بارانی وشك و برنگ. من ژنێکم، یان هەرمێ گوڵاویەکی جوان،
لەناو لەپی دەستی پیاودا بۆ هەڵفلیقانەوە!. دە بنووسە!
ڕەوان بێژی ئازار بەتەنها لای برینەکان خۆیانن دە بنووسە
بۆ پیاوەکان عەریزەیەك بنووسە بۆ ئاسمان، بۆ زەریاکان،
بۆ چیاکان و بۆ هەموو جیهان، بنووسە گەورەترین درۆ
لە ئادەمەوە تا ئەمڕۆ لەو پەیامانەدا بوو کە ناویان لێنرا
دادو ناویان لێنرا پیاوەتی!"
دوکان ڕۆیشت و دوکان هات و
کورسی هات و کورسی ڕۆیشت و
لە دواییدا هاوینێك هات هەرگیز نەڕۆیشت
بەیانییەکی چاو پڕوپووشاوی هاوین بوو. گوێمان لێبوو جاڕێك درا.
دوای ئەو جاڕە. ژوور هەناسەی لەخۆی بڕیو شەقام خنکاو
کۆڵان تاساو. خودەی ئاسن ڕژانە سەرجادەکان و قەمەکان
چوونە ماڵان و، چون باوڵێ سەری شاریان دادایەوەو
قفڵیان لێدا. "نوری"یش نەهات مشەمامان لەسەرلاداو
وەکو ڕۆژانی ڕابوردوو بێ لەسەرم دابنیشێ و دەستکاتەوە
بە قرتەقرت. کەسێ نەهات بەلاماندا. دوای چەند ڕۆژێ
لەڕێی (با)یەکی وێڵەوە کەڕێی کەوتبووە "حامییە"و خۆیکردبوو
بە (با)یەکی عەرەب زوبان. دوای دەربازبوون هاتە لامان
ئیتر ئەوسا تێگەیشتین چی ڕوویداوە. (با) کە وتی: من ئەزانم

جارێکیتر عەریزە نووسەکەی ئێوە نایەتەوە! وتمان
بۆچی؟! وتی: جوندییەکی مردن، خەڵکی "ڕاوە"، ڕایگرتوەو
پێی وتوە: وەرە تفێ لەم جامانە سوورەبکەو لەو شاخانەو
ئەوسا ئیتر بچۆرەوە بۆماڵەوە! عەرزوحاڵچی ڕوویکردۆتە
سەربازی مەرگ پێی وتوە: تەنها یەك تفم پێماوە،
ئەویش بۆ ڕوخساری تۆیەو بۆ ڕوخساری تاعونەکەی بەعسەو
من ناچمەوە بۆ ماڵەوە!
لەوە بەدوا
ئیتر شەوان لەئاسمانی ئەو هاوینە بێوەژنە
تەم پۆشەدا
پۆلێ جریوە دەرکەوتن
تا ئەوکاتە نەبینرابوون
جریوەکان نزمبوون و هەتا نزیکی سەربان و
ناو چیغی ماڵان ئەهاتن.
هێندە نزم، منداڵان خۆیان هەڵئەبڕی
چەمکی کراسی سوریان و
قژی ژاکاویان بگرن و
دوایی خۆیان بەشان و ملی برین و
تیشکی زەردیاندا هەڵواسن!
پۆلێ هەور
سیانیان لە شێوەی سێ تۆپداو
سیانیان لە شێوەی قەڵەمداو

هەندێکی تریان لەشێوەی ئەسپ و کەڵ دا.

تۆپەکان ئەچنە خوارەوە

ناو یاریگاو

قەڵەمەکان ئەچنە خوارێ

بۆ ناو پۆلی قوتابخانەو

"ئەسپ و کەڵ" یش

ڕووئەکەنەوە گەڕەك و

حەوشەی ماڵان.

هەورێکیشیان

لە شێوەی پەڕەکاغەزدا

بەرەو سەری سەرێ ئەڕواو

عەریزەیەك بۆ خوا ئەبا!

ئا بەمجۆرە

ڕۆژ هات و چوو

بەڵام حوزەیران قەت نەچوو

ئەو ڕۆژانە بۆنی خوێن هێشتا لە شاردا هەر ئەگەڕا

تاعوونەکان، دوو دوو سێ سێ، لە دووڕیان و

سەر سووچ و گۆڕەپانە گەورەکاندا ڕاوەستابوون.

بەیانییەك سەعات یانزە. قۆمیسەرێك و پۆلیسێ

بە تووڕەیی پەیدابوون و وەك خوارەبا[20] مشەمایان لەسەر

لادابن. دایانگرتین. قۆمیسەرەکە چاپەکەی

---

[20] خوارەبا: نەڕەشەباو نە شەماڵ.

خستە باوەشی خۆیەوەو، پۆلیسەکەیش، منی
دایە دەست حەماڵێ و وتی بیبە بۆ ناو بازاڕ
بۆ ئەو شوێنەی کە پێموتی!. ساتەوەختێکی ناخۆش
بوو، کە دابڕام لە مامۆستام، لە چاپەکەم. بۆ دواجاریش
چاوم لێبوو لە دوورەوە قۆڵی شکاوی هەڵبڕی و
منیش سەرێکم بۆ لەقان. خۆم بەخۆم وت: تازە
هەرگیز جارێکی تر من ئەو کەسە نابینمەوە کە لە شەوانی
درێژی ئەم شوێنەدا فێری ڕووناکیی کردم و ڕێگای
هەتاوی نیشاندام!.
من لەسەر شانی حەماڵ و بەشەقامی "مەولەوی"دا
شۆڕبووینەوە. لە بەردەمی چایخانەکەی "مام ساڵح"دا
گەنج بوومەوەو چاوەکانم ڕوونبونەوە. وەختێ سێ
کورسی هاوڕێی دێرینی خۆم بەدییکردو ناسیمنەوە
سێ لاوی زۆر قۆز لەسەریان دانیشتبوون: قادر دیلان و
فەرەیدون عەلی ئەمین و ئەنوەر ئەدهەم!
گەیشتینە مەزاتخانەی ناوبازاڕو حەماڵەکە لەبەردەمی
دوکانێکی پیرەمێردی پەککەوتەدا، سەرجەنجاڵ بە
شڕکەوپڕکەی کۆنی دنیا، منی دانا. کەوتمە لای
عەلادینێکی کوێرە مووشەی سك قوپاوی زۆر بڵێوە.
لەدوای ئەوەی یەکمان ناسیی ئەو پێی وتم:
ئەگەر تەندروستی تەختەکانت باش بێ لێرە زۆر
نامێنیتەوە!. کورسی قەت پەکی ناکەوێ چونکە

گشت وەرزێ ئەیەوێ، بەدبەخت ئێمەین بەم
هاوینە کێ ڕووئەکاتە لای ئێمە! خۆ ئەمساڵ زستان
هەر نەبوو! پێرێ دووکورسییان هێنا. یەك ڕۆژ
لێرە نەمانەوەو بە پیکابێ لەگەڵ هەندێ شت و مەکی تردا
بردیانن بۆ بازیان.
ـ بازیان بۆ؟!
ـ چایخانەیەکی تازەیان کردۆتەوە.
ـ من حەز  لەدەرەوەی شار ناکەم!
ـ بەڵام کێ گوێ ئەداتە حەزی ئێمە. هەر بۆ ئاگاداری
خۆیشت. بەر لەمانگێ کورسیەکی وەکوو تۆیان هێنا،
بەباڵاو ڕەنگ ڕوویش کوت و مت هەر لە تۆ ئەچوو.
ئەزانی چی؟! بردیان بۆ مەیتخانەکە! ئەی چۆن!
جا دەرەوەی شار خراپە یان ناو هۆڵی مەیتخانە؟
ـ چییە؟! ئەتەوێ بمانترسێنی؟!
ـ ناتترسێنم!. بەڵام ئەمەوێ پێتبڵێم خراپ
هەیەو خراپتریش. ئەی وانییە؟!
ـ نازانم چی بڵێم! هەر بەم ئاخری عومرەوە نەبین
بەمەسخەرەی مردوو شۆرو مەیتەوان و مەیتەرەکان باشە!
ئا بەمجۆرە
مەزات هات و مەزات ڕۆیشت و پیریی هات و گەنجی ڕۆیشت و
منیش لەناو ئاپوورەی شڕکەوپڕکەدا و لە بازاڕێکی
بێگوێدا خۆم بینیەوەو چاوەڕێی چارەنووسم بووم

بەڵام ئەمەوێ لێرەدا بوەستم و
بگەڕێمەوە بۆ دواوە،
بۆ شەڕی بەردەرکی سەرا.
کورسیەکی سەرپەڕ: ببوورە قسەکەیشت پێئەبڕم. باشە
لەشەڕی بەردەرکی سەرادا تۆ لەکوێ بووی؟
کورسیەکە: هەر لێرەبووم! بۆچی؟!
کورسیەکەی سەرپەڕ: چونکە ئەبوایە لەویەوە دەست پێبکەیت!
کورسیەکە: مەرج نییە! لەم ساتەوەختەوە ئەگەڕێمەوە
بۆ ئەوسا. وەك پێشتریش خۆم پێموتن من دووجار
لێرە بووم. جاری یەکەم ئەوسا گەنج بووم. دوای شەشی
ڕەشی ئەیلولیش، هەر لێرەدا. دایان بە سەرمانداو منیش
لەگەڵ چایچیەکەمدا گیرام، بەخۆڕایی دایانم بە
وەردیانێ، وەردیانیش فرۆشتمی بە دەلاَلێ لەناو بازاڕ
ئیتر بەو جۆرە وەك گوێتان لە حیکایەتی ژیانم بوو
خاوەنەکەم وایزانیبوو من نەماوم. ئاخر ئەمیش هەر وەکوو
خۆم هەورامییە. زۆر گەڕابوو بەلاَم منی نەدۆزیبۆوە
دابڕانەکە درێژبوو زۆر درێژ بوو. تا گەیشتمە مەزاتخانەو
تەنیشت عەلادینە هەڵەوەڕەکە. لەوێ ڕۆژێ هەر بە ڕێکەوت
چایچیەکەی جارانی جارانم منی بینی و ناسیمیەوەو
کڕیمیەوەو منی هێنایەوە ئێرە!
کورسیەکەی سەرپەڕ: سەرەتات کرد بە کۆتایی؟!
کورسیەکی تر: با چیرۆکەکەی تەواوکات!

کورسیەکە ـ دەست ئەکاتەوە بە گێڕانەوەی بیرەوەریەکانی ـ
وەکوو وتم من ئەو دەمە
کورسیەکی هەرزەکاری خوێن گەرم بووم
نە لە مشار نە لە بزمار نە لە ئاگر نەئەترسام
زۆریش نەبوو هاتبوومە نێو شارەوە
هەر لێرەبووم
هەمووی پێنج ڕۆژ بوو کە ئەیلول
دەستی گرتبوو بە قەدی ئەو ساڵەوە.
دەستی ئەیلول
بۆنی گوڵ مێخەکی "وەیس"و
بۆنی گوڵە عەتری "نالی"و
دارمێوەکەی ماڵی "سائب"ی لێئەهات.
گەڕەکەکان ڕستێ بازنی شووشە بوون
لە دەستی سلەیمانیدا و دنیا بچووك.
هەمووی پێنج ڕۆژ بوو کە ئەیلول
لەبناری ئەو ساڵەوە
خل بووبۆوە بۆ مێرگەکانی جوولەکان
هەموو شتێ لە "با" یەکەی کانی باوە
تا ئاسکەکانی کانێسکان
تەڕتەڕ بووبوون بەگۆرانیی و دەنگی ڕەشۆل
بەبارانی ئەو قەتارەی..
لەناو دلۆپی سەوزدا

چرا بوون و لە شەوانی ئەم شارەدا دائەگیرسان.

ڕۆژی شەشەم بەیانیی بوو

جادەو بازاڕو قەیسەری

چرپە چرپێکی سورباویان تیا تەنییەوە

باڵی چرپە سات لەدوای سات گەورە ئەبوو

"با" ئەیبردو گڤەی هەواڵ هەتا ئەهات

بەرینتر و تیژتر ئەبوو.

یەکەمجار بوو لە ئەشکەوتەوە هاوارو

لە شاخەوە، لە خێڵی ئەسپەکانەوە

ئازادی بێتە خوارەوە

بۆ سەرجادەو

دەنگ هەڵبڕێ کتێبی شار!

ڕۆژی شەشەم لە پڕێکدا

ئیتر سامالّی ئەم شارە

وەك ئاوێنە هارەی کردوو کەوتە خوارێ و

وردو خاش بوو

لەو شەقامەی ئەوبەرەوە

هەتاو سەرتاپای خوێناوی و

سەرا گوڵخەنی دۆزەخ بوو ئاگری گرت و

قشڵە بوو بە قشڵەی مەرگ و

دووکەڵ چووە چاوی خواوەو، قرمە ژن بوو.

پرسیار وەکوو منداڵ کوژراو

خەون وەکوو شیعر کوژراو

ئاو لێڵایی دیدەی هات و

ئەم پەنجەرانە کوێر بوون و

ئەو دەرگایانە کەڕبوون و

چەندین درەختیش لەبەری ئەوبەرەو

بۆ ئەمبەر و یان سەر بەرەوخوار هەڵاتن!

ئەو پاییزە، لەبەر سەرا

زریکەکەی بوو بە گەردەلوولی شین و

فرمێسکەکانی بە گەڵاو

گەڵا کەوتنە سەر برین و بوون بەچرا.

قرمەژن بوو.

من لێرەوە چاوم لێبوو

هەندێ پەپوولە پاییزەی

هەڵاتوو لەدەس باگژەی حکومەت و

هەندێ لە شیعری "بێکەس"و

دوو سێ مەقامی "ڕەشۆل" و

چەند دارێکی "سەعید دارتاش"

خۆیان کرد بەم داڵانەدا

من خۆم بینیم

پەپوولەکان بوون بە وشەو

مەقامەکان بوون بە جۆگەو

شیعرەکان بوون بە باڵندەو

دارەکانیش بوون بە داری

خۆرو ئاڵا!

ئەو ڕۆژە من پڕبووم لە تەم

خەم لەسەرم دانیشتبوو

ئەو ڕۆژە من ئازاربووم و

تیغ لەسەرم دانیشتبوو

ئەو ڕۆژە من هەڵئەقرچام

گڕ لەسەرم دانیشتبوو

هەر ئەو ڕۆژە

وەختێ کە ئێوارە داهات

لە جێی زەردە، ئاوی سوور هات و بە چایچی و

بە وەجاخ و بە سەماوەرو بە پیاڵەو ژێرپیاڵەوە

هەر هەموومانی داپۆشی.

ـ ئەو ڕۆژە ئەم شارە کەوتە ناو بێژنگی ڤیژەوەو ڕووناکیی

لە دەستی بەیانیی بەربۆوەو پرشنگیش وەك گەڵای هەڵوەریو با بردی.

ـ بەڵام تۆ نەتبینی هەر لە ژێر ئەو جەستەی خەزانەو

هەر لە بن خەمانی سروشتا. هەمان سات. ساوایەك

لە شێوەی هەڵاڵەو بەیبووندا ئەڕسکاو، زرنگەی

دوا ڕۆژێ لەودیوی بیستنی ئێمەوە ئەهات و ئەگەیی.

ئەمجارە لەزاری کێوەوە من نەبووم بە هاوار. ئەمجارە

من زارم پەنجەرەی کتێب و هاوارم شەقامی

درێژی ناو شار بووا.

ـ چیم نەدیوە؟!

چەندین نەوەی جیاجیای کورسیم بەرێکردو

خۆم مامەوە. چەندین دەرگای خائینم دی.

چەندین مێزی بەرتیل خۆرو گەڵێ تەپڵەکی بێبارو

چەندین شمشاڵی دڵدارو چەند تەختەبەندی بێئاگا

لە ئازارو چەندین کەمانچەی عاشق و چەند قەڵەمی

لانەوازیش. گۆچانێك هەبوو دوراو دوور

من ئەمناسی ئەو گۆچانە خاوەنەکەی برد هەتاکوو

سەر هەڵدێرێ و کەمەی خۆی لەدەست دەرهێناو

ئەویش بۆ خۆی کەوتەخوارێ. پەنجەرەم دیوە

لەگەڵ دز شەریکبوون و ڕەفەم دیوە کتێبی خۆی

داوە بەگرت. جارێك چوارچێوەی تابلۆیەك دەستی

چووە ڕەنگەکانی و گشتیانی کوشت. درەخت هەیە

بەدەستی خۆی ئاگردێنێ و گڕ بەرئەداتە بێشەکەی.

بەڵام درەختیش هەبووە

لەسەر بنچکێکی نزار، لەسەر حەقی هەڵافەیەك[21]

کەوتۆتە شەڕی تەورەوە

هەتا بە پێوە مردووە.

شەنم دیوە، لەسەر مافی، چەند سەمەڵێ گوڵەگەنم

چووە بەگژ کێڵگەیەکدا و پەنجەکانی لەسەر سنگی چەقاندووە.

---

[21] هەڵافە: چەکەرەی گیا.

خۆم نەمدیوە بەڵام ئەڵێن پردێ بووە:
ئەو وەختەی پشتی شکاوە
دووسێ ڕێبوار لەسەری بوون
پردە بەدەم ئازارەوە ناڵاندویێتی و خۆیگرتووە
تا ڕێبوار پەڕیونەتەوەو
ئینجا ئیتر خۆی کەوتووە.
بیرتان نەچێ!. درۆزنترین کورسی ناو دنیا کورسی
دەسەڵاتە. ئازاترین کورسیش، کە دەگمەنن و
ژمارەیشیان ئێجگار کەمە. ئەو کورسیانەن ئەوێرن
پرسیار بکەن و بەگومانن و هەموو جۆرە چارەنووسێ
قوبوڵ ناکەن، تەنانەت تیاشیاندا بووە، ڕاستەوخۆ،
چۆتەوە بەگژ خوای دارتاشدا!.
خۆم نەمدیوە، بەڵام ئەگێڕنەوە ئەڵێن:
لەبەر ئەوەی کۆڵەکەیەك بەزۆر ئەیکەن
بەستوونی هەرە گەورەی سەربازگەیەك
نیوە شەوێ بەهاوکاری کاریتەیەك
شان لەژێر بینا دەردێنێو
خۆی ئەکوژرێو
سەربازگەکەیش ئەڕوخێنێ
کورسیەك هەبوو هاوڕێم، ئەسمەرێ بوو، خەڵکی کەرکوك،
کوڕی دار لیمۆیەکی شۆڕیجە. نیشانەی کانی خورمایەك
بەڕوومەتی ڕاستیەوە بوو. هەر بازوویەکی لە ملی هەر

یەکێکمان ئەستوورتر بوو. قاچەکانی پتەو پتەو،
دوو فەردە خوێیان ئەدا بە شانیاو کەچی نقەی
بۆ نەئەکرد. ڕۆژێ نایب زابتێکی ڕەش ڕەش
هات و لە دوورەوە دینارێکی بۆ چایچیەکەمان فڕێداو
هەڵیگرت و، ئیتر کورسیمان لێ ونبوو، هەتا چەند ساڵێ
نەمدیەوە، وەختێ دیمەوە زەرد بووبوو، باریك باریك هەناسەی سوار،
هەر ئەیتوانی منداڵێك بگرێتە باوەش.
ماچمکردو وتم ئەرێ بەڕاست تۆ چیت لێهات؟!
هەر دیار نەمای، نایب زابت تۆی برد بۆ کوێ؟!
وتی لێگەڕێ نازانی چیم بەسەرهات!، ئیتر ئەوسا
گێڕایەوە، چۆن چەند ساڵێ لە ناو ژوورێکی تاریك و
زۆر نسرما، دایانناوەو، کردوویانە بە کورسی ئەشکەنجەدانی
ژێر بەندەکان. شتی وای ئەگێڕایەوە پیاو بەنج ئەبوو.
ئەیوت: ڕۆژی وای تێئەکەوت لە ناوخوێندا شڵپەم ئەهات
ڕۆژی وایش هەبوو، من جەستەم، دەست و قاچم،
هەمووی هەر سلك و وایەری کارەبا تێیان ئالابوو.
جاری وا هەبوو ئوتویان گەرم گەرم لەسەر پشتم بەجێئەهێشت.
ئەیوت: زیندانیم ئەبینی وەختێ لەسەرم دائەنیشت
زۆر ڕیوەڵەو بچکۆلەبوو، کە چی نە شیشی داخ و نە
کارەبا و نە بوتڵ و نە پشیلەی برسی ناو گەڵ و
گون و نە چەکوش، نەیان ئەتوانی، یەك ناوی
ناو دەروونی لێدەربێنن. کەتەو زلی وایشم ئەدی،

به شکڵ و ناوقەد، لە مامە دارەبەن و خاڵە
دارتووەکانم ئەچوون. کەچی بەرلەوەی لەسەرم
دابنیشن، هەر کە ئوتۆکەیان ئەدی چۆکیان ئەشکاو
چییان لابوو هەڵیان ئەڕشت. دواییش بە چرپە پێی وتم:
ـ تکایە با هەر لە بەینی خۆماندا بێ ـ لەسەر من بوو
هاوەڵێکی "حەیدەری" یان
جنی و جنی و بەڵام تاکوو بوو بە قیمەیش ئاگام لێبوو پێئەکەنی!
کورسیەکەی سەر پەڕ: بەڵام تۆ هەر باسی کوردەکورسیت
کردوو نەچوویت بەلای گەلانی کورسی دنیادا؟!
کورسیەکە: بەداخەوە من نەچوومەتە هەندەران.
کورسی غەیرەکورد ناناسم، لەگەڵیاندا نەژیاوم.
بەڵام جارێك هەر لێرەبوو، کورسیەك هات،
بە بیچم و ئێسك و ڕەنگ و ڕوو لە کوردە کورسی
خۆمان نەئەچوو، ئاخر ئێمە، وەك ئەزانن زۆربەی
زۆرمان کورتە بالاین ئەو درێژو موو زەردیش
بوو. لەگەڵ بیست سەماوەری وارشاودا، هەر بە
پاپۆڕ، لە ڕێی زەریای قەزوینەوە، گەیشتبوونە
ئێران و، لە ئێرانەوە بۆ ئێرەو، بەو پلانەی بگاتە
ماڵی شابەندەر، بەڵام لەڕێگا ونبووبوو، وەکوو
وتم، تا ئەو ڕۆژەی پاسەوانانی شابەندەر، ئەگەڕێن و
لەم چایخانە بچووکەدا ئەیدۆزنەوەو، یەخەی
چایچیەکەم ئەگرن و لەدواییدا ئەیبەنەوە.

کورسیەکەی سەرپەڕ: باشە چۆن لە یەکتری ئەگەیشتن؟!
کورسیەکە: هەردووکمان کەمێ فارسیمان ئەزانی.
بەڵام ئەو زۆر خوێندەواربوو. چوارپێنج زمانی
ئەزانی و جگە لەوەیش "بەشی زانستە دارستانی و
کورسییەکانی" لە زانکۆی وارشۆ، تەواوکردبوو.
من لە زمانی ئەوەوە بۆ یەکەمجار ناوی گەلێ
کورسی بەناوبانگی ئەم دنیایەم بیست و زانی.
وەکوو کورسیە لەخۆباییەکەی ناپلیۆن، یان کورسیە
جوانەکەی چیخۆف کە بەداخەوە سیل کوشتی.
یان ئەو کورسیە ڕۆماننووس و قومارچییەی
کە سزاوتاوانی نووسی. یان قەنەفە کوژراوەکەی
پوشکین، یان ئەو کورسیە پیرەمێردەی
کە بۆ دواجار لە وێستگەی شەمەندەفەردا تەنیا و بێکەس و بێدالّدە
ڕۆحی دەرچوو. یان ئەو کورسیە شاعیرە مەزنەی لە حەبەشە
بە ئاوارەیی قاچیان بڕیەوە. یان کورسیە شێتەکەی مۆپاسان.
یان کورسیەکەی مادام بۆڤاری کە دووسێ جار ڕاپێچیانکرد
بۆ مەحکەمە. زۆر و زۆرو زۆری تریش!
کورسیەکەی سەرپەڕ: باشە تۆ پێتوایە کورسیەکانی
دنیا ئاگایان لە کورسی کورد زمان بێت؟!
کورسیەکە: هەموویان نا. بەڵام کورسیە
باشە ئینسانیەکان بۆ نا؟! ئەی هەر کورسیەکی

مەنگۆلی نەبوو، ویستی مەسەلەی هەموو درەخت و دارو
تەختەکانی ئێمە بەرێتە ناو کورسیەکانی
کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە!.
کورسیەکەی سەرپەڕ: بەڵام ئاخر لەدوا ساتدا
پەشیمان بوەوە!
کورسیەکە: ڕاستە!. ئەوە کورسی دەسەڵات
پەشیمانی کردەوە. ئەی کورسیە سدارە سپیەکەی
نەهرۆ؟! ئەی کورسیە تورکەکەی ئیسماعیل بێشکچی!
ئەی کورسیە عەبا بەشانەکەی لیبیا؟! ئەی کورسیە
مێیەکەی فەڕەنسا؟! لەم لاو لەولا کورسی تریش.
کورسیەکەی سەرپەڕ: زۆر سوپاس، بەڕاستی ماندوومان کردی.

چەندین نەوەی جیاجیای کورسیم بەڕێکردوو
خۆم مامەوە. چیم نەدیوەو کێم نەدیوە.
چەند جار "ڕەفیق حیلمی"م دیوە.
حەزی لەچایخانە نەبوو، دانەئەنیشت
بەڵام ئەگەر بیویستایە هاوڕێیەك
یان ناسیاوێکی ببینێ
هەر لەبەر دەرگای ئێمەدا ئەیبینین و
هەر لێرەدا پێکئەگەیشتن،
وەختی خۆیشی هەر دوراودوور، لەوبەرەوە
"حەمدی"م دیوە.

پیاوی بۆشناخی وا کەم بوو
بڕواتان بێ ئەو شێخ مەحمودی حەفیدە
لەشیعرەکانی ئەترسا!
لەبیرمدێ، بەیانییەك، سەلام لەسەرم دانیشت و
دوو سێ چوارینەی خەیامی کرد بە کوردی.
لەبەردەمما "خاڵەڕەجەب" نوکتەیەکی گێڕایەوە
دەرگای چایخانەیش پێکەنی.
جارێك بلە هەر لەسەر من
نامەی بۆ سوجادی نووسی.
لەبیرمدێ، "گیو" لە هەولێرەوە هات و ماندووماندوو
گەییە ئێرەو کامێرایەك بەشانەوەو
هەر هەواڵی شاعیرانی لەچاپچیەکەی من ئەپرسی.
"بەختیار زێوەر"یش جارێك
سدارەکەی لەسەر شانی من بەجێهێشت.
"مەحمود جەودەت" نیوەڕۆیەك
هەر لەسەر من خەوی لێکەوت.
جگەرەکەی بەداگیرساوی کەوتە ناوباوەشیەوەو
ناوکی سوتان و داچڵەکی.
هەر لێرەبوو، ئەوسا منیان لەسەری سەرێ دائەنا.
جارێکیان گەنجێکی بزێو، کە هەر ئەتوت کەڵەشێرێکی چاوشینی
پۆپنەڕەشە، هات و
لەسەر من دانیشت و کەوتە قسەی دانار دانار

سیحرێ لە وشەو دەنگیا بوو وەك موگناتیس ڕایئەكێشای
من لەوەو پێشتر نەمدیبوو. كە ئەو ئەدوا ئەوانیتر
هەر هەموویان دەم داچەقاو كپ ئەبوون و گوێیان ئەگرت
لە كورسیەكەی لای دەستەڕاستمەوە پرسی: ئەمە كێیە؟!
وتی: سەیرە چۆن ناینانسی: ئا ئەمەیە ڕەفیق چالاك!.
دیسان وتی: چاك لەبیرمە جارێكیان منیان هەڵگرت و
بردیانمە مەكتەبی "غازی". ئەم چاوشینە لەسەر
شانۆ، بوو بوو بە گوڵی خوێناوی!
ڕۆژێكی تر، نیوەڕۆیەك، هەروا بۆ چەند دەقیقەیەك
تەختەكانم ئارامیان لەبەر هەڵگیرا، هەر ئەوەنەبوو
لە بزمار یاخی نەبن و هەر یەكەیان بەلایەكدا هەڵنەیەن و
هەڕانەكەن. هەروا بۆ چەند دەقیقەیەك. بەكراسێكی
جاوەوە، سالە شێتم لەسەر دانیشت. بەردێك لەناو
قولی مشتیا. بەڵام دوایی بەوەی باش بوو لەپڕێكدا
هەستاو ڕۆیشت و چایەكەیشی تەواو نەكرد!
ئابەمجۆرە
كورسی ڕۆشت و كورسی هات و
شێت ئەڕۆیشت و شێت ئەهات و
جارێكیتر بیرمنایە لێرە بوو یان لەناو بازاڕ.
ئێوارەبوو، پیاوێكی ئێجگار شپرزە، دەست و پل و
لەش بۆیاوی. هات و لەسەر من دانیشت و فلچەیەكیش
بەدەستەوە. دووسێ جارێ فلچەی بەسەر پشتما هانی و

لەدوولاوە ڕەنگی گۆڕیم، ئینجا لەسەرم دانیشت و
کەوتەقسە. لەحەمامی سورەتەوە، ئەو هاتبوو. ئیتر زانیم
وێنەکێشە و ناویشی "حەسەن فەلاح"ە!
ڕۆژێکی تر، دڵم پڕبوو، هەرچەند ویستم خۆم ڕاگرم
بەڵام بەڕاستی نەمتوانی و ئەوسا دامە پڕمەی گریان. من
کورسییەکی عاتیفیم، زۆرجار کە تەنها خۆم ئەبم و
کەس دیار نابێ ئیتر بۆ بەختی خۆم ئەگریم. ئەو گریانە
وەك هەناوم بشواتەوە وایە. بابێمەوە سەر قسەکەم
ئەو ڕۆژە بۆیە زۆرگریام. "گۆران" لەدوای مەرگی
هیوا هات و لەسەرم دانیشت و، لەو بەریشەوە "بێکەس" ،
ئەویش شیعری "هیوا"ی ئەخوێندەوە. نەك هەر منیش،
چاوم لێبوو، هەموو کورسیەکانی ترو، چاوی زەردی
سەماوەر و چاوی قۆریی ئەسفەهانی و تەنانەت دووچاوی
وشکی وەجاخەکەیش پڕبوون لەئاو!.
کورسی هەیە نەفس نزم، هەر کەس لەسەری دانیشێ،
جا خوای ئەکرد جەللادیش بێ، شەرمناکاو، بەدەمیەوە
پێئەکەنێ. ڕۆژی وا هەیە سەدان کەس دێنە سەرم و
بەڵام من دڵم بەکەسیان ناکرێتەوە. جاری وایش هەیە
یەکێك دێ و من حەز ئەکەم هەرگیز لەسەرم هەڵنەسێ.
ڕێکەوتووە بۆ چەند ڕۆژێ، چاو لەڕێ بووم، ئەو کەسەبێ
خۆشمئەوێ. هەژارەکانم خۆش ئەوێ، چونکە ئەو
وەختەی لەسەرم دائەنیشن، زۆر سادەن و فیزلێنادەن

لەژێرەوە شەق لە لۆلاقم هەڵئادەن. بەڵام ئەوانەی
ئێجگار زۆر ماندووم ئەکەن، دۆمینەچین، هەر هەڵناسن.
جگەرەکێشی وایش هەیە، تەواو ناخۆشیانکردووە، قەیناکا
وتمان شاعیرە، بەڵام ئەو شێرکۆ بێکەسە هەتا ئێستا
لەسێ چوارلاوە قۆڵی سووتاندووم! لە هەمو شتێ ناخۆشتر،
دیمەنێکە گەلێ جار بۆ خۆم بینیومەو زۆر خەفەتم
پێخواردووە. ئەو داماوانەی هاتوون و دانیشتوون و
پارەی چایشیان پێنەبووە!

ئابەمجۆرە
دنیا ڕۆیشت و دنیا هات و
بازنەی شەو، بازنەی ڕۆژ
سوڕانەوەو، کورسیەکیش لە ناویانداو
لەگەڵیاندا خولایەوە و خولایەوە
هەتا گەیشتە ئەم ساتە.
"قەنەفەکە کە تا ئەوکاتە نوستبوو لەدەنگی کۆکەی کورسیەك خەبەری
ئەبێتەوە"
کورسیەکەی سەرپەڕ: "ڕووئەکاتە قەنەفەکە"
ئەستەموولْ خۆشبوو؟!
قەنەفەکە: ماندووم. ماندووم! تۆ نازانی ڕۆژی
پێشوو کابرایەکی کەتە جگە لەخۆی
فەردە شەکرێکیشی لەسەر دانابووم.

کورسیەکە: وا کازیوە خەریکە لە ڕەشایی شەودا تاڵە
زیوینەکانی پرچی خۆی وردە وردە بەر ئەداتەوەو لەپاش
تۆزێکی تریش بەدڵنیاییەوە پەنجەرەی هەتاوی ڕۆژێکی
تازە ئەکاتەوە. من یادەوەریەکانی خۆم بۆ گێڕانەوە. شەوی
داهاتوویش گوێ لە برای ئازیزمان کورسییە سنەییێکە
ئەگرین. من دوا قسەم ئەوەیە وەسێت ئەکەم هەر
وەختێ مردم و ئێوە لێرە بوون بمسوتێنن بۆ ئەم کارەیش ئاگری
وەجاخەکە یارمەتیتان ئەداو پێموتووە.
ئەوسا خۆڵەمێشەکەم بکەن بەسەر هەر عەرزێکدا
کە لە هەناوی خۆیدا تۆوی ژیانی بۆ ڕسکانی درەختی تازە هەڵگرتووە.
لە دواییدا سوپاس بۆ گوێگرتنتان

★

منی نووسەری ئەم دەقە لە زەمانی کۆلێراکەی
بەعسیاندا، وەکوو زۆر شیعرو چیرۆك و شانۆنامەو
پەخشانی تر، وەکوو زۆر خۆشەویستی بێداڵدە،
گەلێ گۆرانیی ڕاونراو. گەلێ پەپوولەی پاییزە،
ڕوومکردە شاخ و دەربەندی ئەستێرەکان. لەوێشەوە
وەکوو باڵندەی کۆچەری یان هەورێکی سەر هەڵگرتوو
گەیشتمە ئاسۆی هەندەران. بۆ چەندین ساڵ غەریبی
بوو بەهاوسەرم، نامۆیی بوو بە ناونیشان. هەموو جارێ
لەو دوورەوە کورسی چایخانەکەم بیربوو لەخەویشما

ئەچوومەلای یان لەسەری دائەنیشتم. خەوێك چەند
ساڵێکی خایاند. منی نووسەری ئەم دەقە وەختێ گەڕامەوە
لای شار، ئەمنە سوورەکە کەوتبووە دەست دارهەنار. بە داڵانی
ناو سەرادا "ئەی ڕەقیب" پیاسەی ئەکردو، لە حامیەیەیش
خوێنەکان بووبوون بەچرا. گەیشتمەوە لای دارهەنار. خەون
هاتبووە سەرجادە. لەسەر شەقامی مەولەوی باوەشمکرد بەبارانە
سەوزەکاندا. لەسەر "کاوە" موحەڕەم محەمەد ئەمین"م بینی و
تێر ماچمکرد. لە بەردەم باخی گشتیدا "شاکیر فەتاح" بەرەو ڕووم
هات، گوڵەکەی یەخەی خۆی دامێ و پێشی وتم: "عبدالخالق"
لەهەولێرەوە هاتووەو بۆت ئەگەڕێ و زۆریش سڵاوت لێئەکا!.
لەبەردەم ئینزیباتخانەکەی جاراندا، چوار پێنج هەزار
چۆلەکەو پەڕەسێلکەو، کەروێشك و سمۆرەو کارمامزو
جوانوو، کۆبووبوونەوە. لەناوەڕاستی هەموویشیاندا،
"کەمال سابیر" سواری ئەسپێکی سپی سەرخۆش بووبوو.
ئەسپەکە مەست و چاوی ڕاستی بۆ هەڵنەئەبڕدرا،
"کەمال"یش بە دەستێك جڵەوی ئەسپەکەو بە
دەستەکەی تریشی، ملی چارەکێکی "فەل"ی گرتبوو.
ناوبەناو قومێکی لە فەلەکە ئەداو، ئینجا نوکتە لە دوای
نوکتەی بۆ ئەو ئاپوورەیە ئەگێڕایەوە. ئەوانیش
بە باڵ و بە دەنووك و بە گوێچکە چەپڵەیان بۆ لێئەدا،
هەرا بوو هەرا، بووبوو بە کەرنەڤاڵی پێکەنین. لە
"تووی مەلیك"، پەیکەرەکەی کاوەی ئاسنگەر بەخۆی و

چەکوش و بەرکۆشەکەیەوە لەسەر سەکۆکەی هاتبووە
خوارەوەو لەناو خەڵکەکەدا هەڵئەپەڕی. بەڵام لە
هەڵپەڕکێی ئێستای کوردی نە ئەزانی و، مامەڕیشە
چووبوە دەستیەوەو فێری ئەکرد چۆن هەڵپەڕێ.
لەسەر منارەی مزگەوتی گەورە، حاجی "لەق لەق"ێکم بینی
ویردو تەزبیح و بەرماڵی خستە لاوەو کەوتە سەماو
باڵێکی کرد بە گیتارو ئیتر کەوتە موزیك لێدان. لەسەر
جادەی سابونکەران، سی چل ژنە قەلەڕەشکە،
ئاگرێکی گەورەیان کردبۆوەو یەك لە دوای یەك، عەبا و
حیجاب و پارتیۆو مانتۆکانیان لە بەری خۆیان داکەند و هەرهەموویان
فڕێدایە ناو ئاگرەوە هەتا تەواو تەواو سووتان.

هەر لە تەنیشت ئەوانەوە، سێ پیاوی ناسراوی هەمان جادە و گەڕەك، دەم بە خەندە، ڕاوەستابوون. هانیان ئەدان و چەپڵەیان بۆ لێئەدان. یەکەمیان بە دەنگێکی گڕ، قەسیدەیەکی شێخ نوری شێخساڵحی ئەخوێندەوە، کە لە بەیتێکیا وائەڵێ "دایگرن، توخوا فڕێیدەن بیخەنە تەندوورەوە/ حەیفە ڕۆژی ڕوون ئەنێنە ناو شەوی دەیجوورەوە!" دووەمیشیان هەمان شیعری بەخەتێکی جوان و گەورە لەسەر لافیتەیەکی درێژ
ئەنووسی. سێهەمیشیان دوا نوکتەی لەسەر مەلا دالآشێ ئەگێڕایەوە و نمرەیشی بۆ ئازاترین ژنە قەلەڕەشکەی ئەو کەرنەڤاڵە دائەنا. ئەو سێ پیاوەیش: نەجمەددین مەلای کەشتی نووح و خالید زامداری خۆشنووس و مامۆستای ماتماتیك عومەری عارف قاپ ڕەش بوون!.
لە کانێسکان، هەر لە سەرکانیە جوانەکەی، لەناو ڕەوە

کەڵ و ئاسکەکاندا کێم بینیەوە؟! ئای خودایە! خۆ ئەوە
"نوری حەمە عەلی"یە، ڕانکوچۆغەی گوڵی ژاڵەو،
پشتێنەکەی لە گێلاس و سەروقژی گوڵەباخ و جووتێ کلاشی
هەورامیش، کردبوونی بەسەر پێوەو، ئەویش هەر سوور!.
کەباوەشمان بەیەکدا کرد هەزار پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ تێمان
ئالان. ئای نووری گیان! سەرتاپات سوور ئەچێتەوەو
بووی بە یاقووت. لەکوێوە بۆ کوێ نوری گیان؟! نوری
وتی: لە نادیارەوە بۆ نادیار، بەڵام تۆ لەوەیان گەڕێ،
باشبوو دیمیت، پرسیارێك هەیەو شەوو ڕۆژ هەر لەگەڵما
ئەگەڕێت و ئەویش بۆتە مەراقێکی سورو خەوی سورو
لە سەرما ئەسوڕێتەوە. پرسیارەکەم هەر ئەوەیە: بۆ منیان
کوشت؟! بۆ؟ بۆ؟ بۆ؟ من خەریکبوو شتێك بڵێم. لە پڕێکدا هەرچی
کەڵ و ئاسکەکانە هاواریانکرد: غەدر، غەدر، غەدر

ئیتر هەموویان لەگەڵ "نوری"دا وەرچەرخان و
ڕوویانکردە ناوگردان و لەچاو ونبوون!
لەسەر جادەی سەهۆڵەکە، چاوم لێبوو، سەروەت
سەوز و دوو تاوس و توتیەك و دوو سێ ئاسکی ڕەنگاڵە،
"ۆرك شۆپ"ێکیان دانابوو بۆ قوتابیانی قوتابخانەکەی
"لەیلا قاسم" و فێری وێنەکێشانیان ئەکردن. دووراودووریش، چاوم لێبوو،
"سەلامی مەلا سابیر"یش لە قوتوویەکی نەخشیندا نوقڵ و شیرینی ئەگێڕا.
لە خوارەوە نزیك مزگەوتی خانەقا، سابرێنێکی چەك بەشانیان

نیشاندام‌و، وتیان ئەمە لە خوتبەکەی ڕۆژی جومعەی
ڕابوردویدا، وتویەتی هەرچی ماکەوو هەرچی مریشك و
کۆتری مێیە، ئەوانەی دەنووك سوور ئەکەن، قاچ و
قولیان ڕووتئەکەن و کراسی درێژی پەڕلەپێیان نە
پۆشیوەو وەك عەلەشیش مانتۆکانیان لە بەرناکەن،
هەموو کافری موتڵەقن، مەلا سابرێن لەبەردەمی
مایکرۆفۆندا، فەتوایەکی دەرکردووە، خوێنی هەموو
ئەو قومری‌و کوکوختی و بولبولانەیشی حەڵاڵ کردووە
کە ساڵۆنی قژبڕینیان کردۆتەوەو یاخود هێلانەیان
نزیك زەنگی کڵێساکەی گەڕەکی گاوران و
لەسەر بورجەکەی داناوە.

هەر ئەو ڕۆژە چوومە بەردەم چایخانەکە. چاومگێڕا، کورسی تازەی
زۆرم بینی بەڵام کورسیەکەم دیارنەبوو. سۆراخمکرد. شڵەژابووم
دەرگای چایخانەکە وتی: تۆ بەشوێن کێدا ئەگەڕێی؟! وتم بەشوێن
کورسییەکی ئا لەو جۆرەو، قەنەفەیەکی عوسمانی و،
کورسییەکی خەڵکی سنەو نایانبینم. وتی کاکە تۆ ئەڵێی چی؟! لە گوێی کام گادا
نوستبووی. زۆر دەمێکە، هەشتاکان بوو، وەستا ئەو کورسیە و کورسیەکی ترو
قەنەفەیەکی عوسمانی، بەخشی بە ئاوەڵزاواکەی خەڵکی دەوروبەری کفری.
بەداخەوە جارێکیتر ئەو کورسیانەو قەنەفەکە بەدووچاو
نابینیتەوە! بەداخەوە ئەوانیش لەگەڵ مام وەیس و میمکە

خەجێ و، ئاوەڵ زاواو، گۆرانیەکی عەلی مەردان و جامانەکەی خودادادی
عەلی و چاکەتێکی "ئەثیری"دا. دوور دوور، دوور دوور،
سەر بەرەوخوار هەموو بران، ئەنفالکران!
چاوم لە خاڵێکی ڕەشدا، چەند چرکەیەك
بوو بە پەڕەسێلکەی قەتیس.
ئەو وەختەی سەرم هەڵبڕی
پەڕەسێلکەم بڵند فڕیو
لە تەختایی ساماڵێکدا هەورێکم دی
کە لە شێوەی "کورسیەکەدا"
هەمان کورسی
نزیك بە بارەگای خودا، دانرابوو
چاوەڕوان بوو، بە ئێجگاری
ئازادیی خۆی بێو لەسەری دابنیشێ.

سلەیمانی
2005/5/26

## له ماڵەکەی بێزاریدا..!

هەمدیسان، بێتاقەت، چون ژووری

وەڕس و قژ بژم، له جێدام.

بەیانیی له لەشما

هەتاوی نەخۆشەو، خەیاڵم

تەیرێکە فڕینی نوستووەو

نەغمەیشی گرمۆڵەی سوچێکی بێدەنگیی و،

چەقیوی خاڵێکی نادیاریش تەماشام.

باوێشکی درێژی دیوارو تەنیاییم

بەرامبەر پەنجەرەی چاو کزی

هێشتاکە بە پێوە خەواڵوو،

پەردەیەك.. مل چرچ و یەك بزەی

دەرەوەی پیێ نییەو،

کورسییەك.. هەمیشە چاوەڕێی یەکێکەو

ئەو یەکەیش قەت نایەت.

هەموویان ناهێڵن لێفەکەم

لەسەرخەو، حەزی خەو،

جەستەی خەو لابەرم.

ئیستاکە من نیوەم هەستاوەو

خاوخاوم و لۆکەم و شل شلم و
ئەمجارەیش لە دواوە دەستێك دێت
لە هەور نەرمتر
بۆ مشتیٚ خەویتر
بە پشتا ئەمخات و
بۆڵەیەك لە چرپاو
تلێك و، لەسەر لا بەتیلەی قرچۆك و
ڕیٚ ڕیٚ بووی نیگاوە،
عەلاگەی هیلاك و بێزاری
بیٚ بەرگی ژنانە، بیٚ ڕەنگی ژنانە
بیٚ بۆنی ژنانە ئەبینم و ئەوساکە
هەستئەکەم گەمیەم و
لە ژێلاٚ کون بووم و
خەریکم بەرەو بن دائەچم.
کراس و چاکەت و پانتۆڵم
خوارو خێچ وەستاون و بەیەخەی
سیسەڵەو، ئانیشکی قوپاوو،
پانتۆڵیش لۆلاقی یەکێکیان
درێژتر لەویتر.
هەموویان وەکوو من تۆپەڵیٚ تلێەبم
ناو ناخم ئەگوشن و..
ئەمێستا بەیانیم

وەك قژم ئاڵۆزکاو،

چرچ و لۆچ بینیم و

ئەو وەختەی لەجێدا هەڵئەسم

لەشووشەی شەرابی بەتاڵی دوێ شەوو

پەشۆکاو لە خەتی ڕەشنووسی

شیعرێکی شێتۆکەو وێڵ ئەچم!

☼

ماڵێکی ڕیش هاتووی سمێڵ شاش

بیجامەی موقەلەم لەبەرداو

ملپێچێ لە تەم و گەواڵە لە ملداو

پەڵەیەك لەسەر سنگ دەمێکە بواردوێتی و

نارِوات و، دوو قۆپچەی سەرەوەیش

مانگ زیادە ڕۆیشتوون و هەڵاتوون.

ماڵێکی جومگەی لەش داهێزراو.

بەیانیان لە ناشتا جگەرەو تەنیایی

پێکەوە ئەکێشی و

لە دەریش

تلاوتل، تەقەتەق

تەنەکەی خۆڵەکەی

وەك "سەر"ی بەتاڵی ئەمڕۆی بێ

"با"یەکی درِ ئەیبا بەرەوخوار!

☼

ماڵێکی نێرینەی لەش تووکن.

دەنگی گڕ.

هەمیشە وەکوو خۆی

سەرمێزی تووڕەیە.

وەکوو خۆی مووبەقی دەرلنگ قوڕاویی.

چەرچەفی لوول خواردووی سەرجێگەی

بە وێنەی مەراقی و

وەکوو خۆی کوتومت دۆلابی لاوبالی و

ئاگری تەمەڵی و

وەکوو خۆی هەمیشە ئازارو

پشت پێشەی کورسیەکەی،

سەرپێشەی قەڵەمی و

دەم وشکیی کاغەزی و

دووکەڵی جگەرەی قەسیدەی.

ماڵێکی نێرینە

پێلاوی بەردەرگای هەمیشە نێرینە.

حاجەت و مەنجەڵی نێرینە.

شووشەی بۆن نێرینە

ڕەنگ زبرو پێست گرژو

نە مووروی ملوانکەو

نە گوارەو بازن و

نە بسك و

نە مەم و ستیانێ ئەبینێ و

خەریکە دیق ئەکا ئاوێنە!.

ماڵێکی نێرینە

نە (با)ی مێ سەرێکی لێئەداو

نە شەوێك پرچێکی تریفە ئەچێتە سەرشانی و

نە ڕۆژێ گوڵێکی موستیلە لە دەرگای ئەدات و

نە جارێ ڕەفتەیەك

سەرچۆپی دێڕێکی بۆ ئەگرێ و، هاوارە،

سێبەری دەستێکی مێیینەیش

دەست نادا لە دەستی!.

دۆشەکی دووکەسی و

سیسەمی دووکەسی و

بەتانیی دووکەسی و

"بەردەوام یەك "سەر"یش

هەر لەسەر دوو سەرین"



قاوەیەك ئەخەیتە بەردەمی تەنیاییت

قاوەکەیش هەر مۆنەو بە ڕەگەز هەر نێرەو

کووپەکەیش هەر وێنەی

پیاوێکی ڕاوکەری لەسەرە.

بێزارییت بە پشتی دوو پەنجە کووپەکە

بەرەو دوا لائەبات.

تەنیاییت لەسەر لا دەست ئەبات

بەڕێکەوت گۆڤارێك هەڵئەگرێ
ئەویش هەر سمێڵی سەربەرگی بابڕەو
سەر دێڕو مانشێتی، قایشی
پیاوانەی ئەستوورەو
وشەکان هەر هەموو وەك دەنکە
تەزبیحی ئەبلەقی نێو دەستیان
بێ خێرو
دووپەڕەو سێ پەڕەو
هەر پیاوەو مقەستەو
هەر ژنەو شریتەو
هەر نێرەو قۆچدارەو
هەر مێیەو نێچیری بێ قۆچەو
چوار پەڕەو پێنج پەڕەو
هەر بەژنی درەختی ئافرەتەو
کلێپەدار بۆ سەمای مردن و
هەر پیاوی خەنجەرەو بێدەربەست
لەکەنار ئەستێرکی خوێناوی
مانگێکی کوژراودا وەستاوەو
ئەوەندەو..
تەنیاییت دەست ئەگرێ
بەشانی ڕەقەڵەی پاییزی عومرەوەو
هەڵئەسێ و دوو هەنگاو لەولاوە

**ئەچێتە بەردەمی گوڵدانێ بەتاڵ و**

**بەلاچاو سەیرێکی سێبەری**

**هەڵاتووی ئەکات و**

**ئەبینێ: چۆن شیعر لەماڵی زمانی**

**خۆیدا خۆی، غەریبەو، ئەبینێ**

**پەنجەرە بە ژووری نامۆیەو**

**چوارچێوە بە وێنەی،**

**پەنجەی دەست بە دەستی و**

**شان و مل بە سەری و**

**لق و پۆپ بە قەدو، نامۆیە**

**ژێی گەرووی بە دەنگی.**

**ئەو وەختەی کە سەریش هەڵئەبڕێ و**

**سەعاتی سەر دیوار ئەبینێ،**

**ئەبینێ: چۆن پرچی دەقیقە**

**لە چرکە گیر بووەو**

**لای سەعات هەر شەوەو**

**ئایندەیش لەتەنیشت دوێنیەوە**

**نوستووە!**



**یەك پیاوی و کەچی شەو لەم ماڵی بێزاریی و ترسەدا**

**تۆ ئەکا بە دوو پیاو. بە دوولەش. بە دوو ڕۆح**

**ئەوەتا یەکەمیان: ڕاکشاو لە جێدا خەوتووەو**

لە خەویا وا لە دوای تابووتی خۆیەوە ئەڕوات و

دووەمیان: هەمان کات، هەستاوەو پەشۆکاو

سەرمێزو بن مێزو، هۆڵ و ژوور، بۆ ڕۆحی

بزری ئەگەڕێ و بێهودە هەر سەیری

بۆشایی و ماڵێکی چۆڵ ئەکات. ئەوەتا

یەکەمیان لە حەوشەی پاییزدا وەستاوەو

ئەوەرێ و هەمان کات دووەمیان

بە تەنیشت ئەوەوە وەستاوەو لە باوەش

بەهاری شیعرێکدا خەریکە گوڵ بکات.

یەك کەسی و کەچی شەو لەم ماڵی بێزاریی و

ترسەدا، تۆئەکا بە دووکەس. بە دوو

ڕەنگ. بە دوو دەنگ. ئەوەتا

یەکەمت لە ژووری شیعرێکی کۆماوەو

پیرپیرەو، هەمان کات، دووەمت،

لە دەرێ جوان جوانەو پێکەوە وشەو

عەشق، لە خوێنیا قوڵپ ئەدات!.

ئەوەتا، یەکەمت، گێژەنەو بە دەوری

نادیاردا خول ئەخوات. هەمان کات

دووەمت ئاوێکی ڕەوانەو لەسەرخۆ

ڕێ ئەکات!. ئەویان تەم ئەپۆشێ و

ئەمیشیان سایەقە. لای ئەویان هەمیشە

بێدەنگی و کڕبوون و هەمان کات لای ئەمیان

هاوارو زریکەو هەرهاژەی فوغانە!.



شەوانە هەتاکوو قەسیدەت دانیشێ

تۆیش بەدیار شەمیەوە دانیشتوویت

ئەوکاتەی ئەوو شەم ئەخەون، ئەمجارە

بێزاریی بە تەپلەی ڕەشەوە، بە خۆی و باوەشێ

مەراقی گەشەوە لەودیوی سنووری خەمانی

شینەوە دێتەوە. تۆیش بێ بۆی، ئەو گوڵی

مەراقە هەڵئاکەی. چۆن بڕۆی؟! هەر ئەبێ

لەلای بیت. دانیشتوویت. ئەوساتەی بێزاریی

بۆی گوڵی کۆن ئەبێ و لە داخدا ئەیەوێ

بڕوات و سەرخەوێ بشکێنێ ئەوساتە

ئەتەوێ تۆیش هەڵسیت، لەناکاو لەقوتبی

غەریبیی‌و بەفرێکی قەترانیی دوورەوە

چەترێکی چەندساڵەی خەیاڵی

جێماوت، بە خۆی‌و بارانی کوژراوو هەگبەیەك

جریوەی خنکاوی ئەویەوە دێتەوەو سەرلەنوێ

لەبەر خوای غەریبان هەر ئەبێ لەگەڵیا دانیشێ و هەڵنەسێت!.



خامۆشییم پڕپڕە لە لۆکەی ڕەشی شەو.

چۆڵێتییم ئاوەدان بە باخچەی سەراب و

تەنیاییم ئاپوورە بە شاری گەورەی خەو!



ئەڕۆیتە ناو باخچەی ڕەشەوە

گۆرانیی هەڵوەریو چواردەورت ئەگرن و

بەکۆمەڵ هەر ڕەنگی کوژراوەو

لێتدێنە پێشەوە!.

ئەڕۆیتە ناو شاری خەونەوە

بەجادەی درێژی سەرابدا ئەڕۆیت و

لەوسەری وڵاتی تارمایی و

تخووبی مەرگەوە دێیتەوە!



ئەچیتە بەردەمی ئینجانەی کلۆڵ و بێوازی

سەر قەراغ پەنجەرە. سەیر ئەکەی ئینجانەی

بێوە پیاو، چەند ڕۆژە بۆ ژنە ڕێحانەی

کۆچکردووی، غەمگینەو پرسەدار.

ئینجانەی ژن مردوو ئەبینی لە تاوا

بە پەلکێ لە قژی جێماوی ڕێحانە،

لەسەر خۆی، لەشی خۆی، پەخشانی

تەنیایی و غەریبیی ئەنووسێ!

لەوێدا هەست ئەکەیت، مەگەر ئەو،

ئەوەندەی ئینجانەی ناو ڕۆحت و

پەلکە گیای بە ژانی شیعری تۆ هەڵقرچێ!.



لە بنی دەرگاوە، پەپوولە پاییزەی ئاوارە،

خڕیلە، هاتۆتە ژوورەوەو لای گوڵی سەرفەرشم.
پەپوولەی بێئۆقرە، لەگەڵ خۆی، یەك دڵۆپ
ئەوینی لەچاوی دارێکی تەنیاوە بۆ شیعرم
هێناوە. ئەیخەمە سەردەستم، ئەیدوێنم،
هەناسەی پەیڤێکم ئەیخاتە سەر پەنجە تووتەم و
ئەلەرزێ و پێم ئەڵێ: بەتەنیا خۆم نەبووم،
لە ڕێگە، لەوگردە، دەزگیران، دەنکەکەم،
بارەشێ ڕفانی و نازانم ئەمێستا ئەو ئەبێ
لەکوێ بێ؟! لەوەختی مژێکما ئاگری جگەرەی
نێوپەنجەم پێکەنی و سوور بوەوەو بەچرپە
پێی وتم: ئای خوایە خۆ ئەمیش هەر نێرە!!

پەرداخێ گوڵ گوڵیی لێو ناسك، تاقە مێی،
ئەم ماڵە. هەموو ڕۆژ سێ چوار جار لە ئاوی
ڕۆحی خۆی، لێوی خۆی، ئەدامێ. کە دەستم
ئەگەیشتە کەمەری شووشەیی، پەنجەی دەست
ئەبوونە چۆلەکەی سەرخۆش و دەمیشم بە کانیی.
بەڵام ئاخ هەزار حەیف، ئەمڕۆکە نیوەڕۆ
ئەو وەختەی کە ئەیویست خۆی لەبەر بەلوعەی
مووبەقدا بشوات و دوای ئەوە بێ بۆلام. بە ئەنقەست،
کێردێکی نێرینەی شەڕفرۆش، خۆی لێداو شکانی!

پیاسەیەك لە ڕەنگی خۆڵەمێش.

ڕۆیشتنێ لە شێوەی شەلینی
ئاخرین ڕۆژگاری پاییزێ بە دارشەق
ئەمباتە بن گردی عومرێکی
خزاوی سەرەولێژ.
سەفەرێ لە ڕەنگی دار لیمۆی خۆرنشین
ئەو دەمەی کە زەردەی ئاویلکە بۆ دواجار
وەسێتێ لەسەر (با)ی عەدەمێ ئەنووسێ!
ڕۆیشتنێ لەشێوەی ڕۆیشتنی باپیرە شیعرێکدا
ئەو وەختەی کە شیعر بەگۆچان ئەڕوات و
زاکیرەی کون بوەو
شەماڵێك خۆی لێدا ئەکەوێ!.
پیاسەیەك لەڕەنگی خۆڵەمێش
ئەمباتە بن گردی عومرێکی خزاوی
سەرەو لێژ:
لەوێدا لەنێوان ڕایەڵی تەماشای پچڕاوو
بینینی لیخن و لێڵەوە، من سەیری داچوونی
بەژنی ناو خمخۆرکی خۆم ئەکەم. ڕۆچوونی
درەختی خەونەکان. داچوونی شەپۆلی گیانەڵای
وشەم و داچوونی لەسەر خۆی قەڵەم و ڕۆچوونی

**دەقیقەو سەعاتی ڕۆژەکان. زۆر نزیك هەر**

**هەر لەویَ، هەر لەبن گابەردی دامێندا،**

**لەنێوان تارمایی ژیان و بوولێڵدا، مردنم ئەبینم**

**وا لەسەر چیچکانەو بەوردی تەماشای هاتنی**

**من ئەکا. وەك غوبار ئەشڵەژێم. ئەمەویَ**

**بەر لەوەی دوا خزان بمبات و بیگەمیَ. بەر لەوەی**

**بمگریَ و باوەشم پێداکا، هەر لەسەر لێژایی**

**ئەم عومرەو هەر لەسەر باسکێکی شکاوی ئاوابوون**

**بە ئاوی خۆڵەمێش**

**دوا زەردەی**

**قەسیدەم بنووسم!**

سلەیمانی

سەرەتای ساڵی 2006

# سەفەری

# سێ جوانووی* زاخۆیی

ـ 1ـ

مانگەشەو لە سەرێ. شاعیرێ لە خوارێ. ئەو چرای کۆچەری لە بەردەم بانیژەی ڕوخاوی هەورێکدا داناوەو، ئەم جۆگەی دوا دێڕی پەرت پەرت و شینباوی خەمێکی جوانکیلەی لەبەردا ئەنووسێ. مانگەشەو نەخۆشەو لە شیعرا ئەلەرزێ و بلووری خەرمانەی بە گڤەی بای تووڕە درزێکی تێبوەو، ناوبەناو باوێشکێ لە قۆپی دەربەندا ئەدات و، لە ناکاو، وەك بڵێ ماڵئاوا گەڵایەك دووگەڵای دە گەڵای تریفەی لە بەژنی پاییزەی ئەوەرێ. شاعیرێ لە خوارێ: باڵندەی زمانەو هەڵئەفڕێو هێلانەی گومانەو بە پەڕو بە باڵو بە نەغمەو بە چڵو چێوەو لرفەلرف شەبەنگی عاشقەو ئەسووتێ. مانگ ئەنوێ و بەڵام ئەم لە خوارێ وا بەدیار سووتان و وەرینی خۆیەوەو، خەیاڵی سەرگەردان، بەردەوام بۆ پەیڤی خوایەکی نەبیستراو ئەگەڕێ!.



چەند شەوە، ئەو شارە، دەروازەو پەنجەرەی باڵای
خۆی، شەقامی گرمۆڵەی، سەرتاپای درەختی بێوەژن،
سەرتاپای لاوکی بەڕەنگی شیوەنێ شەلاڵە. کۆتەڵێ
تێکەڵە: لە وردە ئاوێنەی گریانی منداڵ و لە بارەی

دەوەن و قریشکەی ڕووبارو، لە هارەی شکاوی ژنان و
لە نووزەی پردەکەی "دەلال"و کڕووزەی کۆترەکەی
ناو گەرووی جەزراوی. چەند شەوە خابوورم وەك دایکم
هەر ئەگری. لەمسەری کۆستەوە هەتاکوو ئەوسەری بێدەنگیی
تەنیایی قەرەجم ماڵەماڵ ئەکات و شاعیریش هەر بەدوای
فرمێسکی نۆژەندا عەودالە!.
پێکەوە کۆچ ئەکەین!. پێکەوە سەرابین. پێکەوە ئالوودەی
غەریبین، پێکەوە ئەبینە قەقنەس‌و سەمەندەر دەلالم!
پێکەوە ئەبینە خۆڵەمێش بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لەویەوە
هەر بەجووت بەرەو لای خودانی بێکەسان هەڵفڕین، دەلالم!
پردەکەت هەرمنم.. قەسیدەی کۆماوە.
لاولاوی سەرشووشەی پەنجەرەت هەر منم،
هاواری هەڵزناو بە بەژنی ماڵانتا.
هەر منم دیجلەکەت ئەو دەمەی لێڵ و پێڵ
وەك شیعری خۆڵاویم ڕێ ئەکاو ماسیەکەی نابینای
ڕۆحیشم هەر ماسی ناو تۆیەو، کەنارم
هەر هەمان تابووتی درێژی، تەماوی، کەنارتە
دەلالم!.



سەفەرە سەفەری ئاسایی سێ جوانووی زاخۆیی
بەرەو خوار، سێ جوانوو، پشت ڕووت و یاڵ کورت و
هێشتاکە ئاوەزەنگی نەیداوە لە ئێسکی قەبرغەو لە گوڵمی

گۆشتنی تەنیشتیان. سێ جوانوو لە شەپۆل. سێ شەپۆل
لە پرشنگ. سێ پرشنگ لە پەیقی ڕووناکیی. سێ جوانووی
قاوەیی، موو ڕەش و پرپرن لە قوڵپی کوڕژن و
چەخماخەی سمکۆڵان. سێ قاچی زاخۆیی. سێ کانین
تا ئیستە مانگەشەو سێ جاریش نەیدووانوون. لە کۆترە باریکەو
کەروێشك و مامز و سمۆرە بەولاوە کەسیدی دوو لێوی
قەت پێوە نەناون. پاك پاکن بە وێنەی سپێنەی چاوانی
ساوایان. بێ گوناه بێ گوناه وەك خونچە. سادەتر
لە کلوو. بێوەی تر بە وێنەی پەپوولە پاییزە. سێ ئاواز
هەر هێندەی سێ جووکەی چۆلەکە دنیایان بینیوەو ژیاون.
سەفەرە بێ جانتا و بێ دیاری و بێ نامەو ڕۆژنامەو مەکینەی
تەراش و چۆڵ هۆڵ باخەڵ و کراسیان نە زەردە و
شەرواڵیان نە کەسکەو، نە ناوی تەواوی سێ جادەی
پایتەختیان لەبەرەو. نە کوچەو کۆڵان و گەڕەکی زمانی
قورەیشیش شارەزان. ئەوەندە ئەزانن: سێ
جوانووی زاخۆن و سێ خاچی پێپەتی و سێ هەنگی
ناو داری زمانی خانین و سێ نانی فەقیرن و سێ
شەربەی تینوون و ڕێبوارن. ئەوەندە ئەزانن کە بەفر
دایکیانەو شاخ و داخ باوکیانەو هیچی تر!.



سەفەرەو گڵمتکی بێڕەنگی ئەو دەشتەیش چون شیری
دەس "وەقاص" تینوێتی بۆ فوارەی کەوثەری ئاوی سوور

لەو دەشتە کەڕەدا، لەو دەشتە کوێرەدا. سێ خەونی
کلۆرو سێ کفری ڕاکشاو لەوێدا. سێ شیعری سەربڕڕاو،
لەخەونا غەدر ئەڕوێ غەدر ئەبێ بە قاقای دڕکەزی و
عاگولی بەرهەتاو" سێ کفر، سێ درۆی لماوی ئەوانە،
سێ درۆی گەورەتر لەپانی و درێژیی و کەتەیی بیابان!"
سەفەرەو لە شیعری بێ سەردا، خوداوەند قرمزی و، تەنیایی
قرمزیو غەریبی ئەبێتە سەرابی ناونیشان!. هەرسێکیان
بە فیچقەی قەڵبەزەی نێوانی هەردووشان، پرژەیان گەیاندە
ڕووخساری یەزدان و سووریانکرد ئەستێرەی کاکێشان
ئێستاکە هەرسێکیان، سێ ستران، پاڵکەوتوون،
هۆ لەولایش، سەرەکان، بە چاوی زەقەوە ئەڕواننە
باکورو هەورێکی ژانگرتووی سەر زاخۆو ئەڕواننە سێ
مەلی کۆچەری شڵەژاو. بۆ زۆزان. درۆکان، دەمامك:
لە پەڕووی کراسی عوسمان و شمشێریان هەر هەمان شمشێری
سەر ملی حسەین و دەستیشیان هەر هەمان ئەو دەستەی
کە کانی و کەمانچەو باخچەیان پێ خنکان. مێژوویەك هەمیشە
موفەخەخ. قافڵە لە خوێن و زەنگی مەرگ لە مل و سەبایا لە من و
شاباشیش لە تاوان!.



وەی. وەی. وەی. چەند ساردە "با"ی گریان
وەی. وەی. وەی لەو هەموو شیوەنە جوانانەی کە
ژنان کردیانن بە سوخمەی خەزان و کۆڵوانەی تەمتوومان.

وەی. وەی. وەی لەم هەمموو دار کچە قوڕاوی و قژ بژەی
ئەم شارەو، لەم هەمموو حەیرانە ڕەنگ زەردەی بە پێوە
هەڵقرچان. وەی. وەی: چەند گەرمە "با"ی
گریان. لەم هەمموو گڕەیەی کە دەشت و بنارو، ڕەوە
ئەسپ. ڕەوە بەرد. ڕەوە حەرف. ڕەوە دار، کردیانن
بە گوڵی پەنگرو گیای کڵپەو بە بێشەی بڵێسەو، بە خەتی
ئیستیوای قەسیدەو، بە تەمی واوەیلاو، یەك بەیەك، سەرتاپا
پۆشییان!. وەی. وەی. چەند قووڵە دەریاچەی
زامانی ناو گریان لەم هەمموو مەوجانەی کە هاژەی کۆست
کەوتووی کەنارو، پۆلە مەل، پۆلە ئاخ، پۆلە مۆم.
کردیانن بە لانکەو جۆلانەی زایەڵەو کردیانن بە حیلەی
هەڵچوون و بە نووزەی داچوون و بە کۆمەڵ بە کەشتی و چارۆکەو
بە سەوڵ و بە بووك و بە زاواو بە تاراو قامیش و ئاوێنەو
گۆرانی و، زەنگیانەو خەنەوە تیا خنکان!.
"وەی گەلۆ! هاوارو باران و، زریکەی کیژان و
ئەستێرەو ڕێحانەو گوارەی گوێ پێکەوە ئەبارێن!. وەی گەلۆ!
بای دەشت و هەناسەی سێبەرو کرێوەی تەنیایی و
گەرداوی ناکامی و باپووسکەی غەریبی پێکەوە
هەڵئەکەن. وەی گەلۆ..
ئاوی لاڵ چی ئەڵێ؟!
مێژووی کەڕ، لە پەیقی ئەم ڕەنگە کوژراوەم
چۆن ئەگاو

دەشتی کوێر،
چۆن چۆنی ئەم جەستە
بێسەرەم ئەبینیٚ
وەی گەلۆ!



ئەی سیانەی ناو بەفری لاوکم و ئەی سیانەی باڵندەی
ئەسرینم و چاوەڕێی تەماشای بێهودەم. سیٚ کوچکەی
بێکەسی و هاوارو نامۆیم. چی ئەکەن لەو خوارە؟!
دوا جوانووی خۆرنشین لەسەر کەل، بە کلکی کلاَفەی
زەردەوە هاتەوەو هەر ئێوە دیار نەبوون؟!
چی ئەکەن لەو خوارە؟! دێنەوە؟! گلێنەی
هەر هەموو هاتوونە سەر سیلەی کۆلاَن و حەسرەتمان بونەتە
هۆنراوەو لەسەر چۆك دانیشتوون. پەنجەرەی ماڵەکان، هەر هەموو
هاتوونە سەر ڕێگەی بەرەو خوار، کۆماوەو بە پەردەی ڕەشەوە
لارەمل وەستاون. هەورەبان هاتۆتە خوارەوەو جۆگەکان ڕائەکەن
مل ئەنێن بۆ شەوی گۆڕەپان. چراکان، لە ژووری ئەسریندا
فوو ئەکەن لە گڕی لەرزۆکی سەریان و کلۆمی دەرگاکان خۆ بە خۆ
هەر خۆیان ڕووناکیی چاوانیان لەسەرخۆ دائەخەن!
ئەی سیانەی ناو بەفری سرمدی و ئەنگۆرەی
سوتاوم! من ئەمشەو زاخۆیەك هاتۆتە چاومەوەو

لەمەرگی سێ جوانووی پێدەشتی کۆتەڵم ڕاماوم!



مانگەشەو لە سەرێ، شاعیرێ لە خوارێ. هەنووکە
مانگ لەسەر ترۆپکی شاخەوە هەڵنووتا لە کۆست و هەڵدێرراو
بەربۆوە بۆ دۆڵ و، بەجارێ، تریفە هەڵڕژاو،
خەرمانە هەڵپژاو، زایەڵە هەڵکشاو، قیامەت گەیشتە
نێو شارێ. هەنووکە مانگەشەو لە خوارێو شاعیریش
لە خوارێو تارمایی سێ جوانویش هەرسێکیان
بە جەستەی بێ سەرو بە یاڵی بابردووی سوورەوە، لە بەردەم
خواوەندی بێباك و "مانگ"ێکی هەپروون و شیعرێکی
خوێن گرتووی ئەوقدا، لەمسەری کۆستەوە هەتاکوو
ئەوسەری تەنیایی، چوار ناڵە غار ئەکەن!

* بۆ یەکەمجار ئەم قەسیدەیە لە ژمارە (12)ی ڕۆژنامەی "ستایل"دا بلاوکرایەوەو دواتر لە چاوپیاگێڕانەوەدا ئاڵوگۆڕێکی زۆری بەسەرداهات.

# دار ئەرخەوانێ

# بە سواری ئەسپێکی سپییەوە!

"دیسانەوە بۆ ئیسماعیل بێشکچی"

ئەسپە سپییەکەت بئاژوو

وەك ئەوەی هەورێ بئاژووی

ئاوس بە بەرق و باران و کلووی پەنگر!

تۆ سوارێکی ئەرخەوانیت و ئەسپەکەت

زادەی بەفر!

ڕووبکەیتە هەر ئاقارێ

لەچۆمی ئەنەدۆڵەوە تا جادەکانی ئەستەمووڵ

هەموو چاوێکت لەسەرە

لە چاوی شینی شاخەوە

تا چاوی زەردی ژەندرمە

چاوی زیوینی جۆگەکان وەختێ بە لاقەدی بەردا

دێنەخوارێ و بۆچاوی خۆت و ئەسپەکەت ئەبنە

پرژەی زەردەخەنە. چاوی ئاسنینی ئۆردوو

وەختێ لە دوور تەڵزمی تاریکی و مەرگت تێئەگرن و

بۆ چاوی خۆت و ئەسپەکەت ئەبنە نووکی نێزەو

قەمە. هەموو چاوێ وەکوو سێبەر بە دواتەوەن،
لە پێشتەوەن، دەوریانداوی.
تەماشای لە ناو پاکتی بۆیاخچیەکانی سەر شۆستەی
ناو ئەنقەرە، کە هێندەی بابۆڵەی دەستیان
خۆشیان ئەوێی. سەرنجی وەکوو درەوشی
پاسەوان و پۆلیسەکان کە هێندەی سێڕەی سەرلوولەی
چەکەکانیان، ڕقیان لێتە!. نیگای لە کارێز ڕونتری
منداڵێکی پاکەت فرۆش، کە هێندەی تەبەقی بەرکۆش،
هێندەی هەموو پارەی وردە و دەغیلەکەی، زیاتر لە
شەڕواڵی تازەی خۆشیئەوێی. کۆترە باریکەی
تەماشای ئەو خانمەی لای باخێکی غەمگینەوە
هەر وەکوو خۆی فرمێسکی سەر پەڕەی گوڵ و گەڵا
ئەسڕێ و بەڵام چاوێکی هەر لێتە، کۆترە باریکەی
تەماشای، دێت و دێت و بە هێواشی لەسەر یاڵی
ئەسپی سپیت هەڵئەگورمێ و لە ڕۆحیەوە ئاوێزانتە!
ئەسپە سپیەکەت بئاژو
وەکوو چۆن قەڵەم ئەئاژووی.
وەکوو چۆن ئازار ئەئاژووی.
زەمانێکی زۆر درێژە، تۆ بە (من)ەوە گیرۆدەی
وەك گیرۆدەبوونی مۆمێ بەدیار شەوێکی نەخۆش و
هۆدەیەکی وەڕسەوە. وەکوو عەشقی ئاوێنەیەکی
زۆر تەنیا، بەدیارماڵێکی چۆڵ چۆڵ و بێکەسەوە.

زەمانێکی زۆر درێژە، نە بێزاربووی لە بێکەسیم.
نە بێزاربووی لە غەریبیم و تەنیاییم. نە لە بۆنی
بۆ کڕووزی جەرگم. نە لە قیژەی زامەکانم و نە لە
هاواری بێدەنگیم!
زەمانێکە، زەمانێکە، من تۆم کردووە بە جەستەی
قەفنەس بۆ خۆم! بە خۆڵەمێشی ئەودیوی شیشی
پۆلاو بە سروودی پەیامێکی ناوهەڵم و تەم. زەمانێکی
زۆر درێژە، تۆ بە "من"ەوە گیرۆدەی. گیرۆدەی
ئاوی خنکاوم. گیرۆدەی پەیڤی بێباڵم. گیرۆدەی
جوانیی "ئامەد"م. زەمانێکە، زەمانێکە تۆمکردووە
بە "سمایل"ی قوربانیی لەبری خۆم. ئەوەتانێ
لەبری من، لەبری دەست و سەری من. دەستی تۆیەو
سەری تۆیە، لە نێڵە نێڵی ئەوینما جاویدانە سەما ئەکەن.
ئاخ! چەندم گیرۆدە کردووی
ئەوە ئەبوایە هەر من بم، لەودیو ڕایەڵی
شاقوڵی و ستوونیی ژوورەکانەوە، ژووری سیس بوونی
گەنجێتی، بۆ حەڤدە ساڵ، تەونی جاڵجاڵۆکە ئاسا
لە سوچێکدا، دروستبکەم
کەچی تۆ بوویت و من نەبووم!
ئاخ چەندم گیرۆدە کردووی
گیرۆدەی چرایەك بێ ماڵ!
گیرۆدەی گەنم و جۆی برسیی.

گیرۆدەی چاوی "دەرسیم"و
باڵای "هەکار"
تورکێ بەڵێ تورکێ!
لە ڕەحمی چڕە دووکەڵ و مێژووی چەکمەو
زمانێکی لەخۆبایی ژەنەڕاڵێکی مۆنەوە،
لە کونە گورگی بۆرەوە دێتە دەرێ و بەڵام
لەسەر ئەو بنجە قەت ناڕوێ!. دێتە دەرێ
وەك گزنگێك لە کەلەوە. یان شنەشنی
شەیەك لە هاوینی قەڵەمێکدا. یاخود وەکوو
کۆترە شینکەیەکی "تۆرۆس" لەنێوانی دوو
ملەوە، دێتە دەرێ.
تورکێ بەڵام
لە هەڵگورد و پیرەمەگرون کورد تر!
لە ئاوی سەرچنار کورد تر!
ئاخ چەندم گیرۆدە کردووی!
لەسەر ڕستەم، لەباتی دوولێوی شیعرم،
دوو لێوی ئەو ئەبەن بۆلای ئاگر، لەسەر
دەنگم، هاواری ئەو ئەدەن لە دار، لەسەر
هەتاوی زامدارم، هەتاوی ئەو کۆت ئەکەن و
ئەیخەنە ناو زیندانەوە!
ئاخ! من چۆن بتوانم چاکەی
ئەو ڕووبارە بدەمەوە

که لەسەر تینوێتی من و پەژموردەییم
بۆ حەڤدە ساڵ بەستێکی ئاسنین گرتی!
ئاخ من چۆن بتوانم چاکەی
ئەو گلۆپە بدەمەوە
که لەسەر شەوی زمانم
بۆ حەڤدە ساڵ بنی بیرێکی زۆر قوڵتر
لە تاریکیی گرتی و بردی!
باڵندەیەکی دەنگ سپی
لە پۆلی تورکە جوانەکان
لەسەر مەلە کوردەکانی باکوور، لەسەر هێلانەی
خاپوورو، لەبەر گمەگمی ئازار، لەسەر ئاسمانی
ئازادو، فڕینی ئازادی ئەوان، چەقۆو مقەست و
دڕکەزی ناو ئەنقەرەی لە شەوێکی کەڕولاڵدا
هێنایە سەر هێلانەی خۆی، لەسەر ئەوان،
فڕینیان دا بە مقەست و باڵیان دایە دەست
دڕکەزی و دەنووکیاندا بە گوێزان و خوێندنیشیان
بردە زیندان!
"ئای خودایە! من چۆن بتوانم ئەو قەرزی
فڕینانە، قەرزی ئەو هەموو ژانانە. ئەو هەموو
گمەی وەفایە. ئەو هەموو شەقەی باڵانە.
بدەمەوە بە گەرووی سپی ئەو مەلەو بەو ئاسمانە؟!
چۆن بتوانم لە هەوادا پەڕی سپی هەڵوەریوی

ئەو بژمێرم؟! هەڵەرزینی زستانەکانی بژمێرم؟!
هەر چیبکەم بە مەرگی خۆیشمەوە خوایە! هەر
ناگەمە ملەی بەرزی دەنگی سپی و ئەو دوندی
جوانی وەفایە!"
کتێبێکی قژ ڕووتاوەی ناو زمان و هەتاوی تورك
لەسەر نەمامی ئەلف و بێ لە باخچەکانی ماردیندا
چەندین لاپەڕەیان داخکرد!
لەسەر چۆلەکەی وشەی کورد.
لەسەر جووکەجووکی حەرفی
لەسەر باڕەی کارژۆلەکان
چەندین چیرۆکیان بڕیەوەو
چەندین ناونیشانیان کوێرکرد!
لەسەر ئەو غەدرەی لە شەوبۆی شیعری کرمانجی
من ئەکرێ. لەسەر ئەو زوڵمەی لە ئاوی
حیکایەتی ناو دیرۆکم و لەسەر ئەو غەدرەی
بەردەوام لە ملوانکەی مەم و زین و کامێراکەی
یەڵماس گۆناو سیدیەکانی ئەحمەد قایەو شڤان
ئەکرێ، لەسەر ئەوانە هەموویان:
ئەو کتێبە قژ ڕووتاوە: عەینەکەکەیان شکاندو،
کەلەپچەیان کردە دەستی و دێڕەکانیان تینوو کردو،
نامەکانیان لە چوونە بەر هەتاوی دەر قەدەغەکرد!
ئەرخەوانەو ئەسپێکی سپی ئەئاژوێ

**کە غار ئەکا گوڵی ئەرخەوان و یاڵی**

**بەفرین تێکئەئاڵێن. کە ئەیشوەستێ**

**خۆشەویستیی بە شەونمی، هەموو درەختەکوردەکان**

**هەموو ڕووبارە تورکەکان، هەموو چرا ئەرمەنیەکان،**

**نزیك و دوور ئەبنە یەك کۆترە باریکەو**

**کۆتر دێت و لەسەر قەڵپوزی زینەکەی هەڵئەنیشێ!**

**لە ئاواییش، ڕووئەکاتە بەرماڵانی،**

**لەش قوڕاوی و لە دوورەوە**

**بۆ منداڵانی مراوی گوێ جۆگەی ڕوون**

**پێئەکەنێ و هەردوو دەستیان بۆ هەڵئەبڕێ!**

**ئەوسا لە شیعری منیشدا دیسانەوە**

**بیرەوەری و گەڕانەوە بۆ ساڵەکانی ئەرخەوان**

**لە زینداندا دائەگیرسێ!**

**ئاخ چەندم گیرۆدە کردی!**

**گیرۆدەی ڕازە تەنیاکەم.**

**ئەرێ بەڕاست! تۆ لەسەر من**

**چەند جار وەکوو گوڵی پەموو هەڵوەریت و**

**وەکوو پووشووی دەشتم گڕگرتیتی؟!**

**چەندە برووسکە لێی دایت و**

**چەند جار مردی؟!**

**چەند وەرزو خولی زەوی و تەقویمی ساڵی هیجری و**

**قەمەری و سەری ساڵی کریسمس و ساڵی کوردی**

زیندان ماڵ و ماڵ زیندانی ئەستێرەی گیراوی تۆ بوو؟!
زەمانێکی زۆر درێژتر، لە زەمانی شەقامێکی خۆڵەمێشیی
تەمەن حەڤدە ساڵەی "باتمان"! زۆر درێژتر لە هەناسەی
مەقامێکی پڕ لە گڕەی گەرمییان و تووڵانیتر لە چیرۆکی
سەفەرەکەی "برایمۆك" بۆ گەیشتن بە ماچەکەی
گوڵی "عوممان"! ئەرێ چەند جار بەفر باری و
تۆ هەر لەودیوی قفڵەوە. لەپشت پەنجەرەی نابیناو،
لەودیو تەیمانی تەمەوە، لە کولووی مەراقی سپی
خۆت ئەڕوانی؟! هەزاران جار باران باری و
تۆ هەر لەودیوی شیشەوە، دەستت ئەبرد کەزی
خاوی باران بگری و بەڵام هەرگیز نەتئەتوانی؟!
کە لەناو خەمدا ئەنووستی. خەونەکانت هەمیشە
ڕەش و سپی بوون. ڕەش وەك چاوی کیژۆڵەکانی
"جزیرە"و سپیش وەکوو لۆکەی قژی "موسا عەنتەر".
کە ئەنووستی لە بەرایی تەمتوومانی،
دەشتی فراوانی خەودا، دورونزیك، نەخشەی
تورکیات ئەبینی، کە لە شێوەی پیاوێکی کەتەی شمشێر
بەدەستداو، لەنێوان "هیلال و نەجم"ێکی سووردا،
ڕاوەستاوەو، یەك لەدوای یەك، سەرهەڵئەدا،
بۆ نیوە ئەڵقەی هیلال و نەجمیش لەسەر نووکی پەنجە
سەما ئەکا. سەر، سەر، سەر، سەر!، سەری
ئاسکە چاوشینەکانی ئەرمەن و، سەری گوڵەباخی

کوردو، سەری "فریشتە تاوس" و سەری "جیلوە"ی
درەوشاوەی ئێزیدیەکان. زیکەزیکی دەرگای ئاسن
لەناوەختاو، دائەچڵەکای. ئەهاتیتەوە پشت قفڵ و
ئەمدیو بۆلای پاسەوانە خەواڵووەکان. لە پڕێکدا،
ئەکەوتیتەوە سەر پشت و خەوێکی تر ئەیبردیتەوە
بەرایی، پێدەشتێکی تەلیسماوی بن کێوەکان.
لەم خەوەیشدا، ڕیزێ سێدارەی درێژت بەدیئەکرد.
وەختێ ئەچوویتە پێشەوە بۆ بەردەمی واق وڕماوی
سێدارەکان. لەنێو ڕەوە قوربانیی هێشتا زیندوودا،
بە چوارمشقی هەر لەسەر ئەرز، قۆڵی بەستراو، ڕیشی
سپی پەپوولەی زەرد تێئاڵاوی شێخی پیرانت ئەبینی
سلاوێکی وەنەوشەییت لێئەکردو ئەویش بەسەر سلاوێکی
ئەرخەوانیی لێئەکردی و سەیرت ئەکرد، چڵێ نێرگز
بەدەمیەوەو بۆیڕاگرتوویت. وەرتئەگرت. هەروەك
بۆنی ئازادیی پاشە ڕۆژ بکەیت. بۆنت ئەکرد. ئەم کەڕەتە
دائەنەویت، وەك مێژوویەکی ڕیش سپی و نوورێکی
گەش، لەبەر دەمتا دانیشتبێ. ماچت ئەکرد، لەو
خەوەدا، وەکوو پەتی سێدارەیەك لە دارەکەی خۆی
هەڵبێت و بەرەو تۆبێ. دائەچڵەکای. ئەهاتیتەوە
ئەمدیوی قەلای ڕقی نەجم و هیلال!

هەر لەسەر من حەڤدە زستان کرێوەی خەو!.
هەر لەسەر من حەڤدە پاییز خەزانی خەو!
بەڵام عەشقی تۆ "جودی" بوو
نە کرێوەو نە پاییز و نە تەورداسی هیلال و
نە چوکڵەی نەجمی خوێناویو
نە دەروازەی داخراوی وەرزەکان و
نە قفڵەکان.. پێی نەوێران!
بۆیە کە هاتیتە دەرێ
بینیمانی و ماچمانکردی
هەر بەهاربوویت و
هەر گوڵی دار ئەرخەوان!

سەرەتای/ 2006

# سێ کورتە شیعر

## 1- پەڵە

لە گەواڵە هەوری "سەر"دا
برك و ژانی خۆم و خەڵکی
هێندە چڕو
هێندە ڕەش و
هێندە نزمن
زۆر مەحاڵە
ساڵێ بڕواو
شەستەی کۆڤانێ دانەکات!.
لەو مەحاڵتر
ساڵێ بچێو
لەم زەمینی غوربەتەدا
من شیعرم پەڵەی تیا نەدات
زۆر مەحاڵە!.

## 2- چیرۆکی زین درووی‌ەک

لەم شارەدا

وەستا "خەمە"

هەتا پیر بوو

تا چاوی ما

هەتاکوو پەنجەی گۆی ئەکرد

زینی ئەسپی دروست ئەکرد!،

کەچی ڕۆژێ

لە یادی دوانزە سوارەداو

لە بەردەمیماڵەوەدا

هەر ئەسپێکی تەویلەی خۆی

لەقەیەکی لە سنگیداو

لە جێدا مرد!

## 3- به هەموویان من ئەنووسن!

من ئەمەویٚ هەر کاغەزیٚکی

سپیبم

ناوبەناویٚ بەبیٚ فڕین

داسەکنیٚم و

لەساڵیٚکدا وەکوو چەمیٚکی

هاوینە

پشووبەم و

چون درەختیٚکی پاییزە هیچ

نەنووسم!.

بەڵام چیبکەم؟

خواو خەم و عەشقم شایەتن

بەبیٚ ئەوەی ڕیٚگەم دابن

وشە خۆی دیٚ

وەك دلۆپ و

خەیاڵ خۆی دیٚ

وەك باڵندەو

قەڵەم خۆی دیٚ

**وەك تیرێژو**

**بەهەموویان**

**من ئەنووسن!**

**ئاخر چیبکەم؟!**

سلێمانی

تشرینی دووەمی ـ 2004

گۆڤاری هەرێم ژمارە (324) کانونی یەکەم 2004.

# ڕۆژێکی مردوو!

من ئەمرۆ هیچم لانییە بینووسم.. هیچ
هیچم پێنییە بیڵێم و هیچیش نییە بیکەم.. هیچ.
ئەمڕۆ من و بۆریە ئاوێکی شکاو لەیەك ئەچین
ئەو دوای ئەوەی چی تیابوو لەبەری ڕۆیشت و
منیش دوای ئەوەی هەرچیم هەبوو وتم!
وەك درەختێکی گێژو وێژی تەمەڵ
بەرامبەر خامۆشیی گۆڕستانێ ڕاوەستاوم!
یان وەك هەورێکی بێکار
کە بە چوارمشقی لە ئاسماندا دانیشتبێ و
تاقەتی نەبێ بباریێ!
چون سەعاتێکی نوستوو بەکۆڵی دیوارێکەوە
کە هەر خەریکی باوێشکدان بێ
یان چون بەلەمێکی شکاو لە بەندەرێکی پشت گوێخراودا
ئەمڕۆ من چۆڵ و هۆڵم.. چۆڵ و هۆڵ

وەکو کەلاوەی یادەوەریەکی کۆن

لە زەینی پیرەمێردێکدا

بە وێنەی گیتارێکی بێ ژێ.

بە وێنەی شیعرێکی بێ خوێنەر

یان وەکو هێلانەیەکی بێ گمە.

من ئەمڕۆ حەز بەبینینی کەس ناکەم

نە بینینی خۆم لە ئاوێنەدا و نە بینینی هاوڕێکانم و نە کتێب

من ئەمڕۆ ئارەزووی هیچ ناکەم

نە پیاسەیەك بە جادەکانی هەتاوداو

نە بۆنکردنی قژی مۆردی باخچەیەك و

نە ماچکردنی ژنەکەم و

نە تەواوکردنی ئەم شیعرەو

نە هیچ!

کۆتایی 2005

# هاوڕێکانم و
# ئاوێنەی بەجێماویان!

ئاوازێکی ڕەنگ پەمەیی.. نۆتە کوژراو
وەختێ گەیشتە نێو باخێ
چڵە پۆپە دانەویەوەو ماچیکردوو
هەتاو بەناو پژوپۆدا هات و
دەستی بەسەر سەریا هانی!
بارڕژنێکی ڕەنگ نارنجیی.. بەستە کوژراو
وەختێ گەیشتە سەر یاڵێ
بارێزەیەك دانەویەوەو ماچیکردوو
هەور هات و نزمبۆوەو
دەستی بەسەر سەریا هانی!
جوانووی ئەسپێکی دڵداری جووت کوژراویش
کە گەیشتە بەردەم دەشتی ڕەوە ئەسپێ
هەر هەموویان نوشتانەوەو ماچیانکردوو
باران بەتەپ و نم هات و

دەستی بەسەر یاڵیا هانی!

کە وەختێکیش کیژی شەهیدێکی ئێمە

گەیشتە مێرگی بنارێ

درەخت کردیە ئامێزیەوەو

ئاوازەکە گوڵی دایەو

بارژنەکە مسکی دایەو

هەتاوەکە خۆشەویستی و

بارانەکەیش شیعری جوان و

بارێزەکەیش خستیە سەر پشتی جوانوەکەو

لوتکەکانیش بەو سەرەوە دانەوین و

ماچیانکردوو، یەکە یەکە

دەستیان بەسەر سەریا هانی!



یادگارە جوانەکان ئازیزن

بۆ نموونە: کە ڕێژنە

دوای خۆی گۆمێ لە دەشتێکدا بەجێدێڵێ.

کە مانگەشەو بۆ یادگار هەندێ تریفەی ڕژاوی لە دۆڵێکدا

بەجێدێڵێ.. یادگارە جوانەکان ئازیزن

کە بولبولێ بۆ یادگار هەندێ نەغمەی ڕەنگاوڕەنگ و

هەندێ ماچی سەوزو سوری لە دوای مردن بۆ بولبولی بێوەژنی

بەجێدێڵێ. یادگارە جوانەکان شیرینن

بۆ نموونە کە کشانی ئەستێرەیەك

بۆ یادگار لامان خەونی بەجێدێڵێ.
یادگارە جوانەکان نازدارن
ئەسپێك ئەمرێ و بۆ یادگار چەند حیلەیەك بەجێدێڵێ
گوڵێك ئەمرێ و بۆ یادگار بۆنێکی خۆش بەجێدێڵێ
زەنگێك ئەمرێ و بۆ یادگار زرینگەیەك لە گوێچکەدا
بەجێدێڵێ. کرمی ئاوریشم ئاوریشم و، دەغڵ
تۆوو، چەخماخە پەنجەرەی تیشك و، یادگارە
جوانەکان ئازیزن
بەڵام لەگشتیان ئازیزتر
لە هەموویان خۆشەویستتر
منداڵانی یادگاری شەهیدانە!



ئەم ئێوارەیە من هاتووم سەردانی ئەو یادگارە
ئازیزانە ئەکەم. لەچاوی ئەواندا شیعرە بەردینەکانی شاخ
ئەبینمەوە. ژوورە سەرمابردەڵەکەی بەرگەڵوم ئەبینمەوە. خەزانەکانی
مێژووم و لاواندنەوەی پەخشانم و لەسەری ئەواندا
سەری بەورشەو پرشەی هاورێکانم ئەبینمەوە. لەباڵای ئەواندا باڵای
سروودە بریندارەکانی ئازادیی ئەبینمەوە.
باوکیان ئەبینمەوە لەگەوەی شاخەکاندا
وەختی جەولە. وەختی خەفارات لەگەڵ
ئەستێرە. وەختی خۆدۆزین و خۆشتنی سەرچەم و
جلی تەڕو بەپێوە ڕاوەستانی بەهاڵاوی بەردەمی

زۆپا. باوکیان ئەبینمەوە.. وەختی هەناسە بڕکێی
سەر هەورازو، قۆڕەی سك و، ملیوانەی کراسیی
چلکن و، خۆ کوورکردنی پشت لە باو، شلێپە شلێپی دەرەلنگ و
سەری پەنجەی تەزیوی ناو پێلاوی لاستیك و وەختی کرەکرِی
خۆخوراندنی نیوەشەوو، ورێنەو تەپاوتلی نوستن و، پرتەپرتی پێڵوّیان و
وەنەوزی چرای دیوارکۆو، باوێشکی دەرگای تەنەکەو،
لەو دیویشەوە وژە وژی تێکەڵی خەم و ڕەشەبا.
من ئەم ئێوارەیە لە دەست و پەنجەی ئەماندا
دەست و پەنجەی ناو کرێوەی گۆنەکردووی باوکیان ئەبینمەوە..
لە برژانگەکانی ئەماندا، برژانگی بەفرگرتووی ئەوان لە
توولەرێیەکانی زستاندا. لە قژی ئەماندا، قژی
ئاڵۆزکاوو ڕەنگی ریشە نەتاشراوەکانی ئەوان ئەبینمەوە.
لە لووتی ئەماندا سەری لووتی سوور هەڵگەڕاوی بەر باپووسکەی
ئەوان. لە دەم و لێوی ئەماندا، هاواری دەم و لێوە
قلێشاوو وشکەکانی ئەوان ئەبینمەوە
لە ئاوڕدانەوەی ئەماندا
هەمان ئاوڕدانەوەی ئەوان وەختی بەرێکەوتن
بەرەو جەبهە
ئەم ئێوارەیە من هاتووم
بۆ ئەوەی بۆنبکەم بە ئێوەوە
چونکە ئێوە بۆنی ئەو گۆرانیانەتان لێدێت
کە باوکتان و براتان. بۆ ئەم ساتەی ئێوەیان ئەوت.

من هاتووم بۆن ئەکەم بەئێوەوە
چونکە ئێوە بۆنی گوڵمێخەکی
برینەکانی ئەوانتان لێدێت. کاتی گەڕانەوە لەشەڕ.
چونکە ئێوە بۆنی ئارەقەی زەنگول زەنگوڵی
نێو چەوانی ئەوانتان لێدێ کاتی خۆرنشین
بۆنی ورەیان لە چڕبوونەوەی ترسدا، بۆنی خۆزگەیان و
بۆنی هەگبەکانیان و کۆڵەپشتیان. بۆنی برسێتییان
بۆنی دەنگیان و هۆرەیان. بۆنی ئاخەقوڵەکانیان
بۆ ئێوە، ئەو وەختەی کە ئێوە جووجەڵە بوون.
ئەم ئێوارەیە من لە ئاوێنەی پاکی بەژنی ئێوەدا
باوکتان، براتان، خاڵتان، مامتان ئەبینمەوە
ئەوان ئەبینمەوە لە وەرزی دابڕانی عاشقاندا
لە ئەشکەوتەکاندا، بە خۆیان و خەپلەو سەلکە توورەوە
بە چوار مشقی لەسەر فەرشە خۆڕاییەکانی سەوزەگیاو
شووشە خۆڕاییەکانی شەختە. لەسەر کورسی تەنەکە
نەوتی بەتاڵ. لەسەر پشتی گابەردو کەوێڵی چیا
لە ئێوەدا ئەوان ئەبینمەوە یەکەیەکە دێنەوە
بۆلام، دێنەوە ناو دیدەم، دێنەوە ناو
هەناسەکانی شیعرم: ژووره قوڕینە نزمەکان. چکەچکی
دڵۆپە. بەتانی سەوزی ئەستووری سەر دەرگای
خڵتان بەباراناو، مقەبای تەقەتەقکەری سەر
پەنجەرەی شکاو و، پڵێتەی سووتاوی سەد جار هەڵکێشراوی زۆپا.

ئێوە یادگاری ئەو پیاوانەن
مێژوویەکیان ئەدا بەکۆڵدا قورس قورس
پڕ لە بەردە ئازارو، و پڕ لە ساچمەو
قیژەی ژنان و هەوای ژەهراویو
شەوی نابینا.
ئێوە یادگاری ئەو پیاوانەن
لەسەر سێدارەوە مردنیان بەرەو مردن ڕاونا!.
من لەگەردنی ئێوەدا گەردنی ئەوان ئەبینمەوە
وەختێ ئەبوون بە تاڤگەی سووری
بەلووزەوی عەشقی چیاو
وەختێ ئەبوون بە سوورە چناری
عاشقی بەردەمی خودا!



ئەم ئێوارەیە شیعرێکی کەم ئەندامی منیش بە سواری کورسیەك
هاتووە بۆلای هاوڕێ خۆشەویستەکانی خۆی تا دەستکاتە ملیان و
ماچ بارانیان بکات و بە شەلە شەل
پێیان بڵێ: ئێوە ئەزانن؟!
درەخت هەیە یەکدوو لقی هەڵپاچراوەو کەچی لە زۆر درەختی
ساغ بەردارترە. من ڕووبارێکم ئەناسی
لاقێکی وشکی کردبوو بەڵام بە تاقە لاقێکەوە
فریای چەندین دارستانی تینوو ئەکەوت.

من لە شاخ سروودێکم ئەناسی یەك چاو
بەڵام سروودی یەك چاو لە بەشێکی زۆری سرووده
چاو ساغەکان ئازاتربوو!.
من عاشقێکم ئەناسی قاچێکی لە تەختەبوو
بەڵام لەسەر تەختە جوانترین عەشقی هەڵئەکەنی!
گۆرانییەکی نابینا هاوڕێم بوو
کەچی لەمن جوانتر ناوەوەی ڕۆحی ئەبینی!
من ژنێکم ئەناسی لاڵ
بەڵام وەختێ کە ئەینووسی
لەشمشاڵ و تار و کەمانچە جوانتری ئەنووسی!
هاوڕێیەکەم هەبوو نابیست بوو
بەڵام وەختێ پەنجەکانی ئەکەوتنە کار
خۆشەویستیی هەموو دنیا تێی ئەگەیی.

کە ڕۆیشتمەوە ئەمشەو من خەوێ ئەبینم:
بەو سەرو ملانەوە کە هەنووکە لێرەنین و
بەڵام بەبروسکەی جەستەی خۆیان ئەم
هەموو چراو ئەوین و ئەم هەموو زەردە خەنەی
ڕووناکبیانەی ئەمشەویان بۆ هەڵکردین
کە ڕۆیشتمەوە ئەمشەو من خەوێ ئەبینم:
بەو باڵایانەوە کە هەنووکە لە ناوماندا نین و

بەڵام ئەم کیژوکوڕوو شیعرو مۆسیقاو،
ماچ و پەپوولەو، دارهەنارە جوانانەیان بۆ جێهێشتین.

کە ڕۆیشتمەوە ئەمشەو من خەوێ ئەبینم:
لەو خەوەدا هاندیکاپم و دەست و قاچێکم
نەماوەو بەڵام بەو دەستەی کە ماوە لەو
خەوەدا، لەم شیعرەیش جوانتر ئەنووسم!

سلێمانی
2005/12/8

# خەزنەوی

پیاوێك هەبوو سەری هەورو
چاوی كانی و
ڕیشی تەیرو

بەژنی درەخت
یەكەمجار پەنجەرەی ماڵێك ئەوی ناسی
دووەمجار بارانی گوندو
سێیەم جاریش هەر هەتاوی دووسێ شارێك.
ئەمە چل و هەشت ساڵی ویست.
كەچی دوێنێ هەر ئەم پیاوە
لە یەك ڕۆژدا
تەنها یەك ڕۆژ
وەختێ سەری چەخماخەی داو
گوڵی هەڵڕشت
ڕیشی فڕی
هەموو پەنجەرەی ماڵەكان
هەموو بارانی گوندەكان

هەموو گڵۆپی شەقام و
ژن و منداڵ و پەپوولەو
باڵندەکان
چەندە کوردستان ئەناسن
ئەویان ناسی!.

# پڵنگێك له بەرەبەیاندا..

"بۆ هاشم شەفیق"

نە ژەنەراڵ بوو نە لیواو نە عەقیدو
هەر دوو قۆپچەیش لەسەرشانی.
کەچی ڕۆژێ بەرەبەیان
یەك فڕینی کورتی مابوو
دەستی بگاتە ئاسمان و
تاجی "مانگ"ێ داگرێت و
بیداتە دەست عاشقان و
سەدان نەجمەیش بخاتە سەرشانی عێراق!



نە لە ئەندازەی ئەزانی و
نە مەساح بوو نە جیۆلۆجی و
بەڵام ڕۆژێ بەرە بەیان
دووسێ مەترێ کاری هەڵکەندنی مابوو
تا ئاوەڕۆی دیجلەو فورات بگۆڕێت و
پێشیانکەوێ و
بیانهێنێ

بۆلای هەژارانی عێراق!.



نە وێنەکێش بوو نە نەحات

نە ئەیزانی هونەر لە کوێوە هاتووەو

دوو ڕەنگیش چۆن تێکەڵ بکات!

کەچی ڕۆژێ بەرەبەیان

تەنها دوو سێ گڤەی مابوو

(با)ی خۆڵەمێشیی ناو بەغدا

بە ڕەنگی سەروەکان ڕەنگکاو

چوار پێنج چەکوشێکی مابوو

بیدا لە سیمای مێژوویەك

تازە تازەو

پەیکەرێ بۆ هەق دروستکاو

خۆریش بانگکا

پەردە لەسەر باڵای لادا!



نەموعجیزەو نە ئەفسانەو

نە فریشتەو

نە ئەسپی باڵداری هەبوو

کەچی هەر بستێکی مابوو

بگاتە بەردەمی خودا!



نە ژەنەراڵ بوو نە لیواو نە عەقید و

عەسكەرییش بوو

یەك فیشەكیشی پێنەبوو!

بەڵام ڕۆژێ بەرەبەیان

خەریكبوو هەر بە بێریەكەی

دێوەكەی ناو بەغدا بگرێ و

لە كێشانی یەك جگەرەی كەمتر مابوو

مردن لەوێدا قۆڵبەستكاو

ژیان لە زیندان قوتاركا!



نە شاعیر بوو، نە نووسەر و

ڕۆمان نووس و ڕۆژنامەوان

كەچی ڕۆژێ بەرەبەیان

تەنها چەند دێڕێكی مابوو

قەسیدەیەك تەواو بكات

لە هەردوو ڕووبار درێژتر.

لە چاوی "جیكۆر"یش جوانتر.

تەنها مانشێتێكی مابوو

ڕۆژنامەیەكیش دەربكات

پان و پۆڕتر لە بیابان.

هەر سێ چوار پەڕەیشی مابوو

ڕۆمانێكیش تەواو بكات

ئەستوور بە ئەندازەی شاخ و

خۆشەویستر لە ڕۆمانەکانی "غائب

طوعمه فەرمان"



نە ژەنەراڵ بوو نە لیواو نە عەقیدو

نە زابت و نایب زابت

دوو قۆپچە لەسەر شانی بوو.

ئەو پڵنگێکی دوو خەت بوو.

بۆ پێشوازیی خۆشەویستیی

خێراتر بوو لە ڕەشەبا.

بۆ ماچکردنی ئازادیی

خێراتر بوو لە یەکەم گزنگی بەیان.

بۆ ئەو مردنەی کە مردیش ئازاتر و

خێراتر بوو لەو گوللانەی پێوەی نرا

"حەسەن سەریع!"



سەیف و تاج و نەجمەکانی

ژەنەراڵ و موشیرەکان

یەك لە دوای یەك

ژەنگ خواردنی و

لە بیرنەمان.

کەچی دوو قۆپچەی سەرشان و

دوو خەتی قۆڵی عەریفێ

یەکەمیان: دوو مانگی زیادەی

دا بە ئاسمان.

دووەمیشیان: دوو ڕووباری تازەتری

ڕژانە ناو گیانی گشتمان!

سەرەتای/ 2006

بەفر نوستووەو هەمیشە

خەون ئەبینێ

بەڵام ئەو هەرگیز ناتوانێ

خەونەکانی نە بۆ شیعرو هەڵەکۆك و

نە بۆ کەس بگێڕێتەوە

چونکە هەتاو خەبەری ئەکاتەوە

چی بینیوە ئەتوێتەوەو

ئاو ئەیانبا!

❖

له پەلەپەلیدا و له جێژوان
ماچێك له لێوی عاشقێ
کەوته خوارەوه سەر زەوی
دواتر دەوەنێ هەڵیگرتەوەو
کردیه پەپوله پاییزە!



ئەو وشانەی به منداڵیی
"تا" یان لێدێت و بەردەوام
شەوانه وڕێنه ئەکەن
که گەورەبوون ئەبنه شیعر!



شێتێکی پاریسی وتی:
دادایەکان له ئێمەوه
فێری نووسینی ئەو جۆرە شیعرانه بوون
کەچی ئاماژە بەناوی کەسمان ناکەن!



ماڵی شیعری جوان
وەك هێلانەی سەر دارتەلی
حاجی لەق لەقی جاران
کەمبوونەتەوە!



هیچ کەشتییەك نییه

لە ئاو وەڕس نەبووبێ و
نەیەوێ هەڵبێ بۆ سەر وشکانی
چونکە لە پشوودانی بەندەرەکانیشدا
تا ئەژنۆیان هەر لە ئاودایە و
بۆیان نییە بێنە دەرێ!.

❖

کە باڵندە هەڵئەفڕێ
خەیاڵێك لە ئەرزەوە ئەبا بۆ ئاسمان
کە وەختێکیش دێتەوەو ئەنیشێتەوە
شیعرێك لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێتەوە!

❖

لە هەموو پاڵەوانانی دنیا بەهێزتر و
ئەرکیشیان قورستر
ئەو مێروولانەن
کە پاڵ بە دەنکە پشقلەوە ئەنێن
ئەیانبەن و ئەیانبەن
تا ئەیانخەنە
شارەکانیانەوە!.

❖

لە ئاو ناسکتر کچی جوانە
لە کچیش ناسکتر شیعر!

❖

نەورەسێك لە چەند ئاوازێکی

کۆنی خۆی پەشیمان بوو بۆوە

بەڵام دوای ئەوەی

بەحر نووسیبوونیەوەو

ڕەشەبایش بلاویکردبوونەوە!

❖

ئەو کاتەی گوڵەکان ئەبنە بێوەژن

(با)یەکان چاویان زیاتر لەسەریانە

کە دەرفەتیشیان بۆ هەڵکەوت

ئەیانڕفێنن!

❖

وتویانە

تابلۆ بۆ چاو

شیعریش بۆ گوێ

بەڵام لای من

جوانترینیان هەر ئەوانەن

کە هی دڵن.

❖

من هەندێ شیعری مردووی خۆم

لە گردێکی دوێنێدا ناشتوون

بەڵام ناوبەناو ئەچمە سەرگۆڕەکانیشیان

چونکە ئەزانم

ئەگەر ئەو مردووانە نەبوونایە

ئەم زیندوانەیشم نەئەبوون!

❖

ئێمە قەت تاقەتمان

لەگوڵە نێرگز ناچێت و زۆر کۆنیشە.

ئێمە هەرگیز لە پەلکە گیا بێزار نابین و

زۆر کۆنیشە

ئێمە هەموو ساڵێ بۆ هاتنەوەو

خۆ دووبارەکردنەوەی بەفروباران

چاو لە ئاسمانین

هەر بەو جۆرەیش هەندێ شیعر!

❖

ڕۆژێ چڵێ پەنجەی گرتم

کە بەریدا، خونچەیەکی لەسەر ڕوا.

ڕۆژێ هەتاو باوەشێکی پێداکردم

کە بەریدام سنگم بووبوو بە ئاوێنە

بەڵام ئەو ڕۆژەی ئەو کچە ماچیکردم

لەو ساتەوە

من بووم، بە دارمێوی شیعرو

گەڵاگەڵاو دەنك دەنك

هەر ماچ ئەگرم!.

❖

هەتا ئێستەیش

لە هەولێر بچمە هەر شوێنێ

کۆڕ، ئاهەنگ، پرسە، ماڵان

سەر دوکان و، چایخانەکان
هەر کورسییەکی خاڵیم لاوەبێ
جانتاکەمی ئەخەمە سەرو بۆی ئەگرم
"عبدالخالق لە دواوەیەو
تۆزێکی تر پەیدا ئەبێ!"
❖
من گەلێ جار
فڕۆکەوانە سەرچڵێم لە زمانداو
شیعرەکانیشم فڕۆکەن.
تەماشاکەن! لەو بەرزەوە
سەرەونخون بە تەقلەوە
وشەکانم بەرەو زەوی
چۆن دێنە خوار!
مەترسیدارە ئەم کارە
چونکە تائێستە چەندین جار
فڕۆکەوان و فڕۆکەم
لەسەرچڵی گەشتەکانما
سووتاون و کەوتوونەخوار!
❖
خەم مەخۆ.. پەپوولە
تەمەنت هێند کورتە.. خەم مەخۆ!
لەو ماوەیترووکەی چاوەدا

ئەوەندەی تۆ عومری درێژت

بەخشیوە بەشیعر

عومری نوح نەیداوە..

خەم مەخۆ.. پەپوولە!

❖

بە تەواوی من نازانم

شیعر چییەو یان ماڵەکەی لە کوێدایە؟!

ئەو ئەشێ بزەی ساوابێو

ماڵەکەشیی لە جۆلانەو لانکەدا بێ!

ئەو ئەشێ دەنکە زیخێ بێ و

ماڵەکەیشی لە ناو بنی زەریادا بێ

ئەشێ و ئەشێ و ئەشێ..

بەڵام ئەوەی لێی دڵنیام:

هەتا ماوم، من پرسیارێکی گەڕۆکم و

ئەبێ هەر بۆیان بگەڕێم!

❖

"هەرد"ێ هەتا تەمەنێکی درێژ

هەر دە دوانزە کانیی نووسیی!

"بەڵام کانیی، کانیی"

هەر دە دوانزە جار جریوەی

دا لە قژی

"بەڵام جریوە، جریوە!"

هەر دە دوانزەجار گۆرانیی

کرد بە تەیری خۆشەویستیی

"بەڵام گۆرانیی، گۆرانیی!"

هەردێ

ئێجگار کەمی وت و

زۆرەکەیدا بە بێدەنگیی

وەکوو "هەردی!"

❖

ئەو شەوەی خەو

بە "نالی"یەوە ببینم

بۆ بەیانیی کە هەڵئەسم

قەسیدەیەکی دڵتەنگم

دیار نەماوەو

سلەیمانی جێهێشتوەو

کۆچ بردوێتی بۆ غەریبیی!.

❖

کە دار کونکەرە عاشق بوو

ئیتر نەهێنی نامێنێ

چونکە هەرچییەکی لابێ

لە دوای دوو ڕۆژ

هەمووی لەسەر قەدو لقی

نزارەکان هەڵئەکەنێ و

ئەوسا دنیا پێی ئەزانێ!

❖

ئەو تابلۆیانەی
کە پەڕەسێلکە ئەیانکێشێ
هەر هەموویان
جووکە جووکی ڕەش و سپین!
ئەو تابلۆیانەی
کە تاوس ئەیانکێشێ
هەر هەموویان نەغمە نەغمەی ڕەنگاڵەیین.
نەورەس هەمیشە هەر ڕەنگی
ئاویی بەکاردێنێ
تووتی لاسایی
وێنەکێشە سریالیەکان ئەکاتەوە.
کۆتر زۆر "واقیعیانە" ئیش ئەکات.
پەپووسلێمانکە تەکعیبییەو
کلاوکوورەکانی کاکەییش
تەجریدی!

❖

ئێوارەیەك لە دوورەوە
بیرۆکەیەکم بەدیکرد تازە تازە
ویستم بەهێواشی بیگرم
بەڵام ڕایکرد!
شوێنی کەوتم
لە پشتەوە هاوارمکرد:

"ئاخر بۆ لە من ڕائەکەی؟"
بێ ئەوەی ئاوڕباتەوە
ئەویش وتی:
"ئەترسم ئێجگار ئەترسم
وەختێ بمخەیتە شیعرەوە
سەقەتمکەی!"

❖

خولیای یاخیبووم کەمترن
لە داسەکناو!
داسەکناوەکان هەمیشە نەرم و بێوەی
دێن و دەچن و لەگەڵ شنەو
کلۆ بەفر و تریفەدا زۆر هاوڕێن!
جوانن وەلێ هیچ ناگۆڕن!
بەڵام هەرچی یاخییەکانە
جاری وا هەیە زمان و ڕێزمان و
ناو خەیاڵ و ناو بینینم ئەشڵەژێنن و
هەمووی ئەدەن بە سەریەکدا
هەر بۆ ئەوەی دەستەواژەی
چەخماخەیەکی نەبینراو
بدۆزنەوە لەناو ناخما!

❖

ئەو دارە لەبەر گەڵا

نایپەرژێتە سەر باڵندە.

باڵندە لەبەر هەڵفڕین

نایپەرژێتە سەر هێلانە

هێلانە لەبەر جووجەڵە

نایپەرژێتە سەر پڕپۆڵە

منیش لەبەر هەر هەموویان

نەپەرژام ئەم کورتە شیعرە

تەواو بکەم...

❖

کە ڕەوە ئەسپ حیلاندیان

شاخەکان وتیان:

ئێوە هەر بۆ وتنی مارشی نیشتمانیی باشن!

کە مامزێك بازڕنی کرد

مێرگێك پێی وت:

بەڕاستی تۆ هەر بۆ وتنی

گۆرانیی عاتیفی باشی!

کە بولبولێك خوێندی

گوڵێك پێی وت:

لە بەستە بەولاوە هیچی تر مەڵێ!

کە چۆلەکەکان کەوتنە جریوە جریو

درەختەکان وتیان:

ئێوە هەر بۆ ئەوە باشن

ببنە کۆرسی تاق تافکەرەکان.

کە کەوەکانیش خوێندیان

کەژەکان وتیان:

ئێوە هەر بۆ حەیران وتن دروستبوون!

ئەو وەختەی کە منیش گۆرانیم وت:

ژوورەکەم پێی وتم:

بەڕاستی تۆ هەر بۆ ئەوە باشی

کەڕەواڵەکان گوێت لێبگرن!

❖

ئەو فلووت و

کەمانچەو نۆتە گەنجانەی

کە ساڵانە لێرە بەسەرەطان ئەمرن

کەم نین!

ئەو پێکەنینی ڕووبارو

ئەو شەماڵی زەردەخەنەو

ئەو سەرچۆپی قەڵەمانەی

کە ساڵانە، لێرە، بە نەخۆشی دڵ وەستان و

هەوکردنی سیەکان و گەدە ئەمرن

کەم نین!

ئەو هەموو هیوا سەوزو سوورانەو

ئەو هەموو دار سێوی ژنەو

ئەو هەموو دار مازووی پیاوەی

که ساڵانە لێرە بەکارەساتی هات و چۆ

ئەمرن کەم نین.

لێرە عومری زەماوەندو

تەمەنی خۆشیەکان کورتن.

بەڵام ئەوانەی کە لێرە

نە تووشی شێرپەنجە ئەبن و

نە دڵیان هەرگیز ئەوەستێ و

نە ئەبن بە ژێر هیچەوەو

تەمەنیشیان بەقەد عومری

نوح درێژە

لەوانەیشە کە هەر نەمرن

پێنج شەشێکن:

هەژاری و بێکاری و گرانی و

گەندەڵی و ژن کوژی و سانسۆرن!

❖

پاییز وتی:

لەم باخەداو

لەناو ئەم هەموو ڕووەك و

دارانەدا

کە من هاتم لە دواییدا

هەر چەند دارێك

ڕەنگی کەسکیان پێئەمێنێ!

ژیان وتی:
لەسەر ئەم ئەرزە و لەنێوان
ملیارەهای ئەم خەڵکەدا
کە من ئەڕۆم و مردن دێ
لە دواییدا
هەر بەشێکیان لە ئاوێنەو
شەوقی گەشی
مانەوەیان پێئەمێنێ
دوا ڕۆژێکی ئێجگار دووریش
بە منی وت:
لەناو ئەم هەموو قەسیدە و شیعرانەدا
کە باخچەکەی تۆیش گرتوونی
کە من هاتم
بەشی زۆریان با بردوونی و
گەڵاڕێزان دایپۆشیون و
تەنها کەمەکێك ئەمێنن
من حەز بکەم بیانبینم!

❖

(با) بردمی بۆ ئاسمان و
ئاسمان دامیە دەست هەسارەو
هەسارە دامیە دەست "سڕ" و
سڕیش دامیە دەست نوورێك و

نووریش گەیاندمیە لای خودا!

❖

"نالی" لەناو قەسیدەدا

بۆ جوانی و ڕاستی ئەگەڕا

"مەحوی" لەناو سڕی خواداو.

بەڵام "حاجی" لەسەر ئەرزو

لەناو دڵی ئەم خەڵکەدا

بۆی ئەگەڕا!

❖

دوو وشەی سیس

"گۆران" دەستی بۆ بردن و گەشانەوە.

دوو باڵی سست

"ئەسغەر" لە دەنگی خۆی بەستنی و

ئیتر چوونە ناو قوڵایی ئاسمانەوە!.

❖

لە دەشتێکدا

لاپەڕەیەکی دڕاوی ڕۆژنامەیەك

(با) هەڵیگرتەوەو بردی

بۆ ماڵی ڕۆژنامەوانێ

لە بیرکراو!

❖

وەختێ تابلۆیەکی زۆر جوان

چاوو دڵم ئەبا بۆ خۆی

کە جێیدێڵم و

لە پێشانگە دێمە دەرێ

ئەگەر هەورێکی تیا بووبێت

لەڕێ بە سەرما ئەبارێ و

ئەگەر کەمانچەی تیا بووبێ

بە حەزی من لەو ئاوازەم بۆ ئەژەنێ و

گەر منداڵێکی تیا بووبێ

ئەوا دێتە باوەشمەوەو بە دەممەوە پێئەکەنێ و

گەر کچێکیشی تیا بووبێ

ئەوا قۆڵی لە قۆڵمایە هەتا ماڵێ!

❖

لە گڤەگڤی هەموو ڕەشەبایەکدا

پیاوێك هەیەو لە شنە شنی

هەموو سروەیەکدا ژنێك

ئەویان دێت بۆ شکاندنی گوڵدانەکان و

ئەمیشیان دێت بۆ ئەوەی

خاویکاتەوەو بە ئەسپایی دەستی بگرێ و

نەهێڵێ بیانشکێنێ!

❖

"دڵدار"م دی، خەندەیەکی لە خۆبایی

خستبوە ناو خەمێکی ئاوریشمینەوە

ئەیبرد بۆ ئەوەی لە تێلی
تاوسێکی مووتوربەکا!.
❖
لەم زمانە شەرمنەدا
یەکەم قەڵەم
کە پەردەی کچێتی "شەرم"ی دڕی و
دەرپێی شیعری هەڵدایە ناو
ئاگرەوەو
ڕووت و قووت چووە سەر کاغەز
ڕووت و قووت چووە چاپخانەو
بێباکانە ڕووت و قووتیش
هاتە دەرێ و بۆ ناو خەڵکی!
"شێخ ڕەزا" بوو!
❖
"هێمن"م دی
قاپێ شەراب لە پێشیەوە
قاپێ عەرەق لە دوایەوە
ئەڕۆیشتن و
ئەچوون بۆ لای شیعری خەیام
تا پێکەوە
چوارینەیەك دروستکەن و
نوێژ بۆ عەشق دابەستن!
❖

هەموو شەوێ

"پیرەمێرد" لەژێر سدارە ڕەشەکەیدا

چەند هێلکەی وشەی دائەنا.

خۆی ئەڕۆیشت و

مەراق لەسەریان کڕ ئەکەوت.

بۆ بەیانیی کە سدارەکەی لائەبرد

ڕستێ جووجەڵەی دەنووک زەرد

بەسەر دێڕی ناو دەفتەرو بەدوای یەکدا

بە جووکە جووک

ڕایان ئەکرد!

## -1 -

کافتریا، شینباوەو
دوو هێشووی زۆر گەورەی چلچرا، دەس لەمل،
هێند شۆڕن، خەریکن لەسەر مێز دابەزن.
دووچاوم، دوو چاوت، بە ساردی بەینمان و
بە گەرمای ژوورەوە، بێدەنگن و شووشەن و
خەریکن تەم ئەگرن!
هالاوی دووقاوە، بە نەرمی، ئەڵقاوئەڵق
بەرەو ژوور ئەڕۆن و لە قژم و لە قژتا
تێکەڵی یەك ئەبن.
دوو تابلۆی سەر دیوار:
یەکەمیان: پەنجەرەی ژوورێكو، دوولاولاو
تێکئالاو!
دووەمیان: کەناری دەریاچەو
دوو دڵدار نیوە ڕووت، ئەوانیش تێکئالاو.
لەو دیوی دوو دەریی شووشەوە
دوو مەلیش وەك باڵیان لە باڵی یەکدابێ
بۆ شوێنێ، پەناگەی دوور لەچاو، هەڵئەفڕن.

هەموو شت لە دەرێ و لە ژوورێ، بە چرپەو،
بە هێماو، ڕاستەوخۆو، دەنگی بەرز
وەك بڵێن: ئەی ئێوەیش جووتێ نین؟
ئەی بۆچی هەڵناسن و بچنەوە بۆ ژووری
گوڵ گوڵی خۆتان و
پێکەوە ڕاکشێن؟!

**– 2–**

**هەموو پەیڤەکان ئاسایین**

**پەیڤێ نەبێ.**

**هەموو ناوەکان بێتامن**

**ناوێك نەبێ.**

**هەموو ڕۆژەکان دووبارەن**

**ڕۆژێك نەبێ**

**هەموو شوێنەکان لێکئەچن**

**شوێنێك نەبێ**

**خۆشەویستیت و ناوی تۆو**

**ئەو ڕۆژەی یەکتر ئەبینین**

**لە جێژوان!.**

- 3-

پرسمکرد بە کانیی

بەرلەوەی جۆگەلە بناسم.

پرسمکرد بە جۆگە

بەرلەوەی کە ڕووبار بناسم.

پرسمکرد بە ڕووبار

بەر لەوەی کە زەریا بناسم.

پرسمکرد بە زەریا

بەرلەوەی کەشتیەکەم دروستکەم

پرسمکرد بە کەشتیش

بەرلەوەی دڵم بێ

سەرتخەم!.

## ـ 4ـ

ئەم گۆرانیەم خۆش ئەوێ

لای من نامرێ هەتا نەمرم

نە لەبەر ئەوەی ئەم دەنگە خۆشترینەو

وشەکانی جوانترینەو

نە لەبەرئەوەی موزیکی بەرزبەرز ئەفڕێ!.

لەبەرئەوەی بۆ یەکەمجار

لە سەیرانەکەی قۆپیدا

کە خۆمان لەوان دزیەوەو

چووینە ناو تەلانێکەوەو

لە گەرمەی ڕامووساندا بوو

گوێمان لێبوو!.

ـ 5ـ

سێ شیعر بووین، بەیەکەوە و لەیەك کاتدا

حەزمان لە گوڵێك کردبوو

ـ خەریکبوو ئەبوو بە شەڕی ناوخۆی شیعر!ـ

گوڵە وتی: لەسەرخۆبن

داوا ئەکەم جیاجیا نامەم بۆ بنووسن!

وشەی کامتان بوو بە نمەی سەر ڕووخسارم

ڕستەی کامتان بوو بە شنەو بە پەپوولەو

بە ئاوێنەو بە پەلکە گیای یادگارم

ئەوسا ئیتر

لەمانگە شەو خۆم ئەڵقەیەك دروست ئەکەم

بۆ پەنجەی شیعری زیوینی ئەو کەسەتان!

یەکەم نووسیی:

بە غەمزەی پڕ لە ئەفسوونی غەزەل خوانی دووچاوت

مەلەك ئاسا کەمەندکێشی دڵیکردم هەتاوت

عەزابی من مەگەر وەختێ لە ئاگردا تەواوبێ،

کە دەورمبات خەت و خاڵ و قژی خاوو جواناوت

دووەم نووسیی:

ژنێك لەوێ

گالیسکەیەك لە ئاسمان.

گوڵێك لێره

تەپ و تۆزێ لەسەرشاخ!.

مەرگ. عەشق

عەشق. مەرگ

مەحەبەت و

جاویدان و

غەریبیی

هاتەخوارێ باڕێزەکەی ناو زمان

ئەلف و بێ و جیم و دال و

گرم. گرم. ئەمە هەورە یان سەرم؟!

قەت لێم نەترسی گوڵم!

ئەلف و بێ و جیم و دال و دوور بە دوور

بۆ تێمناگەی گوڵی سوور؟!

منیش نووسیم:

تۆ ناسکتری یاخود ئاو؟!

ئەو ڕۆژە نامە ڕوشاندی سەرگۆنەت و

سروە زبربوو، بۆ پەڕی، شان و ملو

بەفر شەرمیکرد بچێتە سەر سپێتی

قەد و باڵات!

من ئەو شیعرەم

خۆت نوسیوتم

لەسەر ئاوو لەسەر سروەو

لەسەر بەفرو گەڵای خەیاڵ

شەوی دوایی

گوڵەی دڵدار

لەمانگەشەو ئەڵقەیەکی دروستکرد و

بە شەماڵدا بۆی ناردمە ماڵ!

ـ 6ـ

گوارەت شپرزەیی منەو
ملوانکەکەت ئارەزووم و
تەیری سەر بلووز هۆنراوەم.
بە گوێچکەتا هەڵواسراوم و
بە گەردنتەوە لەرەم دێ و
لەسەر سینەت هەڵفڕیوم!.

**ـ 7ـ**

**ئاخر چنارو بەژنی ئەو؟!**

**ئاخر مانگ و ڕوخساری ئەو؟!**

**ئاخر بەردو مەمکی قوتی؟!**

**ئاخر مەڕمەڕو پووزی ئەو**

**شاعیرەکان هەڵەیان کرد!**

**چنار بینیو بڕیاریدا:**

**ببێ بە دارەڕای ژووری.**

**مانگ بە چرای سەر حەوشەکەی.**

**بەرد بیداتە بەر دەرگاکەی.**

**مەڕمەڕ بۆ پێشی خانوەکەی.**

**شاعیرەکان هەڵەیان کرد!**

ـ 8ـ

زەردەو گزنگ

بەیەکەوە لەسەر ئەم مێزە دانیشتوون.

بەیانیی دەستی وا لەناو

دەستەکانی ئێوارەدا.

لەیەك کاتدا کازیوەیەو خۆرنشینە

بۆیە نە ڕۆژ کۆتایی دێو

نە شەو دادێ

"زەمان" چۆتە ناو "شوێن"ەوە.

بۆچی هەستین؟!

خۆشەویستیی بۆتە سەعات

بۆیە هەر ساتێ. سەیریکەم

هەر ئەو ساتەیە کە هاتین!.

**ـ 9ـ**

**ئاو بێ هەوا**

**هەوا بێ گڵ**

**گڵ بێ ئاگر**

**من بە بێ تۆو**

**تۆیش بە بێ من**

**نیوە ڕستەو**

**نیوەماناو**

**نیوە شیعری ناتەواوین!**

**ـ 10ـ**

تۆ ڕۆیشتیو

له نێوان، ددانی، شانەکەی سەرمێزدا

چەند تاڵێ له قژت جێمابوو.

دوو تاڵم ڕاکێشاو، دامنه دەس

دوو وشەی بزۆزم

هەر خێراو لەوێدا

کردیانن به دوو دێڕ گزنگی نووسینم.

سێهەمم ڕاکێشاو

خستمه سەر سەرینم

ئەو دەمەی ڕاکشا مەراقم و

که نووستم

له خەودا تاڵ بوو بوو به ڕێگەی

باریك و درێژی سەفەرت و

بەو هێڵەی، دابڕان، ئەیکێشێ

بۆ شەوی تووڵانیی عاشقان!.

## ـ 11ـ

دوێنێ شەو
بە سۆفتە ڕەشەکەی خۆم نووسیم
پەخشانێ وشك وشكو
هەرچیمکرد یەك وتەی تەڕنەبوو!.
هەرچیمکرد یەك ڕستەی بەراوی
بۆ دەشتی خەیاڵم تیانەبوو.
هەرچیمکرد ناونیشان هەر مۆن و
وێنەکان هەر تەڵخ و
زمانی ئەیگرت و
مۆسیقای هەر شەل بوو!.
وا ئەمشەو
سۆفتەکەی خۆم گۆڕی
بەو شینەی ناردبووت
ئەوەندەو ئەمجارە هەمان دەق
لووزەوی خەیاڵی تێڕژاو
کۆتەرەی مانای وشك سەرئاو کەوت
ئەوەندە و زمانم تیاپژاو

ناونیشان پێکەنی و

لە وێنەی تەڵخەوە شەبەقێ بەدەرکەوت.

مۆسیقایش قاچەکەی ڕاست بۆوەو

کەوتەوە سەمای خۆی!.

تێبینی:

کچی جوان تکایە

لەو سۆفتەت چەند لایە

هەر هەمووی بنێرە

من ئیتر بەوەی خۆم نانووسم!

-12 -

دەمێکە ئێجگار دەمێکە
ژن تامێکی تیا نەماوە
لە غەزەلی ئەم ڕۆژەدا.
چاوگەکانیان ساردوسڕ
بێ تام.. بێ تام
بۆیە بەنیازم ئەمجارە
خۆشەویستیی ئەو ژنەی خۆم
بکەم بە کونجی بۆ شیعر!.

ـ 13ـ

یەکترمان بینیەوە

بەڵام کەی؟!

ئەو وەختەی بەفرانبار لە قژتاو

زەردەپەڕ لە ڕووماو

پاییزێ لە لەشتاو

ئەنگۆرە لەچاوما

هاتبوون

یەکتریمان بینیەوە

بەڵام ئاخ

هەر گوێمان بمایەو

یەکترمان نەدیبا!

**ـ 14ـ**

**به شاڵە سپیەکەی سەرشانت و**

**بلووزی زەردەوە**

**هاتبووی بۆ کۆڕی شیعرەکەم**

**بەرامبەر ڕووناکیی**

**سەر شانۆ بە پێوە وەستابووی.**

**سەیرمکرد**

**لێمتێکچوو نەمزانی**

**تۆ گوڵە بەڕۆژەی ناو شیعری**

**یان کچە نێرگزی**

**گەڕەکی خۆمانی؟!**

ـ 15ـ

له باخچەی نالی دا

ئەو ڕۆژە هەر خۆم بووم

شیعرێکی وەڕس و تەنیابووم

دارسێوێ بینیمی و ناسیمیو

دەستیبرد لە گوڵی باڵای خۆی کردەوەو

بۆیکردم بە کورسی و

لە تەنیشت جۆگەکەی بەردەمی بۆیدانام!

ئەو ڕۆژە شیعرێکی بێزار بووم

کە (ئەو) هات تێپەڕێ

چاوانی سیحراویی دەوریاندام

گرتمیان

وەکوو خەو بردمیان. بردمیان

هەتاکوو ئەو سەری شەقامی سالم و

لەوێدا ڕەقیبێ پەیدابوو

ترسامو

ترسانو

بەریاندام

که بەربووم لەو ساتە بەولاوە

هەستمکرد ئەو کاتە ئازادم

لەچاوی شۆخێکی وەك ئەودا

گیرابم!

ـ 16ـ

دوو پەرداخ لە تەمەن

یەکەمیان: خەزانی لەرزۆکم هەڵیگرت

لە نیوەی ڕێگادا لە دەستی بەربۆوەو هەڵوەری!

دووەمیان: بەهاری بۆشناخت هەڵیگرت

ئەو وەختەی کە لێوت پێوەنا

بە شووشەو ئاوەوە

پێکەنی!.

## ـ 17ـ

دار وتی:

خۆ هەر تۆ نانووسی

سەیرکە ئەو هەموو پەخشانەی

پڕوپۆم نووسیونی!

ئاو وتی:

خۆ هەر تۆ مۆسیقا لێنادەی

گوێگرە لەو هەموو ئاوازەی

ڕووبارم دایناون!

کەژ وتی:

خۆ هەر تۆ نەقاش نیت

تەماشای ئەو هەموو وێنانەی

لاپاڵ و دەربەندو نزارم کێشاونی.

ئەو کچەیش پێی وتم:

قژی من پەخشانی جوانترە یان هی دار؟!

لەشی من مۆسیقای خۆشترە یان ڕووبار؟!

ئەو هەموو وێنانەی کە خەندەو

سەرنج و ماچی من

لەسەر ڕووت کێشاونی
جوانترن یان هی کەژ؟!
خۆ هەر تۆ نانووسی!

## ـ 18ـ

دوا وێنەت

لەبەردەم شوباتا وەستاوی

تۆ ئاڵ و

تۆ گەرم و

سروشت سارد

لەسەر ڕا

بە نزیکیش بە سێ ڕیز

لەرزانە.. لەرزانە

بەسەرتا دێتەخوار.

کلۆکان لە قژت و سەرشان و باڵاتا

پەپوولەی زستانن.

چەند جوانی و چەند جوانن.

ببوورە وێنەکەت ئێستاکە لام نییە

هەر ئەمشەو شیعرێکی نەقاشی لاسارم

لێی سەندم

بۆ یەك شەو بردوێتی

بەڵێنە تا سبەی

ئەو بیکا بە تابلۆی سەر بەرگی

سەرجەمی دیوانم!.

## ـ 19ـ

دووراو دوور

ئێستاکە: جل سپی و بەپیەوەیت:

هەر وەکوو دار هەرمێ ببینم

بڕوات و بێ و بچێ.

ئێستاکە: نوشتاوەی:

پلوسکێ لە بەفراو ئەبینم

بۆ شەوقێ دانەوێ

ئێستاکە: دانیشتووی:

دەوەنێ ئەبینم پەپوولە

سەرتاپای داپۆشێ

بەڵام من نازانم

ئەو وەختەی بە تەنیا و بە ڕووتی

پاڵکەوی

ئەبێ کام دیمەنی سیحراوی

تەبیعەت لێتبچێ؟!.

## ـ 20ـ

رۆژنامەکەو پیاسەی وردی ئەوچاوانە

رۆژنامەکەو وردە ماچی ئەو پەنجانە

رۆژنامەکەو ئارامگرتن لەناو کۆشتا

رۆژنامەکە کە هاتەلام و سەیرمکرد:

مانشێت لەسەر شەڕی ناوخۆ

بووبوو بە ڕیزێ پەپوولە.

سەر وتار لەسەر "زەرقاوی"

بووبوو بە گۆمێکی شینی بەر تریفە.

تەقینەوەی ئوتومبیلێ

بووبوو بە فوارەی گۆڕەپان.

لاشەی منداڵێکی کوژراو

بووبوو بە گوڵاڵەی هەردێ

چڕە دووکەڵی فەلووجە

بووبووە ساماڵی سەرگۆیژە..

رۆژنامەکە!.

**ـ 21ـ**

له سەیرانەکەی "قەشقۆڵی"و
لەسەر بەردێکی شیعر دۆست
تۆ چاویلکە هەتاویەکەت لەبیرچووبوو.
بەردی دۆستم بە"با"یەکی دەست بەتاڵدا
هەر خێرا جوابی بۆ ناردم!.
منیش چووم و بە یادی چاوانی سەوزت
هەڵمگرت و کردمە چاوم
وەختێ زانیم: سەرنجەکانت هاتنەناو
سەرنجمەوە
سۆمات کەوتەوە ناو سۆمام
هەستمکرد چاوم سەوز ئەبێ
شووشە هەندێ لە تەماشای ڕابوردووتی
لەناو خۆیدا گل دابۆوە.
گەڕانەوە، بە پشتاوپشت، دوێنی و پێرێو
دیمەنەکان گەڕانەوە.
چاوی عەینەك بوونە دوو گۆم
نەهێنیەکان سەرئاو کەوتن:

وردبوومەوە، ئەرێ کچێ!
زۆربەی وێنەکان هەر منم:
لە مەیاندا، ئەوەتام وام لەسەر شەقامی "سالم"و
شیعر ئەچێنم!.
لەوەیاندا، لەبەردەمی پەیکەرەکەی "گۆران"دام و
گوڵاڵەی کچی ئەدوێنم!.
لەمەیاندا، لەسەر گردی "مامەیارە"م
سدارەکەی "پیرەمێرد"م لەسەردایەو
دێم و دەچم و پارووە یاپراخ ئەبەخشمەوەو
لەمەشیاندا، لە جۆلانەی مەقامێکی "مەردان"دام و
دووانەی جوانیت و عەشقی خۆم ڕائەژەنم.
ئەرێ کچێ! ئەی بۆ وتت:
پیاوێك نییە هاتبێتە ناو تاراکەی خەیاڵمەوەو
شیعرێك نییە بووبێ بە هەوری ناو سەرمەو
سێوێك نییە لەگەڵ ئەم سێوی دڵەدا بیگۆڕمەوە!
بەڵام عەینەکی هەتاویی
ئاشکرایکرد لە ژێرەوە
چەند تینوویت و
چۆن ئەڕوانی!

**ـ 22ـ**

**بەشوێن پێی وشەدا ڕۆیشتم و**

**گەیشتمە ترۆپکی سەر خەیاڵ.**

**بەشوێن پێی خەیاڵدا ڕۆیشتم و**

**گەیشتمە ئاسمانی ناو شیعرو**

**بەشوێن پێی شیعردا ڕۆیشتم و**

**گەیشتمە تەلیسمی ناو جوانی و**

**بەشوێن پێی جوانیدا ڕۆیشتم و**

**گەیشتمە جوانیت و**

**لەوێدا ڕاوەستام!**

سلێمانی

تشرینی دووەمی / 2004

## ـ 23ـ

ئەی ئاوێنە باریکەکە!

ئەی کچەکە

هەموو جارێ کە لە تۆدا

تەماشای عومری خۆم ئەکەم

ئەبمە کانی و گەنج ئەبمەوە

بۆیە ئەمەوێ لەمڕۆوە

بتبەمەوە بۆماڵەوەو

لەژووره تەنیاکەی خۆمدا

بەرامبەری شیعرەکانم

بە ڕۆحما هەڵتبواسم!

ـ 24 ـ

مانگی دەسکرد

مانگی ئەسڵی

مانگەکەی خۆم

یەکەم بەدەوری دووەمدا

خول ئەخوات و

دووەم بەدەوری زەویداو

سێهەم بەدەوری شیعرداو

هەر سێکیشیان لەیەك شەودا

لەناو سەری مندا هەڵدێن!

ـ 25 ـ

## ترس

لەسەر کاغەزی بەردەمم

بەر لەوەی خەیاڵ هەڵبکاو

بەرلەوەی وشە بباریٚ و

بەر لەوەی وێنە دەرکەویٚ

لەو چۆڵەوانی و

سپیاتی و

بێدەنگییە

ئەترسم و ئەبم بە ڕەنگی شپرزە

تەواو وەك چاوەڕوانی و دوودڵی و

ترسی عاشق

لە "نەهاتن" و "دیارنەبوون"

وەختی ژوان!

2005/6/8

## ـ 26 ـ

له كافتريا شين باوەكە

لەگەڵ سێبەری تەنياييم

چوومەوە سەرهەمان مێزو هەمان كورسی

گۆشەكەمان.

له جێگەكەی خۆم دانيشتم

له جێگەی تۆيش بەرامبەرم

شيعرێكی خۆم دانيشتبوو

هەرچەند ويستی وەك تۆ بدوێ و

وەك تۆ جوان بێ و

هەر وەكوو تۆيش پێبكەنێ

بەڵام ئەفسووس!

نە تەماشای ڕاكێشام و

نە تۆزقاڵێ زەردەخەنەی پێگرتم و

نە توانيشی تەنيايی من ڕابژەنێ

بۆيە ئيتر دەستم دايەو

هەڵمسان و

لەسەر كورسيەكەت

دڕانم!

**ـ 27 ـ**

کراست زێیەکی شین و
لە کەناریا وێنەی بەلەمێکی تیایەو
ئاوو هەوای ئەو ڕۆژەیش کپ!
هەناسەیەك هەڵئەکێشم
(با) یەك لەسەر زێ هەڵئەکاو
شەپۆلی زێ دێت و ئەچێ و
ئاوو هەوای کپ ئەجوڵێو
دوو پەنجەم ئەکەم بە سەوڵ و
وەك لە ڕووباری (نیل)دا بم
بەلەم ئەئاژووم بۆ سەرێ
من ئێستاکە ڕوومکردۆتە ئاوی مەنگی
نێوان دوو گردۆڵکەی سپی
لەسێبەرێکی فێنکدا!
بەلەمەکە ڕائەگرم و
دێمە خوارێ
خۆم بەتەنیا بەسەر ئەو گردە جوانەدا
هەڵئەگەڕێم

**ماندوو ئەبم. هەناسە سوار. تینووم ئەبێ**

**بەڵام ئەو ساتەی ئەگەمە گۆپکەی سەرێ**

**لەبەردەمما زنەیەکی ئاڵ ئەبینم**

**ئیتر یەکسەر**

**هەر لەسەر دەم درێژ ئەبم و**

**دەم ئەنێمە زنەی ئاڵ و**

**چاو هەڵنابڕم.. سەر هەڵنابڕم**

**هەتا لەو شوێنە خۆشەدا**

**بۆ خۆم خەوم لێئەکەوێ!**

## ـ 28 ـ

که جێمهێشتی
بۆنی خۆشی، دەست و پەنجەو تەوقەتم گرت.
هەر لە دوای تۆیش
ڕێگەم کەوتە باخێکەوە.
گوڵی سەر لقێ پێی وتم:
ئەمە بۆنی چ گوڵێکەو ناوی چییە؟!
وتم: ئەم بۆنە بۆنی گوڵ نییە
هی دەست و پەنجەی کچێکە!.
لێمببوورە
ناتوانم ناویت پێبڵێم!
بەڵام یەکەم حەرفی "ڤ"ە
بۆ ئەپرسیی؟!
وتی: پێناچێ ئەم بۆنە
کە لە بۆنی من خۆشترە
تا یەك دوو ڕۆژی تر بڕوا!
وتم: جارێ چاوەڕێبە، تۆ لە کوێتە!
با ئەمجارەیان بێمەوە

بۆنی قژ و بۆنی لامل و مەمانیت بۆ ئەهێنم

بۆنی ئیتر لەم باخەدا و لەم شارەدا

جێنیشتەبێ و هەرگیز نەڕوا!

1999

## ـ 29 ـ

لەدەرگای پشتەوەی جێژوان

لەویەوە

بەدزی چاوانی ترەوە

ماچێکی عاشقم

گەیشتە ژوورەوە لای "لێوان"

ئەو وەختەی لەبادەی هەناریی

لێوانی خواردەوە

هێند مەست و سەرخۆش بوو

ئەمجارە چشیکرد

لەچاوی نەیاری ئەو خەڵکەو

ئاشکراو بێدەربەست

لە دەرگی پێشەوە

ئەو چووە دەرەوە!

**ـ 30 ـ**

**تا باران خۆشیکردەوە**

**من لەژێر چەترەکەی "تۆ"دا**

**بارانی ژانێکی تر بووم**

**کە تۆ ڕۆیشتی و جیابوویتەوە**

**لە دوورەوە خۆشەویستیت هەوری هێناو**

**ئەمجارەیان عەشقێکی زۆرتازە باری و**

**شیعریش خۆشی نەکردەوە!**

## ـ 31 ـ

ئەو کچە

لەسەر کورسیەکەی

پێکەنینێکی ئاڵ ئاڵی لێبەجێما.

پێکەنینم هەڵگرتەوەو

بردمەوە ماڵ!

دام بەڕەنگێکی زۆر تەڵخی

ناو ژوورەکەم

لێی وەرگرتم و لەبەرچاوم

پێکەنینی کردە بەری!

کە ئەمجارە تەماشامکرد

ڕەنگی تەڵخم

کرابۆوەو

گەشابۆوەو

بوو بوو بە ڕەنگێکی ئاڵ ئاڵ!

## ـ 32 ـ

که له یەکتر جیابووینەوەو
دەسەسڕی سەرچۆپێکەت
پێشکەشکردم!
لەو ڕۆژەوە
که زیاد له شیعرێ بنووسم
سەرمێزم ئەبێ به دەشت و
به وشەی ئاڵ و واڵاوە
هەموو دێن و
کامه شیعریان کەڵەگەتەو
چاوی سەوزە
دەسه سڕەکەت ئەبات و
بۆ سەرچۆپی، سەر دێڕ ئەگرێ و
خۆیشم ئەبم به قەڵەم و
لەگەڵیاندا هەڵئەپەڕم!

## ـ 33 ـ

ئەگەر گوڵ بدەی لە سنگت
وشەکانم بۆنی ئەگرن
ئەگەر تەیرێکی لێبدەیت
پەنجەکانی دەسم ئەفڕن
ئەگەر شمشاڵێ لێبدەیت
خەمانیشم هەڵئەپەڕن
ئەگەر بەلەمت لێدابێ
منیش سەوڵم.
ئەگەر مامزی پێوە بێ
خۆم پێدەشتم
گەر هێشوە ترێی پێوەبێ
قاپە شەرابێکی مەستم
ئەگەر ئایەتت لێدابێ
خۆم منارەم و بانگدەرم
ئەگەر خاچیشت لێدابێ
ئەوا من عیسای دووەمم
ئەگەر ئەستێرەی پێوەبێ

من هەر شەوم

ئەگەر خۆریشت لێدابێ

شەوم نییەو بە خەبەرم

ئەگەر ئالآی کوردستانیش

لە سنگ بدەی

ئەوا منیش پاسەوانتم و

لە دامێنی ئەو گردەدام

کە ئالآکەی تیا هەڵئەکەی!

## ـ 34 ـ

هەنگ مژینی کوڵمی هەموو
گوڵێکی لە بیرنەماوە
ئاو تینویەتی شکاندنی هەموو
دارێکی لەبیر نەماوە..
هەور داکردنی بارانی خۆی بەسەر
هەموو کێڵگەو مەزرایەکدا بیرنەماوە
من ئەو ماچانەی کردوومن
هەموویانم لەبیر نییە
بەڵام ئەوەی کە لە بیری هەموومانەو
بیر چوونەوە لێوەی دوورە
کوڵمەکانی یەکەم گوڵەو
قژی یەکەمین درەختەو
باڵای یەکەمین کێڵگەیەو
مژینی لێوی یەکەم کچ!

## ـ 35 ـ

ئەو ڕۆژە کەسکت پۆشیبوو
هەستمکرد منیش وا ئیتر وردە وردە
ئەبم بە مێرگ و سەوزەگیا.
ئەو ڕۆژە سوورت پۆشیبوو
هەستمکرد منیش وا ئەبم
بە دار هەناری سەر ڕێگا.
ئەو جارە سپیت پۆشیبوو
هەستمکرد منیش وا ئەبم
بە نەورەسی شیعر و زەریا
دوێنێش کە زەردت پۆشیبوو
گوڵە بەڕۆژە بوو بەسەرم و
بۆ هەر کوێیەك بچویتایە
لە دەوری باڵات ئەگەڕا!

## ـ 36 ـ

خۆت لێرە نیت و بزریت.
بەڵام هێشتا زەردەخەنەت هەر لێرەیەو
لەسەر کورسی بەرامبەرم دانیشتووە.
خۆت لێرە نیت
بەڵام دوای خۆت ڕەنگی قژت و
تۆنی دەنگت و
بۆنی لەشت
بۆ تەنیاییم و ژوورەکەم جێهێشتووە.
خۆت لێرە نیت و بزریت.
بەڵام ئەوەی کە بەردەوام
لەم ماڵەداو، لەسەر چرپاو لەجێگەداو
لەخەویشدا لەگەڵمایەو
جێمناهێڵێ
دیمانەی خۆشەویستیتە!

- بیست و دوو پارچەی ئەم کورتە شیعرانە بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری (شین)ی ژمارە (7) دا بڵاوکرانەوە.

# مەرگی شەوبۆیەك

هۆ. هۆ. هۆ:

لەو دوورەوە ڕا

بە شنەشن و

خەندەی وشەوە

شیعرێکی چاوڕەش، بە ڕێگاوە بوو، بێتەوە لامان

دەستێکی گزنگ، دەستێکی تاژان

پرچی سەمەل و، باڵا قەڵبەزە و

پەنجە گەزیزە و ، ئەستێرکی سەریش

پڕپڕ لە خەون و

پڕپڕ لە بۆنی

ئێوارەی "بۆکان".



گیان. گیان. گیان.

لەو دوورەوە ڕا

کۆترە شینکەیەك

بە گمەی تەڕی بەیانیانەوە

بە ڕێگاوە بوو، بێتەوە لامان.

ئەو باڵی پەڕەی گوڵ هێرۆی سپی و

ئەم باڵی زەردەی ئاوارەبوون و

حەزی: نارنجی و

خۆزگەی: خاڵ خاڵ و

شەقژنی: سەوز و

بە ئاسمانەوە

دەنووکی ئەدا

لە شووشەی هەوری ڕەنگ وەنەوشەیی

سەر دەریاچەی "وان"

☼

وەی. وەی. وەی.

لەو دوورەوە ڕا، لەناو بەفرەوە

"مانگ"ێکی ئێمە

بە خەمی ئاڵ و خەرمانەی مۆر و

بیست و دوو چرۆی بزەی خۆیەوە

بە ڕێگاوە بوو

بگاتەوەجێ.

وادەیشمان وابوو

مانگ لەگەڵ خۆیدا

هەر لە باوەشیا

گەواڵە هەوری پرسیاری تازەی

سەر بەرێژنە و

**لە دەنگی یاخی ژنانی ئەویش**

**هەندێ چەخماخەی**

**نوێمان بۆ بێنیێ!**



**ئاخ. ئاخ. ئاخ!**

**لەو دوورەوە ڕا**

**بە خۆی و جانتای پڕ لە جریوە و**

**پڕ لە دواڕۆژ و**

**پڕ لە ئەوینی "جەمیلە"ی دایك و**

**"ئەسرین"ی خوشك و**

**پڕ لە پەپوولەی "ئێلخانی زادە" و**

**پڕ لە سۆراخی ناو تەمتوومانی**

**سنە و سابلاخ و**

**پڕیش لە شەوبۆی وەریوی ئەوێ:**

**کچێکی ئێمە.. کچە شمشاڵێ**

**بە ڕێگاوە بوو.. بگاتەوەجێ.**

**کچێ لە نەسلی ئەو هەڵاڵانەی**

**لەسەر بەرد ئەڕوێن.**

**کچێ لە توخمی ئاوی شەهید و**

**کیژێ لە تۆوی گوڵە هەتاوو**

**کچێ لە شیعری باخچەکەی سوارە و**

**کیژێ یەکەمجار چاوی لە بێشکەی**

**بەفرا پشکووت و**

**هەر یەکەم ڕۆژیش**

**ئازار بە سواری زستانێ هات و**

**لەو کێوانەدا**

**دایە دەست زریان!**

☼

**ئۆف. ئۆف. ئۆف!.**

**زۆر درەنگ کەوت و**

**هۆنراوەی چاوڕەش**

**هەر نەگەیشت و**

**کۆترە شینکەکە هەر دەرنەکەوت و**

**"مانگ"ەکەی ئێمە**

**نەهاتە گوند و**

**ئۆف. ئۆف!.**

**خەو نەگەیشت و**

**خەو نەهاتە دی**

**ئەم ئێوارەیە**

**من زەردەپەڕم و شیعرم پێی خۆشە**

**وەك "زڕگوێزیلە" و درەختەکانی**

**خۆی ڕابژەنێ و خۆی بوەرێنێ و**

# لەپڕێکدا و

# هەرلەخۆوە ڕووبارێکمان مرد!

پاییزێ لە من، لە شیعری گریاوی من و پەپوولە ڕێزانێ لە
تەماشام و خەونی هەڵپچوڕکاویش لە باخە پەشمووردەکانی شەوانی من!
پاییزێ لەیادگارو ئاوێنەی شکاوی ماڵ و خەزانێ
لە ڕانیەو هەڵوەرینێ لەگوڵەکانی بڵباس و ئاوێزانێ
لە لاواندنەوەی تووی مەلیك و تەنیاییەك لە
دڵدارێ و ئەوقبوونێ لە تەڤگەڕێ و کسپەیەك لە
ڕۆحی تەم داگرتووی هەمووتاندا..
لە گەشەگەشەی جریوەداو لە زریوەزریوی بریسکەدا
لەناکاو ئەستێرەیەکمان کەوتە خوارێ.
لە وەختی بارانە بەهارێکی گوڵ بەدەمی ستران و
لە سەمای سپی کلۆ هیوادا، کانیەکەمان کەوتە ئاویلکەو
وشکی کرد..
لە پەنجەرەی خۆزگەیەکدا و لە ساماڵدا هەر لەخۆوە

هەتاو کۆچیکرد.. بەیانی بوو کەچی لە ئێمە بوو بە
خۆرنشینیێ، ئاوابوو.. ئاوابوو، لە پێکەنیندا ئاوا
بوو مانگێك.. وەی لەو مانگەی لەماڵەکانی هەمووماندا
خەرمانەی بە باوەش ئەهێناو تریفەی بەسەر یەك
بە یەکماندا دابەش ئەکرد!.
تریفەی قسەی خۆش.
مانگەشەوی زەردەخەنە.
گوڵەکێویلەی بۆنخۆش.
هەرمێ گوڵاوی بڵباس.
خۆشەویستی کێوە ڕەش و ئاسۆس.
خەمی هەژارانی ڕانیەو
چەپکێك لە شیعری پاراوو
مێخەك بەندێ لە ئەوینی دڵدارو
ئومێدێکی گەورە بە عەقڵی تەڤگەڕ.
پاییزێ لە من
وەختێ لەپڕ قەسیدەیەکم لێ ونبوو.
لە ناکاوێ بووم بە خۆڵەمێش و
لە ناکاوێ بووم بە سەمەندەر.
ئاخر ڕووبار لە گوڕەی شەپۆلاندا چۆن ئەمرێ؟!.
ئاخر درەخت لە وەرزی گوڵکردندا چۆن بەلادا دێت؟!.
ئاخر باران لە وەختی داکردندا چۆن تینووی ئەبێ؟!
ئاخر لە نەورۆزدا نێرگز چۆن نییە؟!

ئاخر و ئاخر و ئاخر!

پاییزێ لە هەناسەی عاشقان

ئەو وەختەی زمان لاڵ ئەبێ و سیس ئەبێو

ئەوەرێ و ئەو وەختەی دڵنیایی ئەحەپەسێو

بەختیاری نائومێد ئەبێ و پێکەنین ئەگریو

هەتاو تاریك ئەبێو لە بەرەبەیاندا شەو دادێ!.

هاوڕێکان وەك پەنجەکان لەیەك ناچن.

هاوڕێکان وەك وشەکان لەیەك ناچن.

هاوڕێکان وەك گوڵەکان لەیەك ناچن.

هاوڕێم هەیە هەر بۆ سڵاو.

هاوڕێم هەیە کار کردوێتی بە هاوڕێم.

هاوڕێم هەیە بۆ یەك سەعات.

هاوڕێم هەیە بۆ سەفەرێك.

بەڵام تۆ هاوڕێی من بووی وەکوو ژیان.

تۆ هاودەمی من بووی وەکوو قەڵەم.

تۆ لەگەڵما بووی وەك دەستم.

تۆ نزیکبووی لە منەوە هێندەی دڵم لە سنگمەوە.

ئاخر من بۆیە لاسەنگم کوا ئەو دەستەم؟!.

ئاخر من بۆیە بێ دەنگم کوا قەڵەمم؟!

ئاخر من بۆیە چاوکزم کوا هەتاوی دیدەکانم؟!

ئاخر من بۆیە بێ ڕەنگم

کوا ئاوی پێکەنینی تۆ!.

لەو ڕۆژەوە، لەهەر کۆڕێکی یاراندا بم
کورسیەکی چۆڵ تەماشایەکم ئەکاو تێ ئەگەم و
پێکەوە یەکی هەنیسکێ هەڵئەدەین و لەسەر ئەویش فرمێسکێکم
دائەنیشێ.
لەو رۆژەوە، هەموو جارێ، نەخشەکەی کوردستانی پشت سەرم
هەواڵت ئەپرسێ. هەموو دروشمەکانی ڕیفراندۆم چاوت بۆئەگێڕن
هەمووبڕگەیەك لە یاسای مافی مرۆڤ و هەموو جادەو
کۆڵان و پڕۆژەیەکی نیوەناچڵی ڕانیە ئەڵێن کوا؟!
کوا ئەو عاشقەی
ئێمەی لەخۆی خۆشترئەویست!
نەخشەکە وتی: سوێندی گەورەی من بووم.
دروشمەکان وتیان: ئێمە ڕێگەی بووین.
بڕگەکانی یاسا وتیان: ئێمەیش چرای بووین.
پڕۆژە نیوەناچڵەکانی ڕانیەیش هەموو وتیان
خەمی گەورەی ئەوە بوو ئێمە تەواو بین!
پاییزێ لەمن و لەحەیرانێ
وەختی ئێواران و دابڕان لەوەسڵی باران
پاییزێ لەگۆڕی دوای تۆ
وەختێ تەمێك لەودیو یادگارەوە دێتو
ئەنیشێتە سەرچاوان.
تەمێك لەو کەسەرەی نارەوێتەوە.
وێنەیەك لەو پێکەنینەی ئاوسە بەگریان.

خەیاڵێك لەو ئاوێنەیەی بەربۆوەو وردوخاش بوو.
تۆ لەکۆترە شینکەیەکی ئاسۆیی ئەچوویت هەمیشە لە
شەقژندا بوویت. یەك هێلانەت نەبوو. یەك ماڵت
نەبوو. دڵت بەکارێك دانەئەسەکنا. ئەتویست وەکوو
ئاو لەیەك کاتدا چەندین درەختی تینوو ئاوبدەیت.
وەکوو هەتاو لەچەندین پەنجەرەدا بیت. تۆ لەیەك
وەختدا هەم تۆوبوویت و هەم هەتاوو هەم
سەرچاوە. لە تووی مەلیك میوانداری شیعر و مۆسیقات
ئەکردو لە ڕانیە میوانداری دارستانو جوتیاران و لە ماف پەروەران
ئەبوویتەوە بەپارێزەرو لەڕیفراندۆمیش ئەبووی بە
سندوقی دەنگدان و لە ناو بازاڕدا ئەبووی بەخەمی هەژاران و
لەبەردەم بەرپرساندا ئەبووی بەپەنجەی ڕەخنەو، لەبەردەم
منداڵاندا ئەبووی بەبووکە شووشەو، لەگەڵ گەنجاندا ئەبووی
بە دوا گۆرانی و بەستەو، لەگەڵ پیرەمێردو پیرێژنەکاندا،
ئەبووی بەچاویلکەو بەگۆچان، تۆ خۆشەویستیت بۆ
هەمووان بوو. پەنجاو هەشت ساڵ بوویت و کەچی لە ئاست هەندێ
قسەدا وەك بەڵاڵوك سوورسوور ئەبوویتەوەو شەرمێك دایئەگرتی
کە شەرمی ڕەوشتێکی بێگەردو بەرزبوو. ئەو شەرمەی لە
شەرمی یەکەم بەفری تازە باریو ئەچوو وەختێ کزەبایەك
بیدوێنێ. تۆ ناسکتر بووی یان پەڕەی گوڵ؟! تۆ نەرمتر
بووی یاخود ئاو؟! تۆ کراوەتر بووی یاخود ئاسۆ؟!
تۆ بێ فیزتربووی یان گوڵەکێویلەی ئەوشاخانە؟!

لەبەر قسەی نەیاران و ئەوانەی لەبەرپێی خۆیان دوورتر
نابینن و بۆ ئەوەی نەهێڵی گەردێك چەند بچووکە لە
حەمید بڵباس بنیشێ: مافی ڕەوای خزمەکانی خۆت،
ئەرکیان و ماندووبوونیان و ئارەقەی جەستەیانت نەئەخستە
سەر بودجەیەکی حکومەت و لە دڵی خۆیشتا ئەتزانی غەدرەو
بەڵام ئەتوت با ئەم غەدرە لەخۆم بکەم و گوێم لە تانەو
تەشەرێ و لە گیزەگیزی ناحەزێ نەبێ!.
پاییزێ لەڕەنگی سپیی
وەختێ جوانترین پەپوولەو کلووی خۆشەویستی و
چوڕەی شیری وەفاداری لێ ون ئەبێ!
پاییزێ لەستران و لەکلتووری کوردەواری
کاتێ نۆتەیەك و نەغمەیەك و پەندێکی شیرینی خۆی
لێ ون ئەبێ.
خەزانێ لەچاوی ڕانیە
ئەو دەمەی ڕووناکترین سەرنجی خۆی لێ ون ئەبێ.
هەڵوەرینێ لەناو مافی مرۆڤدا
ئەوکاتەی مرۆڤێکی دادپەروەری لێ ون ئەبێ.
کوژانەوەیەك لە ئیمزاکانی ڕیفراندۆمدا
ئەو دەمەی ئازاترین ئیمزای خۆی لێ ون ئەبێ!
کەم نەبوون ئەوئازیزانەی بوون بە تراویلکەو
لەچاوان ون بوون و نەهاتنەوە
بەڵام هەرکەسەو ئازیزی خۆی

فرمێسکم هاوڕێی فرمێسکته
بەڵام هەرگیز فرمێسکەکانی من
لەو فرمێسکانە ناچن کەتۆ بۆخۆشەویستێکی
نزیکی خۆتی ئەڕێژی.
ئەویان پڕیشکەو
بەڵام ئەمیان نێڵەنێڵی سووتانەکە خۆی.
کەم نەبوون ئەو قوربانیانەی پێشکەشی
ئەم خاك و خۆڵەکران
بەڵام هەرکەسەو قوربانیی خۆی
کسپەی گەورەو ڕاستەقینە بۆ قوربانیەك لەشیعری مندا نییە
لەدڵی دایکی قوربانیەکەدایە
لەچاوی ژنەکەیدایەتی
لەسەرسامبوونی منداڵەکەیدا
ئەویان دەست بەدەستدانێکی
جگەر سۆزانەیەو
بەڵام ئەمیان قرچەقرچی
تاسەر ئێسقانی کۆستەکە خۆی.
بەڵام هەموویشمان بەبێ ئەو فرمێسکانەی ترو
بەبێ ئەو ناخانەی ترو باڵی ئەو لاواندنەوانەی تر
لەمانای خەمەکانی خۆمان ناگەین!
فرمێسکەکانی من بۆ بڵباس
لە فرمێسکەکانی دڵدار خانم ناچێ

ئەمیان ئاوەو ئەویان خوێن
شیعری من لەبێدەنگییەکەی تەڤگەڕ قوڵتر نییە
ئەمیان بوارەو
ئەویان گێژەن.
بەڵام ئاخر ئەگەر ئەوئاوەو ئەو شیعرەی منیش نەبن
ڕەوینەوەیەك لەم تەمتوومانەدا چۆن پەیدا ئەبێ؟!
لە یادەوەری زەماندا
کەس ئەومردووانەی لەبیرنەماوە
کە هەر بۆخۆیان ژیان، وەك هەرنەبووبن.
لە یادەوەری دارستانێکدا
هیچ درەختێ ئەو باڵندانەی لەبیرنەما
کە تەنها هەر لەهێلانەکانی خۆیاندا خوێندیان. وەك هەرنەبووبن.
لەیادەوەری شارێکدا
هیچ شەقامێ ئەو ڕێبوارانەی لەبیرنەما
کەتەنها هەر بەسەریاندا ڕۆیشتن.
وەك هەر نەبووبن..
لەبیرەوەری ئەم کوردستانەشدا
هیچ مێژوویەك ئەو مرۆڤانەی لەبیرنەماوە
کەڕۆژێ لەڕۆژان بەردێکیان بۆ نەخستە سەربەردێ
بەڵام بڵباس تۆ هەر بۆخۆت نەژیایت
بۆیە هەر هەیت.
تۆ هەر لەهێلانەکەی خۆتدا نەتخوێندو

بۆ هەموو دارستان بوویت. بۆیە هەر هەیت.

تۆ هەر بەسەر شەقامەکاندا نەڕۆیشتیت و

چرایان بوویت بۆیە ماوی.

بۆ کوردستانیش تۆ نەك هەر بەردت خستە سەربەرد،

دیوارت هەڵچنیو

پەنجەرەت دانا

بۆیە هەر ئەژیت!.

سلێمانی

2005/1/25

# مەحمودی مەلا عیززەت*

# پیاوێ لە درەختی هەتاو!

تۆ بە جەستە، تۆ بە باڵا

هەر ئەوەندەی دارسێوێکی بچکۆلە بووی

بەڵام بە ڕۆحو بە بڕوا

سنەوبەری کەڵەگەتی ئەم مێژووەو

کەژی ورەو

چون بڵێسەکەی "کەرکوك"یش

قەڵەمێکی چاونەترسی

ئەم گەلە بووی!



تۆ نۆ ساڵانو منیش هەشت ساڵان بووم

کە بۆ یەکەمجار ئاوە پاكو چاو قرژاڵیەکەی کارێزی سەرکارێزی

بەردەم ماڵە گەورەکەی ئەزمی بەگی بەهەشتیی، لە سورە هەتاوی

نیوەڕۆیەکی هاویندا، لە گەمەی پڕ لە قاقاو ئاو بەیەکتراکردنو

هەڵپژانەوەی پرژەی فێنكو هەڵپژانەوەی تنۆکە جوانەکانی منداڵیماندا

به یەکتری ناساندین، سەروقژی بژمانو عەزیزیە درێژە
موقەلەمەکانی بەرمان، بە وێنەی پێکەنینمان، تەڕتەڕو،
تەمەنیشمان دوو ئاسکی سرکو بزێوی سەر ئەو ئاوە پیرۆزەو
یان دوو لەتە ئاوێنەی بەرهەتاوی ئەو گەڕەکە دێرینە بوون.
ڕۆژانەیش لە بەردەم دوکانەکەی "مام عەلی"دا
کە لە "وەلی" ناو حیکایەتە میللیەکانمان ئەچوو، لەوێدا، لەگەڵ
منداڵانی گەڕەکدا وەك پوورە هەنگی دەوری شانە بەردەوام
هەر ویزەویزو گیزەگیزمان بوو، مام عەلی نابینایش لە ناوەڕاستی
تەبەقەکانیدا، لە سەر کورسییەکی نزم، قنج و قیت و چەناگە لەسەر
کەمەی گۆچان
وەك ئەوەی بڕوانێتە خاڵێکی دیاریکراوی بەرامبەری بێ جووڵەو
هێمن هێمن دانیشتبوو. ئێمە گلاراوو ئەویش نورانیەکی
دەم بە ویردی بەردەم پەروەردگارو ڕۆژە نادیارەکانو نەهێنیەکانی
خودا بوو. ژیان خەوەو منداڵیش پەپوولەی سپیی ناو
ئەو خەوە. لەگەڵ گەورەبووندا وردە وردە ئەو خەوە کاڵ
ئەبێتەوەو ئیتر گێرمەوکێشەی ژیانو ئەرکەکانو پرسیارەکان ئەو
خەوە سپیە جوانە، شلوێو تارومار ئەکەنو تەمەنیش گەرد ئەیگرێو
ئاوێنەی خۆشی درز ئەباو شکۆفە بەسەر ئەچێ. ئەمە دەورانەو بۆ
ئێمەیش هەروا بوو.
ماڵی ئێوە جێگیرو بە سنگی سەرکارێزەوە نوسابوو. ماڵی ئێمەیش
کۆچەرییەکی شاریو لەم گەڕەکەوە بۆ ئەو گەڕەكو ئاپوورەی
منداڵانیش وەك پۆلە چۆلەکەیەك چۆن گژەبا پەرشو بڵاویان

ئەکاتەوە، وامان لێهاتو لە یەکتر دابڕاین.
تۆ لەو ئاوە زیوینو لەو سەرچاوە پیرۆزەوە هاتیت، لەژێر
بنمیچی خێزانێکدا ڕسکایتو باڵاتکرد کە دەستو دڵیان وەك باران
بەخشندەو چون بەفری تازە باریویش پاك. باوکتو دایکت
کلاو ڕۆژنەی خێرو هەتاوی میهرەبانیو کاکی گەورەیشت هاوارێکی
ئازادیخوازو کاسبکارێکی خۆشەویستی ئەم شارەو عاشقێکی کوردوستانی بوو.
تۆ لێرەوە، لەو چاوگی بیری کوردستانیەوە، لەو کاتەوە
ئیتر بووی بە پەروانەیەکی شەیداو لە دەوری شەوقەکەی گەڕای.
لە سەردەمێکی دواتریشدا، لەو تەمەنەدا، کە خوێنی هەرزەکاری
لە دەمارەکانی جەستەدا قوڵپی ئەداو، لەش کورەیەك بوو
بۆ جۆشو خورۆشو باڵندەی سەریشمان لە ئاسمانی خولیاو
خەیاڵێکی شیندا بەرز بەرز ئەفڕی. جارێکی تر، لە ماڵە یادگارێکی
دێرینی ئەم شارەدا، لە خانوەکەی "جەمیل صائب"ی سەر
دەستەی مونەوەرانی زەمانێکی وریابوونەوەدا، یەکمان گرتەوە.
ئەو ڕۆژگارە ئێمەی قوتابیانو لاوانی کوردستان، ئەو
خانووەمان کردبوو بە بارەگای عەشقی کوردستانی، منو تۆو
هاوتەمەنەکانمان، ئێواران لەژێر دارمێوە پیرۆزەکەی صائبدا
کۆئەبووینەوەو گوێمان لە وتەی بە کاکڵ و شیرینی کەسانی لەخۆمان
گەورەترو خاوەن ئەزموونی ناو بزووتنەوەی
کوردایەتی ئەگرت. گوێمان لە حیلەو گوێمان
لە چریکەی شیعری کڵپەداری "کامەران موکری" ئەگرت.
خۆمان بەرایەڵەکانی ژێی دەنگی زوڵاڵ و

لقی بەرزی سروودەکانی "حەمە ساڵح دیلان"دا
هەڵئەواسی. ئێمە تازە لە سەرەتای پێڕەوکەبووندا
بووین و، بۆ ئەوەی نەکەوین، خۆمان بە شان و مل و
قۆڵ و دەست و پەنجەی شیعرو دەنگ و وانەکانی ئەوان ئەگرتەوە.

☼

گەیشتینە ناوقەدی شەستەکانو لە دووڕیانێکدا لە یەکتری
جیابووینەوە. ئەو دووڕیانەی نەك هەر بە جەستەو شوێن
بە ڕۆحیش لەتی کردینو لە دواییشدا هەموومانی بە ڕاستو
چەپەوە دایە دەست ڕەشەبایەکی شوومو ئیتر لەو ڕۆژەو لەو
دووڕیانە مەترسیدارەوە بووین بە وشەی ناو دڕكو بە
دەواری شڕی بەر باهۆزو بە خۆشەویستیەکی دووکەرتو
بە مێژوویەکی شەلو ئاگامان لە یەکتر نەما!
سەرەتای حەفتاکان بە دەهۆڵو زوڕناوە هاتو ئاشتبوونەوەیەکی
قرچۆك هاتو جارێکی تر لە باخەکانی پێنجوێنو لە سایەی
دارهەنارو دارهەرمێکاندا بە یەکتری گەیشتینەوە. تۆ لە هەر
شوێنێ بووبیت بەرلەوەی سەرت هی کەس بووبێت هەمیشە
هی خۆت بووە. حزبایەتی بەلای تۆوە، کورسی کورسی نەبوو
بۆ دەسەڵات. حزبایەتی بەلای تۆوە، ئەبوو لە شوێنێکدا
بیت لە خواری خوارەوەی لای خەڵکە داماوەکەو پێش خزمەتی
هەمووانو ئامرازێك بۆ ژیان. ئێمە نەوەی هەرەسەکانی
مێژوو بووین. هەرەسی بێ ئامانی حەفتاوچوار هات. لە لوتکەوە
بەربووینەوە ناو دۆڵێکی ترسناك. خەوەکانمان بەر تەڵزمە

تیژەکان کەوتن‌و وەك وردە شووشەیان لێهات. لە خاوەنی
تۆپ‌و تۆپخانەی گەورەوە، دەرزیەکیش نەما بۆئەوەی
تەنها درکێکی ژێر پێی خۆمانی پێدەرهێنین. تاریکستان بوو
تاریکستان.. لە دەورانی ئەم بێژنگەی زەماندا، جارێکی تر
لە مەنفای ناو عێراقدا، لە شاری لەم‌و عاگولدا، لە ڕوومادی
یەکترمان بینیەوە، تۆ ئەو کاتەیش، هەردەم بە زەردەخەنەو، ئاسۆیەك
بوویت ڕووناکیت لێ ئەپڕژاو، ئەتوت "شێرکۆ ئەم شەوە زەنگەیش
بەسەرئەچێ!"

تۆ لە چرا بچکۆلەکان ئەچوویت.
لە قەڵەم پاندانە کورتەکان.
لە کورتە شیعرە جوانەکان.
ئەوەندەی کانییەك بوویت‌و
کەچی دارستانێکت ئاو ئەدا.
تۆ هەمیشە بە بیروباوەڕ لە سپینداری هەڵچووی بەردەم دەریاچەیەکی
هێور ئەچوویت یان لە گڵۆپی سەر پەیژەیەکی کەڵەگەت.
لەو وەرزانەیشدا کە مامۆستا بوویت. تۆ لە گوڵەبەڕۆژەی ڕوو لە
خۆری زانیاری‌و زانست ئەچوویت. تەباشیرێکی هیلاکی نەناسی،
سەر ڕێگای سپی خۆشەویستی بوویت‌و لە ئەستێرکە جوانەکەی مامۆستاییەوە
وەك کۆترێ چۆن بەدەنووك تنۆك تنۆك ئاو بێنێ بۆ زەڕنەقووتە
تینوەکانی ناو هێلانەکەی، تۆیش ئاوا وشە بە وشەت لە چاوگەکانی
هزرو بژوێنی ڕووناکبیریەوە ئەهێناو ئەتکردن بە مۆم‌و لە سەری
نەوەی تازەدا داتئەگیرساندن! تۆ مامۆستایەتیت هەر لەبەر

مامۆستایەتی نەئەویست، بەڵکو ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، لە ڕۆژگارە
هەرە تاریکەکانیشدا سروودەکانی ئازادیو کوردایەتیت ئەدا بە
گوێی خوێندکارەکانتاو لە مێژووی ڕاستەقینەی کوردەوە هۆشو گۆشی
ڕاپەڕینو وریابوونەوەت ئەکرد بە تۆو تیاتا ئەچاندن!
ئەو کاتەی لەژێر هەرەسەوە گوڵە مێلاقەکان تاكو تەرا سەریان
دەرهێنایەوەو ئەسپەکان کەوتنەوە کوڕژنو هەورەکان کەوتنەوە
بارینو چەخماخەدان. لە ڕومادی جارێکیتر یەکترمان بینیەوە و
پێت وتم "سەری ئاسمان بە پووش نەگیراوەو دڵنیام ئەمجارە قەسیدەیەك
ئەنووسیت هەرگیز تینوێتیمان لێی نەشکێ" پێشتریش کە لە تاراوگەکەی
بەغدادییەوە هاتم بۆ لاتان، بۆ ئەو ماڵەی کە تۆو دەستەیەك لەو
چرا نەفیکراوانەی تیا ئەژیان، قەسیدەی "کۆچ"م بۆ خوێندنەوەو
چاوی تۆیش پڕبوو لە ئاو. ساڵانی دواتریش، گەلێ جار لە
کتێبخانە ئاوەدانو لە گوڵدان چووەکەی کاکە "عومەر عەبدولڕەحمان"ی برادا
بۆ ماوەیەك هەر بەسەر پێوە لە ناو یەکتردا ئەدواینو
ئەگەر یەکێکیش بهاتایەتە ژوورەوەو گومانمان لێکردایە ئاڕاستەی
قسەمان ئەگۆڕیو کاك عومەریش بە قسەیەکی خۆش ئەو
بێدەنگییەی لەناو پێکەنینێکی بە کۆمەڵدا ئەشڵەقاندەوە. من بە وردی
ئاگام لەوە نەبوو لەو سەردەمی ئاخۆران و بخۆرانەی عوروبەدا تۆ بە نەهێنی
چیت ئەکرد؟ بەڵام هەستو نەستی خۆم پێی ئەوتم: وەك چۆن
ناشێ شەپۆلەکانی ڕووبار بوەستنو (با) بخەوێو باڵندەکان
لە شەقژن بکەون، تۆیش هەروا!
لە پڕێکدا شەوەزەنگی بەعسی گرتیتیو برديتیو لێمان ون بوويت.

گرتنو زیندانەکانی ئەو شەوەزەنگە گێڕانەوەیان هەر بە دەم خۆشە.
خۆت لە "کاروانی بێکۆتایی"دا سەرقافڵەیەکی ئازاری بوویت.
کەوتیتە ناو ئاپوورەی نێزەوە، ناو ژووری مەرگەوە، ناو
نێرینەی ئەشکەنجەوە. بەڵام جەستە پچووکەکەت لە بەردەمی ئەواندا
بوو بە گۆیژەو لەو سەرەوە بە هەمان زەردەخەنەی گوڵهێرۆیەکی
سەر لق ئاڵەوە هاتیتە دەرەوەو وەك کەڵێك چۆن سەرئەکەوێتە
سەر بەرزترین ڕەوەزو لەویەوە ئەڕوانێتە دنیا تۆیش وەها بوویت.
خوێندنەوەیەکی تازە بۆ مێژوو، بوو بە خولیای هەرە گەورەت. بەرلەوەی
بە چڕوپڕی
بنووسی، هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە خۆت بۆ ئەم هەڵکەندنە سەختە
ئامادە کردبوو.
هەڵکەندن لە زەوییەکی بەیاردا. ئەو سەردەمەی لە سایەی چیاکانی پێنجوێندا
ئەژیایت تێکەڵاو بوونو دۆستایەتیت لەگەڵ بەهەشتیی حەمە ڕەشید خانو
ئەو بنەماڵە دێرینو مێژووییەدا پەیداکردبوو. ئەوانیش بەخشندانە
دەرگای گەنجینەی
بەڵگەنامە نەختینەکانی سەردەمی جەمهوریەتی کوردستانیان بۆ
خستیتە سەرپشتو
ئیتر بە وێنەی کارێزکەنێ لە هەڵکەندنو ڕۆچوونی بەرەو قوڵایی دیرۆکدا،
شێلگیرانە کەوتیتە کارکردن، ڕستەکانت وەك لاولاو لە "مەهاباده"وە
ئاڵان، کەوتیتە
شوێن پێیەکانی پێشەوا. لەناو بەفری ڕێبەنداندا بووی بە هەڵەکۆكو

له خەزانیشدا لەگەڵ ئازیزانی ڕۆژهەڵاتدا بووی بە باویلکەو لە پێشدا
نووسینەکانت
لە شێوەی گۆمیلکەی بچووك بچووکدا بوونو لە دواییدا بوون بە زێی
شین باوی بەر خۆرەتاو. وەك ئاکامیش شارایەکی ترت لە زادەی
تاووتوێکردنو لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەو دیالۆگی تازە خستەسەر
خەرمانە گەورەکەی مێژووی نەتەوەکەتو خەڵکیش وتیان: مەحمود بەرەکەت!
لە دەورانی بە ژەنگو ژاری غەریبیو کۆچکردنی بە کۆمەڵیشدا، ئەو
دەمەی هەناسەوەرگرتنیش لەژێر کۆنترۆڵی بەعسدا بوو. تەندروستیشت،
باشاری ئاستەنگیو دژوارەکانی ناو شاخو داخ نەئەهات. بە خاوو
خێزانەوە ڕووتانکردە هەندەرانو لە تاراوگەی سویددا گیرسانەوە. دوای
ئێوەیش بە چەند ساڵێ چارەنووس منیشی بردە هەمان وڵاتو لەوێ
وەك دوو باڵندەی کۆچەری کوردستان یەکمان گرتەوە. غوربەتو
عەشقی مێژوویەکی تازەو شیعری تازەو موقاوەمەتی شۆڕشێکی تازە
پەیوەندی نێوانمانی وەك پەیوەندی نێوان دوو ڕەگو بنجو بێخی دێرینەی
ڕۆچوو لە قوڵاییدا سەریەکانگیر لێکرد. ئەمجارەیان بە خاوو خێزانیشەوە
تێکەڵی یەك بووینو هەرکاتێ ڕێمان بکەوتایەتە شاری "ئۆپسالا"ی
زانستو جوانیی، چ خۆتو چ خاتوو گەلاوێژی هاوسەرو هاوڕێی
ژیانتو چ منداڵە ئازیزەکان، دەرگای خۆشەویستیو دەستو دڵ
ڕەنگینی میوانداریتان بۆ ئەخستینە سەرپشتو بە بینینی یەکتر هەموو جار
وەك سەوزاییو بارانی بەردەوامی ئەو وڵاتە پاراو ئەبووینەوە! تۆ
بە ڕووخۆشیو ڕەوشتی سپیو
پەیوەندی بێ گرێو گۆڵت، توانیت نەك هەر لە دڵی ئاوارە

کوردەکاندا بەڵکو لەناو سویدیەکانیشدا، وەك چەپکەگوڵ
خۆشەویست بیت. بۆ دواجاریش کە ماڵئاواییت لە سوید کردو بە ڕاکشاوی
گەڕایتەوە شارەکەت. سویدیەکان بە ژنو پیاوەوە گەیشتنە سەر
تابووتەکەتو بە سەدان چەپکەگوڵی ڕەنگاوڕەنگ ماچ بارانی
خۆشەویستی تۆیانکرد!

ئەو ڕۆژە، لە گوێ سیروان بووم
لە دوورەوەو لە نێرینەی ئاوەکەدا
ناوبەناوێ، شەپۆلێکم بەدی ئەکرد خۆی بچووك‌و
بەڵام بە هەنگاوی گەورەوە کەوتبووە پێش. وتم
ئەو شەپۆلە گورجەو ئەو سروودی مێژووی ئاوە
مەحمودی مەلا عیززەتە!
لە خەوما بوو. پێشەوام دی، لە کەژاوەی هەڵاڵەدا
بەرگێکی سپیی لە بەرداو هەردوو دەستی پڕ سەمەلی گوڵە
گەنم‌و لەولایشەوە دەست بە چرا کاك مەحمودی مەلا
عیززەت ڕاوەستابوو!
کۆمەڵێ قەڵەمی شین‌و
کۆمەڵێ گوڵەهێرۆی سپی‌و
کۆمەڵێ کتێب‌و لە پێشیانەوە کاروانی بێکۆتایی.
پۆلێ کۆترو، پۆلێ شیعرو
قولێنەیەکی پڕ لە پەپوولەو
باوەشێ گوڵە تولێپانی سویدی‌و

هەر هەموویان، لە بەرزاییەکەی "کەڵەوانان"
لە پێشوازی ئەو پیاوە جوانەدا بوون
کە لە سەهۆڵبەندانی قوتبی ژوورووەوە
بە ڕاکشاوی، چون قەسیدەیەکی نوستوو
ئەهاتەوە بۆ لامان
هەر ئێمەی کورد یادت ناکەین‌و هەر ئێمەیش تۆمان خۆش
ناوێ‌و هەر ئێمەیش بە تەنیا لە دوا سەفەرتا بەر پەنجەرەی چاو
بە فرمێسکمان نەگرت. ئەوەتا ڕووبارە قژزەردەکەی
ئۆپسالا و، دەشتی گەنمەشامی ئەوێ‌و زەنگی کلێسە
غەمگینەکەی‌و ڕەفەی ئارشیف‌و بەفری بەر دەرگای ماڵەکەتان‌و
درەختی کالیبتۆسی هەڵلەرزیو لە سەرمای
ئێوارانی ئەو شارەداو، نەورەسە سپیەکانی سەرسنگی ئاوو،
سپۆری هەڵم بە سەری وێستگەی شەمەندەفەرو، ماڵی کلتوور، فەرهەنگی
کوردی سویدی‌و شریتەکانی دەنگی دیلان لەوێ، هەر هەموویان.
بیرت ئەکەن‌و لای هەر یەکێکیشیان خۆشەویستیەکت
بەجێهێشتووە کە شەوانە وەك ئەستێرەیەکی سوری سەر بەرزترین
بورجی سڤاریا ئەدرەوشێتەوە.
قەڵەمێك لە وەنەوشە، پەڕە کاغەزێ لە هەوری باڕشت‌و زامێك لە چرا و
ڕۆح سوکییەك لە ئاوی کارێزەکەی سەرکارێزو
بێگەردییەك لە شێوەی کلووە بەفرێکدا
بەر لەوەی بکەوێتە سەر ئەرز.
وەفایەك بۆ مەهابادی سۆمای هەموومان.

له بینایی پێشەواداو،
پیاوێك له ئەستێرە لە کاروانی بێکۆتاییداو
سروودێکی تەنیاییو غەریبیشمان لە سویدا.

ئازیزان!
بەڵام ئەمە چ قەدەرێکی چەمووشو کوێرە شێرکۆی هێشتۆتەوە
بۆئەوەی هەموو جارێ ببمە قەقنەسی لاواندنەوەی ئازیزێکم!
چ قەدەرێکی بە گینگڵو بە ژانو سوێیە بۆ قەڵەمە چاوتەڕو
بە هەنیسکەکەم بۆ ئەوەی هەموو جارێ بە دیار مەرگی ئازیزانەوە
هەڵگیرسێو هەڵقرچێو هەڵوەرێو بەڵام بشمێنێو لە خۆڵەمێشی
خۆیەوە سەردەربێنێ و دیسانەوە لە سووتانی خۆیدا باڵ بگرێتەوەو
لە کڵووکۆوە ببێتەوە بە باڵندەیەکی ناو ئەفسانەی ئەم ژیانە.
من ئێستا لەو گوڵە شەست پەڕە غەمگینو مل بە لارەوە گرتووە
ئەچم، خۆم لە ناوەنداو، بە چوار دەوریشما پەڕەکان، هاوڕێکانم،
بەڵام پەنجەی مەرگ هەرجارەو پەڕێکیان هەڵئەکێشێو ئەیدا بە دەم
بای عەدەمەوە، کەل بووم کەل، بۆشاییەکی لەبەرچاو کەوتۆتە
نێوان پەڕەکانمەوە، پەڕی هەڵکێشراوی ئەمجارەیش کاکە مەحمودی
مەلا عیززەت بوو! پیاوێ لە درەختی هەتاوو، پیاوێ
لە دارپرتەقاڵی مانگەشەوو، مرۆڤێ لە تاڤگەی شاخەکان!



ئەوە سەرمە، یان خۆرنشین؟ لەسەر تەمێ
بە زەردەی خەمێ ئەنووسێ:

ئەم ئێوارەیە شیعرێکت کۆچ ئەکاتو جێماندێڵێ
کە ئاڵترە لە فرمێسکی ئەرخەوانو هێواشترە لە شەماڵو
سپیترە لە گوڵی جوانی دارهەرمێ.
بە ڕۆحیش هەر: لە ئاوەکەی سەرکارێزو
لە خەندەکەی "گۆیژە" ئەچێ!

سلێمانی
2005/5/28

## پەراوێز:

* ئەمە دەقی ئەو وتارە ئەدەبییەیە کە شاعیر لەڕۆژی 15/6/2005داو لەچلەی نووسەرو مێژوونووس مەحمودی مەلا عیززەت دا لەهۆڵی (سلێمانی)ی سەنتەری گەنجان خوێندییەوە.

# دوا سەفەری فەرەج ئەحمەد و پەنجەرەیەك بۆ بیرەوەری

له خوێنێکی گەرمدا هەرزەکاری قوڵپی ئەداو هەموو دنیامان له چاوی ئەو ساتەوەختەوە ئەبینی که تیایدا ئەژیاین. گەنجی و هەزار جوانیی. ماندوویی نەناسی پێناسەی ئەو تەمەنه بوو. به دەسته ڕاستدا سوچی سەرەوەی چایخانه پانوپۆڕەکەی به هەشتیی حەمەڕەق و لەو گۆشەیەدا چەند قەنەفەیەکی تەختەی درێژکۆلەو هەندێ کورسی تاکی بێپاڵپشت و لەولامانەوە حەوز و فوارەیەك و بەسەر دەمی فوارەوە تۆپێکی باغه خولی ئەخوارد و تەقەتەقی دۆمینه و تاوڵەو جووڵەی بەردەوامی ڕەووفی چایچیو پەشتەماڵێکی مۆری بەرکۆش و دەست و پەنجەی ڕەنگی چاگرتوویی و شەش حەوت پیاڵەی پڕ له چا لەسەر یەك بەری دەست و لەگەڵ دانانی هەر چایەکیشدا زرنگانەوەیەکی تیژی پیاڵەو ژێرپیاڵەو.. ئێمەیش کۆمەڵێ قوتابی تازە سەر له هێلکه جوقاوی ناو کۆمەڵ و هەموومان قژ بژ و جل شڕۆڵ و یەخەی کراس چڵکن و پێڵاو بۆیاخ نەکراوو ڕۆژنامەی (ژین)ی لوولکراو له گیرفاندا و لاتوپووت لەو سووچەدا یەکمان ئەگرتەوە. زەمان ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی ڕابووردوو.

سلەیمانییەکی بچووك و ئێسك سووك. دوو سێ جادە و ناوبەناوێ تێپەڕینی هەندێ قەمەرە و پاسی تەختەو یان جیکەجیکی پێچکەی عەرەبانەی دوو ئەسپی و لەپڕێکدا پرمەی وڵاخە ماندووەکان و جنێوە عەنتیکەو سەیرەکانی سالە شێت و خۆشاردنەوە لە ترسی خڕکە بەردەکانی و ڕادیۆی چاوەزار پێوەکراوی سەر ڕەفەو.. سینیەکەی بەردەمی کاکە حەمە و.. جگەرەکەی لالێوی حسەینە فەندی و سووتووی درێژی و بەو بەریشەوە بەهەشتیی حەمەی حاجی فەرەجە فەندی و لەسەر کورسیەکی قەراغی جادەو، چەند پۆلیسێکی هاتوچۆو دوو سێ قۆمیسەر و لە دووریش سەدای گۆرانییەکی ڕەشۆل.

زمانێك لە هێمنی و پڕ لە بۆنی وەفا.

زەمانێك لە خۆشەویستی سادەو بێ فڕوفێڵ.

من بۆ یەکەمجار لەو سووچەدا کاك "فەرەج ئەحمەد"م بینی و ناسی ئەو پێنج شەش ساڵێ لەمن گەورەتر بوو. قژ ڕەشێکی زیت و قسە بە تەنزو نیوەی ئاخاوتنی گاڵتە ئامێز و نیوەکەی تری جیدی و منیش لە نێوان ئەو دوو شێوەیەدا سەرم لێتێکئەچوو نەمئەزانی کامەیان ڕاستەوکامەیان گاڵتە! هەر لە یەکەم چاو پێکەوتندا بوو پێی وتم: باشە تۆیش هاتی بەخێربێی! بەڵام هەر ئەمجارە پارەی چایەکت بۆ ئەدەین! ئەوڕەحمان! پارەی چایەکەی بۆ بدەو دیارە جگەرەش ئەکێشێ و جگەرەیەکی "غازی"یشی تەقدیمکە!.. مەبەستی لە خواڵێ خۆشبوو کاکەوئەوڕەحمانی حەکیم بوو!.. وتیەوە: وابزانم شێرکۆ دەست خەتیشی خۆشە با پەیڕەو و پڕگرامەکەی قوتابیانت لەگەڵدا بنووسێتەوە!. ئەمیش هەر لە خۆمانە!.. ئەوڕەحمان بێدەنگ بوو. کاك فەرەج ئەم بێدەنگبوونەی ئەوی بە دڵ نەبوو.. ئەمجارەیان بە دەنگێکی بەرزتر وتیەوە:

چیە مردووت مرێ قسە ناکەیت ئێ ئاخر حەکیمی باوکت وەزعی باشەو ئەمە کوڕی فایەق بێکەسەو چایەك و جگەرەیەکی غازی چییە.. ئەوڕەحمان هاتە قسەو وتی: باشە کاك فەرەج باشە خۆ من هیچم نەوتووە نەك چایەك دە چا.. ئەمجارەیان کاك فەرەج پێچی قسەکەی گۆڕی و ڕوویکردە کاك حسەین عارف و پێی وت: داخڵی تەمسیلەکەی کاوەی ئاسنگەری بکەن بابێ بە کوڕی کاوە و ئینجا ڕووی تێکردمەوە لێی پرسیم: تۆ چەقڵاوەت دیوە؟!

وتم: نەخێر وتیەوە: دە گوێبگرە! دوای هەفتەیەکی تر یادی جەژی نەورۆزە. حکومەت ڕێگە ناداو ناهێڵێ خەڵك بە ئاشکرا یادی ئەم جەژنە بکەنەوە.. ئێمەیش بۆ خۆمان بڕیارمانداوە بە دزییەوە لە خوار باخی فەرەج کۆببینەوەو ئەچین بۆ چەقڵاوە ئەوبەری تانجەرۆ بەڵام نان و هێلکەی خۆت لەگەڵ خۆتا بێنەو ئەگەر دایکت تۆزێ خورما و ڕۆنیشت بۆ بکات ئەوە باشتر!..

هەموو بەسەر یەکەوە پرۆگرامی قوتابیان و جەژنی نەورۆز و چەقڵاوەو کاوەی ئاسنگەر و منیش هەر لێی وردئەبوومەوەو شەرمنۆکانە دانیشتبووم.

من بۆ یەکەمجار هەر لەو گۆشەیەدا وشەگەلێکم بەرگوێ کەوت لە نموونەی: ئیمپریالیەت و ئیشتراکیەت و نەقد و نەقدی زاتی و دیموکراسی و ئینتیهازی و تەحقیقات جنائی و سەرم سووڕی ئەخوارد! بەڵام وریایان کردمەوە بۆ ئەوەی بەشوێن ماناکانیاندا بگەڕێم و لە دڵی خۆمدا ئەموت ئەبێ زیاتر فێربم بۆ ئەوەی بتوانم بدوێم.. بۆ ئەوەی بێدەنگ نەبم

زەمانێك لە جوانیی گیان و هەستی سپیی
زەمانێك لە هەژاری و دڵسۆزیی تێکەڵ بە
خەونێکی خۆش

باشم لەبیرە، هەر لەو سەردەمەدا بوو، دەنگێ بڵاوبۆوەو شار خامۆش بوو، هەواڵێ گەیشت و شەقام و ماڵ و درەختەکان پێکەوە گریان: ئەم ئێوارەیە تەرمی شێخ مەحمودی حەفید، مەلیکی کوردستان ئەگاتەوە سلەیمانی. من ئەو دەمە قوتابی ناوەندی پیشەسازی بووم. هەمان ئەو بینایەی ئێستای بەڵام ئەوە ئیتر دوا خانووی ڕۆژئاوای شاربوو. نوختەی پشکنین و بازگەی سلەیمانی ـ کەرکوك ڕێك بەرامبەر ئێمە بوو. شار لەو ئاقارەوە تا ئەوێ چووبوو. لە دەمەو عەسرەوە خەڵکێکی زۆر لەوێدا کۆبوونەوە. بیرمە کاك فەرەج ئەحمەد بەناو خەڵکەکەدا ئەگەڕاو هانی ئەدان ڕاپەڕن و بێدەنگ نەبن. دیارە من دواتر زانیم کە ئەو جموجووڵە حزبی شیوعی لە پشتەوە بووە. درەنگانێ تەرمی شێخ گەیشتەوە، ئاپوورەیەك لە خرۆشان و هاوارو ڕاپەڕین لە مەوجدانەوەی هەزاران هاووڵاتیدا لەو ئاستەوە دەستییپێکرد. ئەو کەسانەی لەو ئێوارە غەمگینەدا و هەر لە قەراغ شارەوە بەرەو بەردەرکی سەراو دواتر بەرەو بەندیخانەی سەرەوە بۆلای شێخ لەتیفی بەندکراو هەڵکشان و بووبوونە مەکۆی ناو جەماوەرە داخ لە دڵەکەو دیواری بێدەنگییان ڕووخاندو هاواریان ئەکرد، ئەوەی لە یادەوەری مندا مابێت، دەستەیەك لە قوتابیانی پیشەسازی و خوالێخۆشبوو و کاك جەلالی میرزا کەریمی شاعیر و کاك ئەوڕەحمان حەکیم و کاك ئەنوەر و عوسمان و من و ئەوەی هەرگیز لە بیریشم ناچێتەوە دیمەنی ئەو لاوە کەڵەگەتە چوارشانەو بە خۆیە بوو کە لە پێشی پێشەوە چووبووە ژێر تابووتەکەی شێخەوەو هاواری ئەکرد و بەرەو ناو سەراو دواتر بەرەو بەندیخانەی سەرەوە بێپسانەوە هەنگاوی ئەنا کە ئەویش خوالێخۆشبوو کاك ڕەووفی عەلی فایزی عەرەبانچی بوو!

**سەرەتا ئەوان ئاگریان لەو شەوە بەرداو**

**ناکرێ گومناو بن و ئازایەتی و هەڵمەتیان لەیاد کرێ!.**

جوگرافیای شارێك هەر شارێك بەبێ مێژووی مرۆڤەکانی و ئەو کەسانەی جوڵانەوەی ژیانی پێ ئەبەخشن. هیچ ناگەێنێ! بە تایبەتی ئەو مرۆڤانەی ئەبنە جەستەو ڕۆحی شەقام و بازاڕ. ئەبنە دەمارەکانی ناو دیرۆك‌و کولتووری، ئەبنە خوێنبەری بەردەوامبوونی زیندەگی و پاشەڕۆژی. ئالێرەوە بەهای شوێن لە بەهای خەڵکەکەی جوێنابنەوە و یەك یەکتری تەواو ئەکەن. ئاخر ئەبێ سلەیمانی بۆ خۆی بەبێ پیاوە جوامێرو ژنە سەلارەکانی چ مانایەکی هەبێت! سلەیمانی ئەوەندەی مێژووە سیاسیەکەی لەبەرچاو ئەگیرێ هێندە بایەخ بە مێژووی کۆمەڵایەتی و کولتووری ڕابوردووی نادرێ. باسکردنی سلەیمانی بەبێ ئەحەی کوڕنوو ئەحەی ناسرو مەلاکەریم و کەسایەتییە کۆمەڵایەتییەکانی، باسێکی کورت و کوێر ئەبێ!. ئێمە بە هەمووومان نەخشەو سیمای ڕاستەقینەی ئەم شارە ئەکێشین. هەر سەردەمەو مرۆڤی خۆی لە پەنجاکانی سەدەی ڕابووردودا وێنەیەکی ناتەواوی ئەم شارە نیشانئەدەین. وێنەیەکی لێڵ و شێواو و نیوە ناچڵی بۆ نموونە شەقامی مەولەوی ئەگەر ئاماژە بە کەسایەتیە کۆمەڵایەتییەکانی بە دووکاندارو جێنشینەکانی، بە خۆشەویستیەکانی ئەو ڕۆژگارەی نەکەین، من ناتوانم ئەو شەقامە بێنمەوە بەرچاوی خۆم بەبێ ڕەووف مارف و وەستا مەجیدی دەلاك و حسێن و کەریم ئاغاو حسە ڕەشی خەیات و حاجی ساڵحی چایچی و بەهجەتی سەعاتچی و حسەینە فەنی کۆگا و برایمی سنجەرو عەبدوڵڵا زوهدی و کەسپەڕ و هتد...
من ناتوانم یانەی فەرمانبەرانی ئەو سەردەمە بۆ نموونە لە ڕەشۆل و جەمیلی

سەعی بەگ و ئەنوەر ئەدهەم و ئەحمەدی حاجی ساڵحی قاسم و حەسەنی سەید ئەحمەد و زۆر ناوی تر دابڕم!

کاك فەرەج ئەحمەد کوڕی چوارباخ و ئەو شەقامانەو کوڕی گوێژەو کوڕی گەڕەکە هەژارەکان بوو. خۆی شاعیر و نووسەر نەبوو بەڵام بۆ شیعرو نووسین جێی مەرەکەبی ئەگرتەوە! خۆی هەژارو نەداربوو بەڵام خاوەن سامانێکی مەعنەوی گەورە بوو.

خۆی تەنیا ژیا و هەر لە تەنیاییشدا مرد! بەڵام بۆ ئێمە و بۆ شارەکەی بۆ خەڵکی، کەس لە ناوەوە لەو بە ئاپوورەترو کەسیش لە نەفس بەرزیدا لەو دەوڵەمەندتر نەبوو!

کاك فەرەج ئەحمەد ئازارێکی بە گینگڵ بوو، بەڵام ئەم ئازارە هەمیشە دەم بە زەردەخەنەبوو. برینێك بوو گوڵی تیا ئەڕواو هەموو بەها جوانەکانی ئەم شارەیش کەسی ئەوبوو. گیرفانی بەتاڵ و بەڵام دڵی پڕ لە شەفەق بوو. ئەو بە تەنزو گاڵتە خەفەتی ڕاوئەناو بەقسەی خۆش چواردەوری گوڵاوپڕژێن ئەکرد و قەتیش نائومێدی و کەساسی چاوی پێدا نەئەخست.

وەك بەفری نوا باریو سپی سپی و هەروایش مردا. پەپوو لە دڵیا و هۆما لەسەریاو کلۆ تەباشیرێکی سەربەرز بوو. کێ ڕۆژێ لە ڕۆژان فەرەج ئەحمەدی بینی بکرووزێتەوە کێ ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوی بینی فرمێسکێ بڕێژێ ئەمە لە کاتێکدا لە ناخدا هەڵئەقرچاو لەودیو کالانەی چاویشەوە هەر خۆی دڵۆپە فرمێسك بوو!

بێکەسیش وتەنی: ئەگەر لە هەردووکی سەرو ڕوبعی هەبوایە، نە شاو نە سوڵتانی بە سەپانی خۆی نەئەزانی! کاك فەرەج ئەحمەدی ڕووناکبیر و

تێکۆشەرو مامۆستا زێوانێکی کتێبخانەیش بوو لە خوێندنەوەو سۆراخکردنی ئەدەب و هونەریشدا مۆمێکی هەمیشە داگیرساوبوو.

لە کۆتر بێوەیتر و بەڵام لەسەر هەق لە ئاگر گەرمتر بوو. کاك فەرەج ئەحمەد بۆ ئێمە لە سێبەری دارتوویەکی باخی گشتی و لە پێکەنینی ئێوارەیەکی خۆشی شەقامی سالم و لە گوڵدانی سەر مێزێکی مەستی یانەی فەرمانبەران و لە سروەیەکی ئەزمڕو لە ڕۆژنامەیەکی ڕاستگۆو لە سێدەری ماڵێکی کۆنی سلەیمانی ئەچوو!

## کاک فەرەج!

خۆشەویستیێ بە ئەندازەی خۆشەویستی
چرایەکی گەشی شار، بە شەو، لەسەر گۆیژەوە دیار!
خۆشەویستیێ ئەوەندەی خۆشەویستیی
چڵە نێرگزێ بەگردی یارەوە
ئەوەندەی دارسنەوبەرێکی
بیرەوەری سەوزی باخی بەختیار.
بێگەردێك ئەوەندەی بێگەردیی
سپێنەی چاوی منداڵێ..
ڕوونیش ئەوەندەی دڵۆپە شەونمێ
لەسەر گەڵای دار.
لە بیرمانی.. وەختێ قسەی خۆش و دڵپاکیی

دێنە ماڵەکانمانەوەو وەختێ بەفر ئەبێتە

میوانی درەختی سەرجادەو

لە یادمانی ئەو وەختەی ڕێبکەوێ وەك تۆ تەنیا

لە ماڵێکی چۆڵ و هۆڵدا خەیاڵ ڕامانژەنێ و

گوێبگرین لە شنەبای خەون و یادگار!

نە ژن و نە ماڵ و نە منداڵ و نە پارەوپوول و

نە ئوتومبیل و نە قاتێکی تازە و بەڵام سامانێ

لەو خۆشەویستییەی کە خەڵکی سادەو ساکار

ئەیبەخشن بەکەسێ وەك تۆ

پڕبێ لە باران و لە ڕەنگی هەتاوو

پڕ بێ لە باق و بریقی نێرگزەجاڕ

لێوان لێوبێ لە ڕەوشتی سپیی و

قسەی دەم بەگوڵی ورشەو پرشەدار

کاك فەرەج ئەحمەد!

پیاوێ لە هەرە دەوڵەمەندەکانی

خاوەن تەلاری سەروەری نەفس و

باڵەخانەی سەربەرزی و

خاوەن هەموو باخچەو شەقامە گشتییەکان و

جوانییەکانی شار!

2004/7/11

وتەی ئەدەبی

# لێگەڕێن.. ئازیزان.. لێگەڕێن
# با ئەو گۆرانیە مەست و
# غەمگینە هەر بنوێ!

ساوایەك، هەر لەسەر كاسەوە، وێلاشەكەی كوێرەوەری بوو.
شاعیرێ، هەر لە منداڵییەوە، تەمومژی چارەنووسێ
لە شێوەی تراویلكەیەكی هەمیشە تینوودا دایپۆشی و، تراویلكە
درێژبۆوەو درێژبۆوە تا ئەو ساتە وەختەی، لە نیوەڕۆی
بەهارێكی دڵ گوشراودا "سەیوان" دەستە ئەرخەوانیەكانی
درێژ كردوو لێی وەرگرتین و بە ئەسپایی خستیە ناو هەناوی
خۆڵەمێشینی خۆیەوە!
قەسیدەیەك هەر لەناونیشانەوە تا دوا وشەی
لەشێوەی سولێكدا خۆرنشینی لێئەچۆڕایەوە، خەرەندیش،
قوڵایی و تارمایی و نسرمی خەمەكانی شاعیر و بە تەنها
پاییز هەر چوار وەرزەكەی بەختی ئەوبوو!

کلاورۆژنەیەك بەڵام بێ خۆر!
درەختێك بەڵام چاو بە ئەسرین
ئاوێکی تەنگە نەفەس و
گۆرانییەکی دوکەڵاوی و
هۆدە و هەیوانێکی هەمیشە بریندارو
چەند شیعرێك لە نەوەی خەزان و
چرایەکی قەرزار و
پەرداخێکی تینوو بەدیار
گڵۆڵە ژانێکەوە!
لە دەشتی تەمتوومانی، ئەم پیاوەدا، ئەو وەختەی
هەڵاڵە شیعرێ ڕسکایە گژە بایەك ئامبازی ئەبوو.
ئەو وەختەی خۆزگەیەك بیویستایە پێ بگرێ
شەپڵەی قەدەرێ لێیئەداو گرمۆڵەی ئەکرد.
لە ڕۆژگارە ئاساییەکانی خەڵکیدا. ڕۆژگاری ئەم
نا ئاسایی بوو. گەواڵەی بێزاریی ئەمی ئەپێچایەوەو،
بەڵام ساماڵیش دراوسێی. خۆی ژوورێکی برسی و
پەخشانێکی لانەوازو بەڵام تەلارێ لە چاو چنۆکی و
هەڵپەی تەماعی ئەم شارە دراوسێی.
شەیدا تەنیا بوو وەك هێشووی سەرپەڕی
ڕەزێکی سەرخۆش. وەك تاقەدارێکی غەمگینی
سەر گردێ. تەنیا بوو تەنیا وەك هەژاری و
بەوێنەی باڵندەیەکی جووت کوژراوو چون مۆمێکی

بێ مۆمدان و یان پەڕێکی دەم "با".
نەرم و هێواش وەك گوڵە پەمووی ڕاکشاو
لە باوەش شنەبای ئێوارەیەکدا. بێوەی
وەك کۆترێکی مل بەلارەوە گرتووی ژێر پەڕوباڵ
لە هێلانەیەکی نیوە داڕوخاودا!
خۆشەویستیی شیعر بووبوو بە ڕەنگی قژە ڕەشەکەی
لەگەڵ هەڵکشانی تەمتوومانی تەمەندا. بە جووتە
خەم و بێدەرەتانیش لەگەڵیا هەڵئەکشان
نازانم ئەم پەیژە بوو بۆ ئەوان
یان ئەوان پەیژەبوون بۆ ئەم.
شەیدا بادەو شیعری لەجەستەی خۆی خۆشتر ئەویست.
لەچوارینەکانی خەیامەوە دەستی شەرابی گرت و
کردی بە هاوڕێی خۆی.
لە گەشتەکانی "گۆران"ەوە مەستی سروشتی
وڵاتێکی بەدبەخت بوو، وەك خۆی
لە شیعرەکانی "بێکەس"ەوە فێری ئەوەبوو
مەی لە تریفەی "ئەی مانگ"دا
بخواتەوەو لە دووایيشدا هەردووکیان دەربەدەر.
بولبولێکی نەدارا هەر ئەوەندەی پێئەکرا
نەهێڵێ گۆرانیەکانی عەشق وەك ڕازی تەنیایی
هەردی لە بیر چڵ و پۆپەکان بچنەوە.
پەپوولەیەکی ڕەشی باڵ کەنەفت

هەر ئەوەندەی پێئەکرا ناوبەناو دوو سێ خونچەی
شیعر لەسەر گەڵاکانی خەزان بنووسێ.
هەر ئەوەندەی پێئەکرا لەبری هەژاری خۆی،
لە سینەی زامدارەوە دوو سێ ئاخی وشە هەڵکێشێ.
شەیدا ئاوێنەیەکی درز بردووی
سەر دیوارێکی قوڕین بوو
هەموو ڕۆژێ دەم و چاوی خەمێکی ئەبوون
بە دوو بە سێ بەرە!
دەرگایەك بەگرێ ژەنەی نامورادەوە.
پەنجەرەیەك بە شووشەی شکاوی چاوەوە
بەڕەیەك لە تەنکیی نەبوونی
دووکەڵێ لە جگەرەی مەینەتی و
کۆمەڵێ شیعر لە جیاتی کۆمەڵێ خۆشی و
خۆڵەمێش لەبری گوڵ و
ڕاهاتن لەگەڵ دڵۆپەداو
ڕاهاتن لەگەڵ گیرفانێکی بەتاڵداو
ڕاهاتن لەگەڵ جەخاردا
هەتا مردن!.
ئەو لەم باخچانەی شیعردا گوڵەمێخەکێکی شەرمنۆك بوو
بەڵام بزر نەبووبوو. هەورێ بوو کەم بار بەڵام
لەبەر چاو نەکەوتبوو. زنەیەك بوو کەمدوو
بەڵام لەبیر نەچووبۆوە

خەتا خەتای بەهرە نەبوو

خەتا خەتای خەیاڵ نەبوو

خەتای مێردەزمەیەك بوو هەرجارەو بەدەمامكێكەوە

پەیدا ئەبوو جارێك پێیان ئەوت برسێتی و جارێكی دی

كرێچێتی و جارێكی تر نەخۆشی و دەردەداری!

هەموو جارێ كە ئەمبینی لەچاوەكانیدا نامۆییەكم

بەدیئەكرد كەم وێنە، وەك ئەوەی درەختێ بەڕەگی

خۆی نامۆبێ، شار بە شەقامی خۆی و ژوور بە پەنجەرەی

خۆی و ئاو بەسەرچاوەی خۆی نامۆبێ.

هەموو جارێ كە ئەمبینی و تەوقەم لەگەڵ ئەكرد

هەستمئەكرد دەستم لەناو دەستی كرێوەی خەمێكدایە

چاوم بڕیوەتە چاوی سەرابێك

پێكەنینی گریانێك ئەبینم و

بۆنی بۆ ساردی مەینەتیەك ئەكەم

هەموو جارێ كە قسەی ئەكرد

وامئەزانی شیعرێكی بێدەرەتان قسەم لەگەڵ ئەكات

یان نانێكی چاو بەفرمێسك.

یان كانیەكی لێڵكراوی وەڕس.

یاخود بنەمۆمێكی داگیرساو لەدوا ساتەكانی ڕووناكیدا.

لێگەڕێن.. ئازیزان لێگەڕێن.. با ئەو گۆرانیە غەمگین و

مەستە بۆ خۆی هەر بنوێ. لێگەڕێن با ئەو دارلیمۆ

نەخۆشە هەر ڕاكشێ و ڕاكشێ و ڕاكشێ!

وازبێنن با خەبەری نەبێتەوە

نەبادا خەو بەخۆشییەوە ببینێ.

لێگەڕێن.. هاوڕێیان.. لێگەڕێن

با ئیتر هەرگیزاو هەرگیز

چاوی بە شووشەی شکاوی پەنجەرەکەو، بەخەزانی ڕوخساری

ژنەکەی و بە دڵۆپەکانی بنمیچەکەو بائیتر چاوی بەچاوی

مەرگی ناو ژیانەکەی نەکەوێتەوە.. لێگەڕێن.. هاوڕێیان

لێگەڕێن!

## پیاوێك لە درەختی پێکەنین!

بۆ چلەی (سمکۆ عەزیز)

یەکێك لەو مرۆڤە خوێن شیرین و ڕۆح سووکانەی کە ساڵانێکی
دوورودرێژ پەروانەی لە دەوری سەر گەڕاوی ئەم شارەو
ئاوێزانی دەم پێکەنینی شانۆی تراژیدکۆمێدی ئێمە بوو،
یان بووبووە زێوانی هونەرو لە ڕۆژگارە هەرە غەمگینەکاندا
زەردەخەنەی ئەخستە سەر لێوی زامەکانمان و لە پێکەنینێکی ئومێد
بەخشا، بە شێوەی پەلکە زێڕینە باوەشی بەم شارەو
بە ئاسمانی هەموو کوردستاندا کردبوو. ئەو شمشاڵە
باریکە "سمکۆ عەزیز" بوو! ئەو پیاوەی کە لە
ناخدا و لەبنەوە ئەسووتاو بەڵام بەڕوخسارو سیمای دەرەوە
تۆوی بزە و گاڵتەی لە دەروونی ئەوانی تردا ئەچاند.
ئەو پیاوەی تا دوا سەفەری ئێجگارەکی، وەك بەفر
ژیاو، ڕۆژێ لە ڕۆژان داوەکانی مێردەزمەی دوژمن
زەفەریان بە فریشتەیی ئەو نەبرد!



بەڵێ پیاوێ لە درەختی پێکەنین

وەختێ کە پێکەنین بەری ئەگرت و

لەماڵ بەماڵدا ڕۆحی خەڵکی لێی ئەخواردو

تامی ئەکرد!

هونەرمەندێ لە سادەیی

وەختێ کە سادەیی ئەبوو بە گوڵە کێویلەو

خەڵکیش لەیەخەی خۆیان ئەدا.

ئەکتەرێ لە شانۆی کۆمێدی کورد

وەختێ کە کۆمێدیا ئەبوو بە ڕەخنەو

ئەچۆوە بەگژ ڕمووزنەکانی کۆمەڵدا!.

پیاوێ بەنازناو قامیش و خۆی قامیش و

بەڵام قامیش ئەبوو بە شمشاڵ و

خۆشەویستیی و پەیڤی شیرینی لێئەدا.



جەستەیەك لە چڵەدار

وەختێ چڵەدار گوڵی ئاگری ئەگرت و

گوڵ ئەکەوتە سەمای جاویدانەو

باوەشی ئەکرد بە دنیادا!



"سمکۆ" یەك لە ئاوی ڕەوانی ڕۆح و

لەو بەفرەی کە بەردەوام

پیرەمەگرون نیشانی ئێمەی ئەدا!



ڕۆژانە کە سەرنجی گۆیژە ئەدەم لە

دەراڵێکدا سیمای ئەحەی کوڕنوو ئەبینمەوە.

کە بەلای بنچکەکانی ئەزمرِدا ئەڕۆم، قسەیەکی

خۆشی "خاڵە ڕەجەب"م تووش ئەبێ. لە

چیمەنەکەی یانەی فەرمانبەرانیشدا نوکتەیەکی

"کەمال سابیر" بانگم ئەکاو هەر ئۆپلێکی

کۆنیش ئەبینم پڕە لە پێکەنینی "سمکۆ عەزیز".



تەمەنێ لە تەختەی شانۆ

وەختێ کە شانۆ تازە پێرەوکە بوو لەم شارەدا

وەختێ کە ئەکتەر

ئەستێرەی سیوەیل بوو لەم وڵاتەدا!

وەختێ کە تەلەفزیۆن

لە کەوی سپی دەگمەن تر بوون لەم دەڤەرەدا!.



سلاو لەو ڕۆحانەی ئازاری خۆیان

بۆ ئەکردین بە گوڵ خەندەران، تا ئێمەیش

وەك گوڵ خەندەران پێبکەنین

سوپاس بۆ ئەو زستانی تەمەنانەی

کە لە پەیف و جووڵەی سەرشانۆدا بەهاریان

بۆ ئەکردین بە دیاریی. تۆیش "سمکۆ عەزیز"

ئەی ئەو مۆمە سپییەی کە تا مردی

نە مۆمدانی شانۆت بەجێهێشت و نە پەروانەی

بینەرانی خۆشەویستی!

# شێرکۆ بێکەس و
# هەڤپەیڤینێ لەگەڵ (ستایل)دا

دیداری (ستایل)

***حەز دەکەین هەندێك نهێنی دەربارەی ئەمڕۆی شیعری تازەی کوردی بدرکێنیو ئایا ئاستی شیعر دابەزیوە یا بەرەو بەرزی چووە؟**

- لەم ڕۆژگارەی ئێستەماندا، شیعری تازەی کوردی. لە درەوشانەوەیەکی جواندایە، بە تایبەتی لە نموونە دیارو لەبەرچاوەکانیان، لەو شیعرانەدا، کە باوەشیان بە ئاسۆیەکی بەرینی داهێناندا کردووەو لەیەك ڕەهەندییو یەك دەنگیو ساویلکەیی بیریان تێپەڕاندووە، ئێستە زمانی کوردی بەو شیعرە جوانانە "هەژاوە"، بەو خەیاڵە تازانە، هەسارەی تری دۆزیوەتەوە کە تا ڕابوردوویەکی نزیك نەیبووە. وێناکانی شیعر لە نموونە دەگمەنەکانیاو لای ئەو شاعیرانەی کە لە تخووبێکی ئیبداعدا نەوەستانو بەردەوام هەوڵی دۆزینەوەی نهێنییە تازەکانی ئەدەبو زیاد لە فڕینێکیان هەیەو کاژێك ناپۆشن، هەست ئەکەیت لای ئەو خەیاڵە بەپیتانە بەردەوام نەغمەکانی باڵی تر پەیدا ئەکەن بۆ بەرزبوونەوەی زیاتر. هەست ئەکەیت وەك بەفری نواباریو، یەکەمجارە، ئەیانبینیو پێی تری نەچۆتە سەر. ڕەنگە جوانترین خاسیەتی دیاری ئەو ئیبداعانە لەوەدا بێت، لە بژوێن نەچێتو هەموو ڕەنگەکانی لەخۆ گرتووە. کۆپیکردنی یەکتر لەنێوان یەکتردا هەر تەواو کەمبۆتەوە. لەو بەرهەمە دەگمەنانەدا، هەست ئەکەیت شیعری تازە لە چوارچێوەی قاڵبەکان جیابۆتەوە. ئەشێ زیاد لە تەفسیرو لێکدانەوەیەك بۆ تەنها وێنەیەکی شیعری بکرێ.

به لای منەوە تا ئەوکاتەی پێوانەو مەرجو نیزامێ هەبێ بۆ شیعر. زمان کەسیرەو گرمۆڵە ئەبێ. وەختێکیش ئەم فڕینو شەقژنە تازانە بینران کە ڕوانینی تازە بۆ ژیان هاتە گۆڕێو بە دوایدا فۆرمە کراوەکان هاتنە کایەوە. –کەمو زۆری– ئەم سنوور بەزاندنو تەقینەوانەی ناو زمانەکە تازەگەری بە مانا فراوانەکەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. شاعیر واتە زمانو خەیاڵ. نهێنییەکان بە ئاسانی ناگیرێن، بەڵام ئەبێ ئاگامان لەوە بێ کاتێ ئەڵێین: شیعری تازەی کوردی، ئەگەر بە ڕواڵەتی بڵاوکردنەوە بێ، هەموو ڕۆژێ خەرواری شیعر ئەبینین، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا ئێمە مەبەستمان لە "چەند"ی ئەو شیعرانەیە یان لە "چۆنیەتی" ئەو تازەگەریەیە؟! کەواتە هەر ئەبێ لە نموونە جوانەکان بگەڕێین. نموونە جوانەکانیش لە هەموو دەورو زەمانێکدا دەگمەنەکان بوون ئەو دەگمەنانەیش بە تەنها بەهرەی "خۆڕسك" نایانڕسکێنێ. لێرەدایە کە ڕووناکبیری شاعیرو سەرباری ئەزموون، ئەبنە زەمینەو فەزای ئەو بەهرە جوانانە. شیعری تازەی بێ فیکری تازە نین. وێنەیەکی شیعری سەرسامکەر کە خەیاڵێکی ڕەها ئەیخوڵقێنێ، لەهەمانکاتدا عەقڵێکی شاعیرانەی داهێنەرانەی لە پشتەوەیە. ڕوونتر بڵێم: ڕەنگە هەبێ بە فۆرمی تازەیش بنووسێ بەڵام بە عەقڵێکی زۆر کۆنەوە هاتبێتە ناو ئەو خانووە تازەیەوە. ئەشێ باشترین نموونەیش ئەو شاعیرە ئیسلامیانە بن کە ئێستا لە ڕۆژنامەکانی لوبنانو میسرو مەغریبدا شیعرەکانیان بڵاو ئەکەنەوە. بە ڕەنگوڕوو بە جلوبەرگ تازەن، بەڵام بۆنی هەزار ساڵ پێش ئێستەیان لێدێ! تازەیی لە بینینی تازەو گۆڕاندایە. هەر لەم ئاستەیشەوەو بەم ئاقارەدا خودی زمانیش گۆڕانی بەسەردا دێت، بۆ نموونە، زۆرجار باس لەوە کراوە. بۆیە (گۆران) ڕێبەرێکی شیعری تازەی ئێمەیە، چونکە دەستبەرداری وەزنەکانی عەروزی عەرەبی بووە، چونکە گەڕایەوە سەر ئەو وەزنە فۆلکلۆریانەی کە پێشتر شاعیرانی هەورامان پێیان ئەنووسی، چونکە کوردیەکەی پوخت بوو.. تاد.. بەڵام لە ڕاستیدا باسکردنی ئەم خاسیەتانە، مانای گەوهەری، ئەو شیعریەتە تازەیە لای ئەو ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی "گۆران لەو سەردەمەی خۆیدا دیدو بیرو بۆچوونو عەقڵێکی تازەی پێبوو بۆ ژیانو سروشتو زمان، هەر لەبەر ئەوەش بوو پێکهاتەیەکی نوێی زمانو شیعری داهێنا..

من بڕوام وایە: ناکرێ شاعیرێ بیری تازەی بۆ ژیان نەبێ بە مانای وشە شیعری تازەیشی هەبێ!. لە ئیستەدا ماڵی شیعری تازەی کوردی، بە دەیان پەنجەرەی تازەی تێکەوتووە. پەنجەرەکان ڕەنگاوڕەنگن‌و بەرایی زمانی کوردیشیان ڕۆشنتر کردۆتەوە. گومان لەوەدا نییە شیعری تازەی کوردی، لە دەقە جوانەکاندا، بەرەو بەرزی چووە. دیارترین خاسیەتی ئەم ئەفراندنە تازەیەش لەوەدایە کە بیر فراوانتر بووەو ڕووناکبیری کراوەترو خەیاڵ ئازادترو ڕەنگینترە لە جاران چونکە شاعیری داهێنەری ئەمڕۆ پاشخانی ڕۆشنبیریەکەی لە چراخانێکی گەورە ئەچێ کە لە چەندین ڕوانگەوە وزەو تیشکی تازەتر وەرئەگرێ. کە ئەمە تا ڕابوردوویەکی نزیکیش وانەبوو.

ئەوسا ترسێك هەبوو لە زمان‌و داڕشتن‌و ترسێك هەبوو لە بەزاندنی لەمپەرەکان، سانسۆرێك هەبوو لە ناوەوەی پێناسەکردنی شیعردا. ئەو ترسانە تا ڕادەیەکی زۆر شکێنراون. ئەوە ڕاستیە کە ئەمانەوێ دەقێکی شیعری بخوێنینەوە کە هەست‌و نەست‌و خولیا بوروژێنێ. بەڵام لە هەمان کاتدا لەناو دەقەکانی ئەمڕۆدا پرسیاری تازە ڕێچکەیان بەستووەو تەنانەت بە "مەعریفەیش" پاراو ئەکرێن، ڕەنگە ئەمە خەیاڵێکی هەرە دیار بێ کە شیعرە جوانەکانی ئەمڕۆ لە شیعری بیست ساڵی لەمەوبەر جیابکاتەوە. ئێستە یەك جۆر "جوان"مان نییە. یەك چەشن "بینین"مان نییە. یەك بیرکردنەوەو فۆڕممان نییە. هەر لەبەرئەوەیشە دنیای شیعری تازەی ئەمڕۆمان لە دوێنێ ڕەنگاڵەترو بەشەوقترو بەرینترە!.

***ئایا پڕۆژەی حەداسەوی لە شیعری کوردی سەرکەوتنی وەدەست هێناوە؟ یاخود کامڵ بووە، یا بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا ڕێچکەی خۆی گرتووە؟.**

- هەموو پڕۆژەیەکی ئیبداعی ڕێگای درێژو وەختی ئەوێ بۆ ئەوەی تەواو کۆك بێت. هەڵبەت من بە گشتی‌و لە ڕوانگەی ئەفراندنەوە بۆ تاکی (موبدیع) قسە ئەکەم. نەك پڕۆژە بە بڕیاری دەستە جەمعی، چونکە هەموو مەسەلەیەکی تیۆری‌و ڕەخنەیی لە لایەك‌و بەڵام کاتێ ئەنووسین هەر خۆمانین‌و تەنیا ئەمێنینەوە دواجاریش بەرهەمی ئەو تەنیاییە پڕۆژەکەیە. نازانم مەبەست لە سەرکەوتن چییە؟! لای کێ‌و چۆن؟! لای من ئەوەندە ئەزانم ئەم نەخشەی شیعری کوردییە، ئەم تازەگەرییە، هەرێمێك‌و شێوازێك‌و

یەك ڕەنگی نییە. جوانی ئەم تازەگەرییە لەوەدایە کە بە دەنگو ڕەنگی جیاوازەوە، بە بیری جیاوازەوە، بە فۆڕمی جیاوازەوە، بە وێناکردنی جیاوازەوە، بە ئەزموونی جیاوازەوە هاتووەو پەلکە ڕەنگینەیەکی لەم فەزایەدا نەخشاندووە. من گومانم نییە، لەم تازەگەریەدا، ئەو نموونە جوانانە هیچیان لە شیعرە هەرە جوانەکانی دنیا کەمتر نییە، بەڵام نابێ ئەوەیشمان لەبیر بچێ، نموونە خراپەکانی ناو ئەم تازەگەرییە زۆرترن. هەر لە ناشیرینکردنی زمانەوە –بە مەبەستی ئاوڕدانەوەی خەڵکی لەو کەسەو هیچی تر- ئینجا وشە فڕێدانو بێ سەروبەری ماناو شێواندنی ڕۆحی شیعر. گەمەیەکی منداڵانەیە. تۆ بڕوانە ئەو جۆرە شیعرانە نە مانو نە سەرسامکردن، نە جووڵەو وزەی زمانو ڕیتمو ئاهەنگو نە جۆرێك لە تێرامانو نە تەزوویەك بۆ داچڵەکینو نە سیحری وێنەیەكو نە فۆڕمێکی تۆکمەو نە هیچ. کوتومت وەك ئەوەی تورەکەیەك پڕ بکەیت لە وشەو ئینجا دەستی پێدا بکەیتو چنگێ دەر بهێنیتو ڕۆی بکەیتە سەر پەڕە کاغەزێ! یان ڕیزە قفڵێ لە زماندا، کە کلیلەکانی لای خاوەنەکەیشی نین.

من نازانم یەکێك لە خاسیەتەکانی ئەدەب بە گشتی "چێژ وەرگرتن"ە لەو دەقەی ئەیخوێنینەوە. ئەشێ ئەم چێژە یان پێ سەرسامبوونە لە جوانی وێنەیەکەوە بێت، یان مۆسیقای ڕستەیەك، یان لە مانایەکی قوڵەوە یان لە پەیبردن بە نهێنییەك کە تا ئەو کاتە لە ئێمە شاراوەبووە، یاخود لە کەمەندکێشی ئەو ئەفسوونەی لە زمانەکەیدایە. بەڵام وەختێ ئەمانە نەبینی. ئیتر نائومێد ئەبیتو ئەو شیعرە ئەخەیتە لاوە. بۆیە ئەگەر تێبینی بکەیت، لەمڕۆدا ئەو شیعرانە بەهۆی ئەو زمانە (دابڕاوەوە)، کە لە زۆربەی ئەو شیعرانەدا هەن، بێزارکەرو ناخۆشەویستنو ئاکامیش "ناخوێنرێنەوە"، کە شیعریش نەخوێنرایەوە با هەیشبن ئەوسا لە قۆپچەی سەر قۆڵی چاکەت ئەچنو چ دەورێکی وایان نییە، ڕاستە شیعر خۆی تەلیسمی تێدایە بەڵام نەك خۆی ببێتە یەك پارچە تەلیسمو لە کرانەوە نەیەت. شیعر تەموومژی تێدایە، بەڵام نەك خۆی ببێتە دیوارێك لە تەمومژو بەرابیەك بۆ "خوێندنەوە" نەهێڵێتەوە!.

بەلای منەوە "حەداثەوی" پرسیارە نەك لاڵیو بۆشایی. ئەمە بە مانای ساکاری ناڵێم بەڵکو بە مانای ئەو سادەییەی کە لە جوانیو حەقیقەت خۆیشیاندا هەیەو بەڵام

پەیپێبردنیان تابڵێی گرانە. لەناو کۆمەڵدا یەك چەشن هەڵبژاردە نییە، بەڵکو چەندین هەڵبژاردەو بەڵکو چەندین ئاستی تێگەیشتنی هەمەجۆر. حەداسەویەت ئەوکاتەی لای هەر شاعیرو نووسەرێ گەیشتە ئەوەی وەك "موقەدەس" تەماشا بکرێ لەوساتەوەختەوە کۆتایی خۆی ڕائەگەیەنێ. کامڵبوونی ئەزموونێ لە تینوێتی بەردەوامی شاعیرەوە دێت. واتە ئەوکاتەی ڕازی نابێ بەوەی بچێتە ژێر ڕکێفی قەناعەتەوەو بڕوای وابێ شیعری هەرە جوانی ئەو دەقێکە کە هێشتا نەینووسیوە!.

***لە میانی شیعرو ململانێ لەگەڵ دژواریەکانی شیعر پەیوەندی نووسین چۆن دەبینی لەسەر ئاستەکانی:**

**ـ کپبوونی نووسینی شیعر.**

**ـ هەراو زەنای ڕۆژنامەکان.**

**ـ سەرهەڵدانی ژانری دیکەی ئەدەب؟**

ـ هەڵچوون و کپبوون و سەداو بێدەنگی و زۆر دیاردەی تری شیعریش وەك لە ژیاندا ئەیانبینن لە ئەدەبیشدا هەن. بەڵام دیارە لە پشت هەر دیاردەیەك لەوانەوە، چەندین هۆو هۆکاری زاتی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی هەن. ئەگەر مەسەلەی کپبوونی نووسینی شیعر بێ. واتە لەم سەردەمەی ئێمەدا- کە دیارە بەلای منەوە وا نییە- هەڵبەت مەبەستم لە شیعری باشە. ئەوە من پێموایە ئەو گریمانەیە بۆ ژمارەی کەم و باش، لە هەموو ڕابوردوویشدا هەروا بووە، ئەشێ بۆ دواڕۆژیش هەروا بێت، چونکە بینینەوەی گەوهەرەکان لەبنی دەریادا، هەمیشە هەر دەگمەن بوون و بە هەموو مەلەوانێك دەرنەهاتوون. ئێمە نازانین لەو زەمانەدا، بۆ نموونە، کە عومەری خەیامی تێدا ژیاوە ئەبێ چەندی تریش شیعریان نووسیبێ؟! یان هەموو مەلاو فەقێیەکانی سەردەمی نالی "شاعیر بوون" بەڵام چۆن شاعیرێ؟! ئەمەیە ئەو پرسیارەی کە زۆرجار پاشەڕۆژ وەڵامی ئەداتەوە، ئەوەی ڕاستیبێ، ئێمە ئەبێ وێڵی دوای "شیعریەت" بین نەك "چەند" لە شیعر نووسیندا.

ڕاستیەکی تریش هەیە زۆر سادەیە، بەڵام گرنگە ئەویش ئەوەیە وەك چۆن حەقیقەت لای تاقە ڕێبازێك یان فیکرێ نییە بە تەنیا، شیعریش، ئەو جوانییەی

لای شاعیرێك‌و دوو شاعیر نییە، لای قوتابخانەو ڕێچکەیەکی شیعری نییە. شیعر ئاوێنەیەکی نییە. یەك شانۆیشی نییە ماڵی ئەفراندن‌و حەداسەویەتیش هەر لە شوێنێك نییە، ئەم مەسەلەیە. ڕێژەییە تەنانەت لە سەرتڵ‌و هەڵبژاردەکانیشدا.

بۆ بەشێکی دیکەی پرسیارەکەتان، بێ نموودی یان چۆڵی‌و بێدەنگی ڕەخنەی شیعرییە. لە خانی‌و نالییەوە بیگرە تا ئەمڕۆ، ـ جگە لە چەند وتارێـ ئیتر هەمیشە بالآی دەقە ئیبداعیەکان لە دەقە نەقدیەکان هەڵکشاوتر بووە. هەراو زەنای ناو ڕۆژنامەکانیش، لە بارەی شیعرو شاعیریەتەوە، دەنگدانەوەی هەراو زەنای ناو فیکری شڵەژاوی ئێمەن. بەشی زۆری ئەو قسانە تەقلیدین نەك حەداسەوی. زادەی بیری ڕابوردوون نەك ئایندەیی. ئەوەی ڕاستیبێ، لەسەرهەڵدانی ژانرەکانی دیکەی ئەدەبدا، ئەمڕۆمان بەخشندەترە وەك لە دوێنێ. دیارترین جیاوازی: ئەو شەپۆلی ڕۆمان نووسینەیە کە لە ئێستەدا بەدی ئەکەین‌و تا دە پانزە ساڵی لەمەوبەر بەم شیعریەی ئەمڕۆ نەبوون. سەرهەڵدانی هەندێ پڕۆژەی جیدی ڕەخنەیی.. هاتنەکایەی هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامەی ئەدەبی‌و هونەری سەنگین. لێکۆڵینەوەی زیاتر لە بواری مەعریفی‌و فەلسەفیدا. ئەمە لەکاتێکدا ئەتوانین هەندێ پاشەکشەیش باسبکەین بەتایبەتی لە بواری شانۆی کوردیدا. کورتە چیرۆکیشمان وەك چاوەڕوان ئەکرا بەو جۆرە هەڵنەکشاوە. هەڵبەت چەند چیرۆکنووسێکی بە توانای لێدەرچێ ئیتر بەشی زۆر ئەو چیرۆکانەی ئەینووسن نە ڕۆحی چیرۆکیان تیایەو نە هونەرێکی بەرزو زیاتر لە بیری ڕاگوزاری‌و خاتیرەوە نزیکترن. بێگومان ئەبێ ئاماژەیش بەوە بکەم کە لە ڕەنگاڵەییکردنی ئەم تازەکردنەوەیەدا چەند دەزگایەکی چاپ‌و بڵاوکردنەوە دەوری دیاریان هەبووە. بە کورتی پڕۆژەی تازەگەری لە ئەدەبدا بۆئەوەی بە تەواوی کامڵبێ پەیوەندییەکی دینامیکی بە سەرتاپای پڕۆژەی تازەگەریەوە هەیە لە بواری ڕۆشنبیری کوردیدا بەگشتی، واتە ئەو تازەگەریە کۆمەڵە ئەڵقەیەکەو بە هەموویان پڕۆژەکە تەواو ئەکەن!.

*ئێستا خوێندنەوەکانی تۆ لە وێستگای شیعرە یا ڕۆمان.. یا بابەتەکانی دیکە، ئایا بێ بەردەوامی خوێندنەوەی شیعر دەکرێ بەردەوامی بەنووسینی شیعر بدرێ؟

ـ "خوێندنەوە"، ئاوی "نووسین" ئەدا. نەخوێندنەوە "خاڵیبوونەوە"و خوێندنەوە "پڕبوونەوە"یە. بەم پێیە درێژەدان بە خوێندنەوە درێژەدانە بە نووسین. ئەتوانم بڵێم بەشی هەرە زۆری ئەو زانیاریو ئەزموونە هونەریانەی لای شاعیرو نووسەر هەن، لە گەنجینەی دەوڵەمەندی دەرەوەی خۆیانەوە هاتوونو کۆبوونەتەوە. من بۆ خۆم وەکو زۆرجاری تریش باسمکردووە. ڕۆمان لە شیعر زیاتر ئەخوێنمەوە. هەروەها دیراساتی ئەدەبیو نەقدی. ژیننامەو یادداشتی ئەدەبی. داستانە کۆنەکانو کورتە چیرۆك، بەڵام خوێندنەوەی بابەتی فەلسەفی کەمتر. کە من پێموایە ئەمە یەکێکە لە خاڵە لاوازەکانی ژیانی ڕووناکبیریم. خاڵی لەمە لاوازتریش ئەوەیە، کە تەمەڵیو گوێنەدانو پەرشو بڵاویم بوونە هۆی ئەوەی زمانێکی زیندووی ئەم دنیایە فێر نەبم —ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەرەنسی، ئیسپانی- تازە بەم تەمەنەشەوە ئەم فێربوونانە مەحاڵن. بەهەر حاڵ ئەگەر خوێندنەوە درێژەی نەبێ نووسینیش درێژەو تەمەنی نابێت. جا خوێندنەوەی شیعر بێ یان هەر دەقێکی ئەدەبیو هونەری. ناکرێ هەر لە بەری بڕواو ئاوی نەیەتەسەر. بە ڕاستی خوێندنەوە ئەو ئاوەیە کە ناهێڵێ بەتاڵ بینەوە!.

***شێرکۆ بێکەس دوای نیو سەدە شیعری کوردیو خەریك بوون بەم هونەرە بەرزە، پرۆژەی تازەی بەدەستەوەیە کە جیابێ لە پرۆژەکانی دیکەی شیعر؟**

ـ شیعر بوو بە چارەنووسم، تەنانەت ئەگەر نەیشینووسم. ئەو تازە بووە بە بەشێك لەمن. ئەو خۆشەویستەی لێشت دووربکەوێتەوە هەر لە خەیاڵو گیانتایە. وەك چۆن کەژو کێوی بێ بەفرو باران، یان باخچەی بێ باڵندە تەصەور ناکەم، هەروەهایش دنیایەك کە شیعری تیا نەبێ. تا ئەم دەقیقەیە. پرۆژەی بەدەر لە شیعرم نییە ئەگەرچی شیعر بۆخۆی چەندین وێستگاو باخچەی هەمەڕەنگی هەیە. یان پرۆژەیەکە چەندین پرۆژەی تری لەناوایە. ئەوەی ڕاستیبێ یەکدوجارێ خەیاڵی ڕۆمان نووسین هاتووە بەسەرمدا. دەستم داوەتێو چەند لاپەڕەیەکیشم لێ نووسیوە. بەڵام دواتر دڕاندومن، لەبەر ئەوەی هەر ئەبوونەوە بە شیعر. زمانی مەجاز ئەبۆوە بە زمانی زاڵ. لەو دووسێ ساڵەی دواییداو هەتا ئێستەیش ئەو

خەیاڵە گەرمەم هەر لەسەردایە، بۆ ئەوەی دەستبکەم بە نووسینی یادداشتێ یان ئەزموونی شیعری خۆم، چونکە پێئەچێ وەختی هاتبێ بەتایبەتی کە تەمەن ڕوو لە لێژیو سەربەرەو خوارییە!. کاتی خۆی لە شاخ 1985ـ 1986 کورتەیەکی ژیانم نووسیو هەر لەوێش چاپکرا. بەڵام وەك ئەنجام بەدڵم نەبوو. بە هەر حاڵ ئەمە یەکێکە لەو پڕۆژانەی حەز ئەکەمو بە پێویستی ئەزانم کاری تیا بکەمو تەواوی بکەم، جا نازانم ڕۆژێ لە ڕۆژان بە ڕاستی دەست پێئەکەم؟! یان هەروەك قسەی هەندێ سەرخۆشی شەوی لێدێو لە دواییدا (با)ی بیرچوونەوە ئەیبات!

هەڵبەت ئەم گومانو ڕاڕاییو دوودڵییەیش لەوەوە هاتووە کارەکە بەئاسان نازانم، چونکە ئەو یادداشتەی لە خەیاڵی مندایە، بەتایبەتی شێوازی نووسینەکەی ناکرێ هەروا ساکارو سادەبێ، ئەمە جگە لەوەی پێویستە زۆر ڕوونو بێ پەردەو پێچو پەنا بنووسمو ئەمەیش لەبەر زۆر هۆی سیاسیو کۆمەڵایەتیو پەیوەندی تاکەکەسی (جورئەتی) خۆی ئەوێو لە هەموویشی گرانتر ئەوەیە تا چەند ئەوێری لەخودی خۆتو هەڵەو خەوشەکانت بدوێی!.

# دیدارێ لەگەڵ (گۆڤاری کاروان)دا

*پێشبینی، مۆسیقاو ڕیتم، چێژ

* روئیا مەعریفەو بەهرە، ئەزموون لە شیعردا

*ئەزموونی ڕوانگە، گروپ نووسین، سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتایی، پەیوەندی نێوان شیعرو ڕەگەزەکانی دیکەی ئەدەبو شێوەکاریی

*ئیلتزامو ئازادی لە شیعردا

*تەوژمە جیاجیاکانی نێو دنیای شیعر

*شوێنو زەمان... تێکشکاندنی زمان لە شیعردا

*بێکەس لە ژیانی شێرکۆ بێکەسدا

*شیعری نوێو بەکارهێنانی وشەی بێگانە لە شیعری لاواندا

*کەی شێرکۆ لە شیعر دەست هەڵدەگرێ؟

مێژووی هەر نەتەوەیەکی سەر ئەم گۆی زەمینە لێوانلێوە لە ئەفسوونو سەرسامیی، بریتییە لە هێزی فیکری چەند کەسایەتییەکی داهێنەرو بلیمەت. مێژووی ئەدەبی نەتەوەی کوردیش هێزی فیکری چەند کەسایەتییەکی داهێنەرە، شێرکۆ بێکەس ئەو کەسەیە کە لەو بوارەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەیەو وەك داهێنەرێك لە دنیای شیعری کوردیدا چالاكو کارایە.

گۆڤاری کاروان بە پێویستی زانی ئەزموونی دەوڵەمەندی ئەم شاعیرە کاریگەرەی نێو شیعری کوردی بە خوێنەرانی بگەیەنێت.

***ئایا له شیعردا بڕوات به پێشبینی هه‌یه، زۆرێك له شیعره‌كانت پێشبینی تێدا بووه‌و دواتر پێشبینییه‌كان بوونه‌ته واقیع‌و بینران، ده‌كرێ شاعیر وه‌ك ساحیرێكی هونه‌رمه‌ند ته‌ماشا بكرێت، یان ڕۆڵی پێشبینی له ده‌قی ئه‌ده‌بیدا چییه؟**

- شیعر خوێندنه‌وه‌ی نادیاره. به واتایه‌كی تر بینینی ئه‌و داهاتووانه‌یه كه چاوی ئاسایی نایانبینن، یان پرسیاره له تیۆری پێشبینی كردندا به‌و مانایه‌ی وێناكان ئه‌بن به واقیعی ناو زمان خۆی‌و له‌هه‌مان كاتیشدا خه‌ونه‌كان ئه‌بن به واقیع، واته دێنه دی. له شیعردا دیدی هه‌ست‌و نه‌ست تیژن، ئازادو بێ په‌روان، هه‌روه‌كو ئه‌م چاوه لای منداڵ‌و زمانی منداڵ ئه‌گه‌نه ئاستی جۆرێك له دنیای ئه‌فسانه‌و تێكه‌ڵاوبوون له‌گه‌ڵ نادیاردا. كورد قسه‌یه‌كی سه‌یری هه‌یه ئه‌ڵێت: "قسه له منداڵ، یان له شێت" ئه‌م ئیدیۆمه له ئه‌نجامی ئه‌زموونی دوورو درێژی ناو ژیان خۆیه‌وه هاتووه. ئیتر منداڵ قسه‌یه‌ك ئه‌كات‌و كه‌چی قسه‌كه ڕاست دێته دی.

ئه‌م قسانه قسه‌ی ئه‌ودیوی عه‌قڵن ئه‌گه‌ر نا ئه‌بوایه بوترایه "قسه له زانا، یان له حه‌كیم". نێوانی منداڵ‌و شێت‌و شاعیر به گران له یه‌كتر جوێناكرێنه‌وه. من پێموایه ناكرێ جۆرێ له شێتی له شاعیردا نه‌بێت، چونكه هه‌ردووكیان جۆرێك له بێهۆشی‌و بێئاگاییدا ئه‌ژین، زمانی شاعیر به عه‌قڵ جڵه‌و ناكرێ، هه‌روه‌كوو چۆن زمانی منداڵ‌و قسه‌ی منداڵ‌و هه‌ڵسوكه‌وتی منداڵ پابه‌ندی دنیای گه‌وره‌كان نییه. شه‌رمی عه‌قڵ هه‌میشه له دركاندنی ڕاستیه‌كاندا كۆسپێك بوو، له‌به‌رده‌م ده‌ربڕیندا ئه‌م شه‌رمی عه‌قڵه لای منداڵ‌و شێت نین. شاعیریش له شیعری بێ ده‌ربه‌ستدا زمان ڕووت‌و قووت ئه‌كاته‌وه. یه‌كێك له گه‌وره‌ترین دڕدان به دنیای باوی زمان‌و به‌زاندنی هه‌موو ئه‌و سنوورانه‌ی كه ڕێیان له خه‌ون‌و خه‌یاڵ ئه‌گرت له سه‌رده‌می سوریالیه‌كانه‌وه ده‌ستیپێكرد. ئه‌و وه‌خته‌ی زمانی باویان كرد به ناباوو زمانی شیعریان وه‌ك جۆرێك له پێشبینیكردن كارپێكرد، پێشبینیكردن جۆرێكه له خه‌ونی ناو شیعر، ڕووكردنه داهاتووه بۆ دۆزینه‌وه یان كه‌شفكردنی ئه‌و نادیارانه‌ی كه هێشتا نه‌هاتوون‌و نه‌زانراون. شیعر له سیحر نه‌ك هه‌ر خاڵی نییه، به‌ڵكو هه‌ر خۆی جۆرێكه له زمانی سیحراوی، واته له‌و پێكهاته باوه‌ڕ پێنه‌كراوه‌ی كه فه‌رهه‌نگی زمان خۆی سه‌رسام ئه‌كات. ئه‌م

پێشبینیکردنه له شیعردا به پلان نییه، ئەوەی نیەتی پلانه، بەڵکو ئەو عەفەویەتە لەگەڵ هەڵقوڵینی خۆیدا ئەیهێنێ که "نەزانین"ی هۆو هۆکارەکانی بەشێکن له ڕەنگدانەوەکانی. یان له هاتنەدی خەونەکانی وەك ئەوەی ڕێکئەکەوێ له ساتەوەختێکدا ئەتەوێ له زەنگی دەرگایەك بدەی له دڵی خۆتدا ئەڵێیت لەوانەیە ئەم زەنگه کارەبای لەسەربێ و بمگرێ، کەچی هەروایش دەرئەچێ. یان یەکێکت له خەیاڵدایەو کەچی لەپڕ ئەو کەسه دەرئەکەوێ. ڕۆڵی پێشبینی له شیعردا زمانی سیحراوی جادووگەرانەیە بۆ خوێندنەوەی نادیارەکان یان ئەو شتانەی که مەراقی هەرە گەورەی ئێمەن و ئەمانەوێ بزانین چیمان بەسەردێ. چی ئەبینین و چیمان له ڕێگەدایە، هەمیشه ئەم پێشبینیکردنانەیش وەختێ ڕاست دەرئەچن تووشی جۆرێك له شۆکی شیعریمان ئەکەن.

***هەموو بەیانێك کۆمەڵێك بنەمای کارکردنی هەیەو ئاڕاستەکان بەڕێوە دەبات: بنەما هونەرییەکانی ئەو بەیانەی ڕوانگەییەکان ڕایانگەیاند چی بوو؟**

ـ هۆیەکی هەرە گەورەی سەرهەڵدانی ڕوانگه لەکاتی خۆیدا دەرککردن بوو بەوەی "زمانی ئەدەبی" تووشی جۆرێك له چەقبەستن بووە. یان تووشی جۆرێك له خۆ دووبارەکردنەوەو جووینەوەی بەردەوام هاتبوو. زمانێك که هەر له گەرووی ڕابردوودا بوو، به هەمان وێناو تۆن و ئاوازییەوە، ئەم زمانه پێویستی به جۆرێك له ڕاچڵەکین و یاخیبوون هەبوو بەرامبەر به وشەکانی خۆی و تەواوی فەرهەنگه کولتوورییەکەی. ئەبوو گۆڕانێك دروستبێ وەك ئەوەی ئەم دەنگه یەك هاوارو یەك ڕیتمی نەبێت و کاتی ئەوە هاتبوو لەگەڵ زمانەکه خۆیدا بکەوێتە شەڕەوە. بکەوێتە چنگ نانەچنگ لەگەڵ ئەو زەین و خەیاڵ و وێنەو ڕستانەدا که ساڵەهای ساڵ بوو به هەمان عەقڵ و پۆشاکی بەرەوە لەبەردەمت قوت ئەبوونەوە. ئەبوو له لووتیان بدەی. ئەم لەلووتدانەی زمان خۆی ئەبوو هەر لەناو زمان خۆیدا ڕوویدات و دەستەو یەخەیش بێت. واته بیتەقێنیتەوە. ئەبوو بڵێی "ئاوی تینووم"و ئاویش له زماندا داچڵەکێنی. ئەبوو بڵێی "ئەو گڕە ساردو سڕە" ئەبوو له وێنه پێچەوانەکانەوە دەست پێبکەیت. بنکەکان تێکبدەیتەوە. ئینجا خەریتەی

خۆت دروست بکەیت. "گۆران" تا شوێنێك هات، بەڵام سەرسامبوونی شیعرییەتی درێژە پێنەدا. سروشتی خوێندەوە، بەڵام تا ئەو شوێنەی ئیتر بوەستێ و لێی یاخی نەبێ یان جوانییە ڕۆمانسییەکانی لە ڕواڵەتێکدا هێشتەوە کە تووشی گێروگازی ڕەخنەو پرسیار نەبن. بۆ نموونە: تۆ وەختێ گەشتی قەرەداخ و هەورامان ئەخوێنیتەوە. بە تەنیا بەهەشتێك ئەبینی کە لەناو جوانیدا هەڵئەقوڵێ، بەڵام ئیتر لە هەورامان و قەرەداخدا هیچ ناشیرینییەك نابینی. دیوی ناوەوەی سروشت نابینی. ئەو دۆزەخە گەورەو بچووکانە نابینی کە بە تەنیشت ئەو بەهەشتەوەن. گوڵی نەخۆش و دەردەدار نابینی. جۆگەی بریندار نابینی. بە کورتی تۆ یەك دیوی دیاردەکان ئەبینی. بەڵام لای ئێمە تۆ چیرۆکی "یاسای خۆڵ و دۆ"ی (حوسێن عارف) ئەخوێنیتەوە یان دواتر لای من "داستانی بەردە قارەمان" ئەخوێنیتەوە کە سروشت و خاك و مرۆڤ لەنێو کۆمەڵێ ڕەهەندی جیاجیادان. بەتەنیا هەر ڕەش و سپی نین. ڕەنگە نوختەیەکی تری گرنگ لە سەرهەڵدانی ڕوانگەدا پەیوەندی بە لۆجیکی "ئازادی"یەوە هەبێت. ئەو وەختەی هەست ئەکەیت هەموو ڕێگاکان لەبەر دەمتا بەستراون، ناچار ئەبیت ڕێگایەك ئەگەر لەناو خەیاڵیشدا بووە بکەیتەوە بۆ ئەوەی نەخنکێیت. ئەدەب و کاری نووسین، خۆی لە خۆیدا "تەنفیسێکی" گەلێ گرنگە پەیوەندییەکی دینامیکی بە باری سایکۆلۆژی و دەروونییەوە هەیە، ئێمە کۆمەڵێ شاعیرو نووسەر بووین، یان کۆمەڵێ بەهرە بووین، لە سیاسەتکردندا تووشی نوشوستی هاتبووین، هەریەکەو لە ئەزموونێکی جیادا، جیاوازیەکەی ئێمەو کەسانی تر کە ڕەنگە لە هەمان کاتدا تووشی ئەو نوشوستیە هاتبێ. ئەوەبوو: ئێمە بەهرەیەکی ئەدەبیمان هەبوو. پەنامان بردە بەر ئەو ئەڵتەرناتیڤە، بەڵام بەو یاخیبوونەوە کە بۆ هەموو تازەکردنەوەیەك جێی "دڕدان"و "سەرچڵی"یەك ئەگرێتەوە کە بێ ئەو، کوورەیەکی گەرمی جووڵەو کارکردنت نابێت.

ئەوەی ڕاستیبێ بەیانی ڕوانگەی ئەدەبی، قووڵ و هەمەلایەنە نەبوو، بە ڕوونی ئەو بنج و بناوان و هۆو هۆکارانەی ڕوونکردبێتەوە، نا، بەیانەکە هاوارێ بوو، بۆ ئەوەی

خەڵك لە وشەی "تازەکردنەوەی بەردەوام" ئاگادار بکەینەوە. زەنگێك بوو لێماندا بۆ ئەوەی خوێنەری کورد بێتو پێی بڵێین: شیعر هەر ئەو قاڵبانە نییە کە تا ئێستا پێیان نووسراوە یان هەر ئەو ڕوانینانە نین کە لە پەنجەرەی چیرۆکەکانەوە هاتوونەتە دەرێ. ڕوانگە لەو ڕۆژگارەدا: حیلەی ئەسپێ بوو دژی ڕامکردنو غاری باوو ڕەوتی ئاسایی.

***ئەزموونی گرووپ، تاکییەت بەرەو کزی دەبا، شێوازیش لێك نزیك دەکاتەوەو وەك یەك شێوازی دەیخاتەڕوو. ئەو زیانو سوودانەی بەهۆی دروستبوونی گرووپی ڕوانگە لە ئەزموونتدا بینیوتن چین؟**

ـ ئەوە ڕاستە، هیچ گروپو تاقمێکی ئەدەبی بە کۆمەڵو دەستەجەمعی ناتوانن ئەفراندن دروستبکەن، چونکە وەك سەرئەنجام تاکی داهێنەر خۆی، لە تەنیایی خۆیدا، لەناو مەراقی خۆیدا، شێوازی هونەری خۆی ئەدۆزێتەوەو دواتر ئەچێتە ناو کۆمەڵەوە. ئەدەب دڵدارێکەو هەر هی خۆتەو بە کۆمەڵ ناتوانین ئەو دڵدارە بکەین بە هی هەمووومان. ئەم عەشقە تۆ هەر خۆت ئەیکەیت. ئەوە تەنیایی خۆتەو خەیاڵی خۆتەو دەستو پەنجەی خۆتە بەرهەمێك بە وجود دێنیت کە لە کەسی تر ناچێو بە تەنهایش هەر ئەبێ بۆنی خۆتی لێبێ. ڕاستە ئەشێ ڕۆمانێك یان شیعرێك دووان یان سیان بەیەکەوە بینووسن، بەڵام دیسانەوە لەوێشدا هەریەکەو هەناسەی خۆیو فەزای خۆی هەیە لە یەکتری جوێ ئەبنەوە. ئێمە هەردووکمان بە ڕێگەیەکدا ئەڕۆینو ڕەنگە ڕوویش بکەینە یەك ئامانج، بەڵام لەهەمانکاتدا ڕێگەکە دوو ڕێگەیە ئەوەی هەر خۆمی پێدا ئەڕۆمو ئەوەیش کە هەر خۆتی پێدا ئەڕۆی. چۆنیەتی ڕۆیشتنو هەنگاو هەڵهێنانەوەی هەر یەکێکیشمان دیسانەوە هەر جیاوازە. جێ پێیەکانی من جێ پێی تۆ نییە. کە قسەیش ئەکەین بە دوو گەرووی جیاوازو دوو دەنگی جیاوازەوە ئەیکەین. ئەوە جگە لەوەی لە کاری هاوبەشی ئەدەبیدا هەرگیز من ئەو قەڵەمە ئازادە نیم ئەگەر هەر خۆم بم. لە گرووپی ئەدەبیدا خودی هەر ئەدیبێ تووشی جۆرە "بەستنەوەیەك" ئەبێت وەك ئەوەی ناچاربێ لە یەك ژووردا لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بژی. سەربەخۆیی لەدەست ئەدرێ، بەڵام ئەم دیاردەیە لایەنی ڕووناکیشی هەیە، ئەویش لایەنی ئەو جموجووڵەیە، کە

ئەکەوێتە دەرەوەی خودی ئەدیب خۆیەوە. واتە لایەنی ڕاگەیاندنی گرووپەکە، یان ئەو دیالۆگو گفتوگۆیانەی کە هەموو ئەدیبێ پێویستێتی. ڕوانگە ئەزموونێکی لەو جۆرەی نەبوو کە پێکەوە بۆ نموونە ڕۆمانێك بنووسین، یان قەسیدەیەك، یان چیرۆکێ. هەریەکەمان پەنجە مۆری خۆی هەبوو. لایەنێکی خراپی دیکەی ئەو ئەزموونە ئەوەبو، ئەبوو بەردەوامیش گوێ لە دەرەوەی خۆت بگری واتە کاتێکی زۆری خۆت بدەی بەوانی تر کە لە بنەڕەتدا کاتی خۆتنو هی کەسی دی نین. واتە لە وەختی نووسینی خۆت ببڕیت بۆ ئەوەی گوێبگری یان لە مەسەلە گشتییەکان بدوێیت. بکەویتە هێرشبردن یان بەرگریکردن ئەمە جگە لەوەی کارکردن بەکۆمەڵ بتەوێو نەتەوێ تووشی موجامەلەی نائەدەبیت ئەکات، واتە وزەی بەرامبەر هاوڕێکەی خۆت تێدا کەم ئەکاتەوە، یان تووشی بێدەنگیت ئەکات. لایەنێکی تری جوانی ڕوانگە ئەوەبوو، ئاگامان لە خوێندنەوەی یەکتر بوو. خوێندنەوەی هەر کتێبێکی تازە، مێزگردێکی دروست ئەکرد.

***پێوەندی شاعیر بە شوێنەوە چییە، یادەوەری دابەشکراوت لەنێوان (سلێمانی، بەغدا، شاخ، سوێد). چۆن لە شیعردا دەجووڵێنیت؟**

ـ پەیوەندی شاعیر بە شوێنەوە لە پەیوەندی باڵندە ئەچێ بە ئاسمانەوە. لە پەیوەندی هەوا ئەچێ بە هەناسەوە. تۆ ئەگەر شوێن لە شیعرەکانی من بکەیتەوە. لە بۆشاییەك زیاتر هیچی تر نابینی. شوێن ڕێگاوبانو مەنزڵە جیاجیاکانی شیعرە، کە شوێنە خۆشەویستەکانت ون ئەکەیت، زەمانەکانیش کاڵ ئەبنەوە. شوێن هۆگربوونەوەو لەهەمان کاتیشدا سەرچاوەیەکی غوربەتیشە، ئەو گەڕەکەی منداڵیم تێدا بەسەر بردووە هەمیشە لەوێم. تەنانەت ئەگەر ئەو گەڕەکە لە وجودیشدا نەمابێت، لای من هەر ماوە، چونکە چۆتە دنیای یادەوەرییەوە. ئا لێرەوە ئیتر شیعرو ئەدەب کارێك لە شوێندا ئەکات کە کارەکەی مێژوونووس نییە. مێژوونووس لە ڕووکاردا کار ئەکات، بەڵام شاعیر لەو وردەکارییانەی کە چاوی مێژوونووس نایانبینێت. کەسێك نییە چەندین وێستگە یان شوێنی جیاجیای لە ژیاندا نەبووبێ، بەڵام هێزی ئەفسووناوی شوێنیش بە تەنیا لە

خۆیدا نییە وەك ژوورو دارو دیوارو شەقام‌و کۆڵان‌و باخچەو خانووەکانی، بەڵکو لەو مرۆڤانەیشدایە کە شوێنەکان بە زیندوویی ڕائەگرن. لەو پەیوەندیانەدایە کە بەهای شوێن گەورەتر ئەکەن. بەغدا بۆ من واتە قۆناغێك لە تەمەن‌و ڕووناکبیری‌و تێکەڵاوبوون‌و ناسیاوی‌و پەیوەندیگرتن. شاخ بۆ من ئەزموونێکی زۆر جیاتر. هەروەها سوید. شوێنە جیاوازەکان شیعری جیاوازیش بەدوای خۆیاندا ئەهێنن، بەلای منەوە یەکێك لەو هۆیانەی لە پشت تازەکردنەوەی شیعرەوەیە، ئەزموونی ژیانە لە شوێنە جیاوازەکاندا. ئەو گۆڕانە پەیوەندی بە گۆڕانی شوێنەوە هەیە. تۆ ئەگەر هەموو ژیانت بە تەنیا لە شارێکدا بەسەر بەریت، مەودای ڕوانین‌و ئەزموونیشت سنووردار ئەبێت. ئەو ئەزموونەی لە یادەوەریدا شوێنی زۆرتری هەیە لەهەمان کاتدا زەمانی زۆرتریشی هەیە، باڵی زۆرتریشی هەیە بۆ فڕین. شیعری بێ شوێن نییە، وەك چۆن شاعیری بێ ناو نییە. ئێمە لە ژیانی خۆماندا ئەوەندەی چاومان لە شوێنەو پێوەی نووساوین ئەوەندە بیرو هەستمان لای زەمان نییە. بەغداو سلەیمانی‌و شاخ‌و سوید، ئەو شوێنانەن هەر یەکەو یادگاری تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام هەر هەموویشیان لەگەڵ یەکداو پێکەوە وەك پلیکانەی پەیژەیەك وان یەك یەکتری تەواو ئەکەن لە پلەی هونەرێکی نزمەوە بۆ پلەیەکی بەرزترو بەو جۆرە تا سەرئەکەوێ.

***چۆن مۆسیقاو ڕیتم لە شیعرو پەخشانە شیعردا دەستنیشان دەکەیت، ئەو مۆسیقاو ڕیتمانەی لە ئەزموونی نووسینت پێگەیشتووی چین. ئایا دەکرێ مۆسیقاو ڕیتمێکی تەواو جیاواز لەناو شیعری کوردی بە ئەزموونی پڕفەرو بەرەکەتی خۆت دەستنیشان بکەیت؟**

ـ لە پێش ئەوەی ئەحمەد فەراهیدی بووبێت، شیعر ئەو ئاهەنگانەی خۆی هەبوو کە ئەم لە دواییدا وەزنە عەروزییەکانی لەسەر بنیاتناون. ئەمریکا هەر هەبوو پێش دۆزینەوەیشی، بەڵام کۆڵۆمبس بینییەوە. زمانی مەجاز واتە شیعر، زمان ناتوانێ باڵی نەبێت، باڵ واتە شەقژنی ئیقاع، چونکە ئەمە یەکەم دیاردەی جیاکردنەوەیەتی لەگەڵ قسەدا. خۆ قسەیش هەیە قووڵەو بەمانایەو هونەریشە، بەڵام بۆیە نابێ بە شیعر، چونکە نەبۆتە مۆسیقاو چونکە ڕۆحی هەڵکورماوە، لە

ڕاستیدا شیعرو گۆرانی بەیەکەوە لەدایك بوون، بەڵام شیعرو قسەی ئاسایی بەیەکەوە لەدایك نەبوون. بەلای منەوە شیعر لە باڵندەیەکی فڕیو و پەخشان لە باڵندەیەکی هەڵنیشتوو ئەچێ. ئەمە جیاوازی نێوان شیعرو پەخشانە. خۆ تەیریش بە هەڵنیشتوویی ناشیرین نییە، یان خەوش نییە، یان مردوو نییە، بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێ، من مەبەستم لە یەك ڕیتمو مۆسیقا نییە، بۆ نموونە من مەبەستم لەوە نییە، ئاهەنگی شیعرێ لە ژمارەیەکی دیاریکراوی بڕگەدا کۆتایی بێت. من لە ئەزموونی خۆمدا بڕگەی (4+4) یان (3+3) یم درێژکردۆتەوە بۆ ژمارەیەکی بێ کۆتایی، بۆ ئەو دێڕانەی کە لە ڕاستیدا دێڕە شیعری تەقلیدی نین، حەز ئەکەم تەماشای (دەربەندی پەپوولە)، یان (ڕەنگدان) یان (خاچو مار) بکەیت، بەڵام دەستبەرداری مۆسیقاو ڕیتم نەبووم، چونکە شیعر بێ فڕینو بێباڵ بەیەکدادان لە فەزایەکی بێسنووردا نابێتو ئەبێ بێتەوە سەر ئەرزو ناو هێلانەکەی. تەنانەت لای من لە هەموو بەرهەمەکانمدا جۆرێك لە قافیەیش ئەبینی، بەڵام خۆیان هاتوون، خۆیان دروستبوونو من لەبەر هیچ زەرورەتێکی شیعری دروستم نەکردوون. تەواو وەك ئەوەی کۆمەڵە زنەیەك لە تەنیشت یەکەوە هەڵبقوڵێن، نەك من بێم هەڵقوڵینی دەستکردیان بۆ دروست بکەم. پەخشان لە دەشت ئەچێتو شیعریش لە بەرزیو نزمی نێو شاخو داخ. ئەوە ئەو بەرزیو نزمیو هەڵچوونو داچوونانەیە ئەگەر خەوشێکیش هەبێ ئەیشارنەوە، بەڵام لە دەشتی پەخشاندا بچووکترین خەوش بەدەر ئەکەوێ، بەڵام خۆ ئەوە عەیب نییە تۆ ناوی شیعر لە دەقەکەت نەنێیتو بڵێی پەخشانە یان دەقێکی کراوەیە یان هەر شتێك.

بە لای منەوە هەر ژانرێکی ئەدەبی سروشتی خۆی هەیە. وەك چۆن هەر درەختێ ڕەنگو ڕووو گوڵو باڵاو بەرهەمی خۆی هەیە. دار هەرمێ، دار هەنار نییە. گوڵەباخ، گوڵە ئەرخەوان نییە. گۆم، ڕووبار نییە، بەڵام لە دەستەی یەکەمدا بە هەموویان ئەڵێین درەختو لە دووەمیشدا پێیان ئەڵێین ئاو. لەناو ئەدەبیشدا ئەم تایبەتمەندیو لەهەمان کاتدا گشتگیریە هەیە. لە هەردوو حاڵەتیشدا ئێمە

مەبەستمان لە ئەدەبی بەرزە، جا پەخشان بێ، یان شیعر. نازانم بۆ ئەبێ ئێمە ئەوەمان بەلاوە کەمبێ بنووسین ئەمە پەخشانە یان پەیڤێکی ئەدەبییە، یان پەخشانە شیعرە. ئاخر پێکهاتەی ژن پێکهاتەی پیاو نییە. واتە لە ڕووی جەستەو ڕەهەندەکانی فیسیۆلۆجیەوە جیاوازن، بەڵام هەردوو ڕەگەزەکە مرۆڤن. بەلای منەوە شیعر ژنەو پەخشان پیاوە! هەمیشە جۆرە ناسکیەك و شەفافیەتێك لە شیعردا هەیە کە لە پەخشاندا نین. لە شیعردا مۆسیقای ڕستەکان بە ئاهەنگن، بڕگەکان ئەبنە هەنگاوی ئەو هەڵپەڕین و ئاهەنگانە، ڕیزی وشەکان وەك کەسانی ناو هەڵپەڕکێیەك یەك یەکتری تەواو ئەکەن. ئاخر ئەو وەختەی باس لە وەزنێ یان ئاهەنگێ ئەکەین، پێویستە بنەما هەبن. یان ئوسوڵێك بۆ جیاکردنەوەی هەڵپەڕکێ لە هەڵپەڕکێی ڕەمەکی. من بۆ خۆم ناتوانم بەبێ جۆرێك لەو ئاهەنگانە شیعر بنووسم. کە لەوە دەرچوو ناوی ئەنێم پەخشان. یان پەخشانە شیعر، یان پەیڤێکی شیعری. ئەمە لە بەهای ئەدەبی ئەو بابەتانەی تر کەم ناکاتەوە. بۆ نموونە ئەنووسم: ***هەور ئەزێ و لە شەفەقا باڵی ئەسپێ دەرئەکەوێ و ئەستێرەیەك سواری ئەبێ و ئەگەنە لام.*** ئەمە شیعرە، چونکە جگە لە زمانەکەی جۆرە ئیقاعێکی تێدایە، بەڵام وەختێ ئەنووسم ***"کە هەورەکە زا لە شەفەقدا باڵی ئەسپێ دەرکەوت و ئەستێرەیەك سواری بوو گەیشتە لام"*** ئەمە پەخشانەو لە هەردوو نموونەکەیشدا هەڵگری یەك مانان بەشی هەرەزۆری ئەو بەرهەمانەی ئەمڕۆ بڵاوئەبنەوە ئەچنە خانەی پەخشان و پەخشانەشیعرەوە ئەشێ بەشێکیشیان ئەدەبی جوان و داهێنەرانە بن. من هیچ بەرهەمێکی شیعری بێ ئاوازم نەنووسیوە لە کورتەوە بۆ درێژ، بەڵام لەهەمان کاتدا بەرهەمێکی زۆری ترم، وەك پەخشان نووسیووە بەلای خۆمەوە هەندێ لەو پەخشانانە لە هەندێکی ئەو شیعرانە جوانترن. ئەمە جیایە لەگەڵ فەزایەك، کە شیعر دروستی ئەکات. ئێمە زۆرجار لاپەڕەی هەندێ ڕۆمان ئەخوێنینەوە وا ئەزانین لەناو جیهانی شیعرداین. من ئەمە ناو ئەنێم "موتوربە کردن" بە شیعر. یان وەکوو ئەڵێن بە زمانێکی شیعری نووسراوە. شیعری کلاسیکی بەهۆی ئاوازی سوارەوە درێژەی بە تەمەنی خۆیداوەو لەبەرکراوەو دەماودەم وتراوەتەوە، ئەمە ڕاستیەکە پێویستی

به لەسەر وەستان هەیە. چونکە جگە لە هێزی دەربڕینو مانا، ئاوازەکە بۆتە هۆی لەبیرچوونەوەیان. شیعری جوانی تازەی بێ ڕیتمو ئاهەنگ دوای خوێندنەوەی، بیر نامێنێ، ناوترێتەوە، بەڵێ "گۆرانی"و "شیعر" جمکنو پێکەوە هاتوون. خۆ ئێمە لە هەر ڕوانگەیەکەوە تەماشای شیعر بکەینو بە هەر تیۆرییەك باسی بکەین وەك دەرئەنجام هەر شیعرمان ئەوێ. ڕەنگە ئەم دەرئەنجامەیش لە چەندین شێوازو ستایلدا دەربکەون.

***تەقینەوەو گەشانەوەی شیعر دەکەوێتە سەرەتا، یان ناوەڕاست، یان کۆتایی. زمان لەم تەقینەوەو گەشانەوەیەدا کاریگەریو ڕۆڵی چییە؟**

ـ دەستنیشانکردنی ئەم حاڵەتانە بۆ شیعر گرانە، چونکە هەر قەسیدەیەك پێکهاتەی تایبەتی خۆی هەیە. جگە لەوەی هەر شاعیرەو جۆرە شێوازێکی خۆی هەیە بۆ سەرەتا و ناوەڕاستو کۆتایی. ئەوە جگە لەوەی بۆ هەردوو وشەی "تەقینەوە"و "گەشانەوە" پێویستیمان بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە. بە لای منەوە هێزی شیعر لە هەموو جەستەی شیعرەکەدایە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، چونکە خۆتان ئەزانن یەکێك لە خاسیەتەکانی شیعری تازە ئەوەیە جۆرێك لە یەکێتی بابەتو بینینی سەرتاپایی تێدایە. ئەمە تەواو بە پێچەوانەی شیعری کلاسیکیەوە یان تەقلیدیەوە، کە لەسەر بنەمای (یەکێتی بەیت) بوو. شیعر ئەگەر ڕووبارێك بێ، هەموو شوێنێکی ئەم ڕووبارە بەیەك تەرزو نەزم ناڕوات. نێرینەی ئاو، ڕەنگە شا شەپۆلی ئەوی تێدابێت. لە شیعری کلاسیکیدا، وەك ئەزانن "بیت القصید" هەبوو، یان بەجۆرێکی تر "شابەیتی" شیعر، کە لە شیعری تازەیشدا نەك لە وێنەیەکدا یان لە کۆپلەیەکدا ئەشێ "لە چەندین وێنەی هەڵبژاردەدا" ئەو شەپۆلە بەهێزانە بدۆزینەوە، بەڵام ئەو گریمانەیە هەر ئەمێنێ لە چەند شوێندا ئەو "گەشانەوەیە زیاترو لەبەرچاوترە" بەشی زۆری سەرەتاکان کلیلنو دەرگا ئەکەنەوە، بە لای منەوە "خەملێن" ناکەوێتە سەرەتاوە. سەرەتا بەرەژانە. شیعری تازە شیعری درامایی واتە وردە وردە بەرەو "تەقینەوەو گەشانەوەکە" ئەڕوات تا ئەو شوێنەی دراماکە تووشی بەیەکدادانە گەورەکە ئەبێو دوایی بەرەو خوار ئەبێتەوە. شیعر زمانە، داینەمۆکە ئەوە. لە هەموو هەڵچوونو داچوونێکدا وزەی زمان، ئەبێتە پێوانەی شاعیری بەهێز، یان شاعیری لاواز.

***ئایا هەوڵت داوە لە ماوەیەکی کورتدا لە شیعرێکەوە بۆ شیعرێکی دیکە زمانی نووسینت بگۆڕیت. ئایا ئەم هەوڵە ئارەزوویەکی کاتیو تەنك بووە، یان ئەزموون پێشنیاری کردووەو پێیگەیشتووە؟**

- "گۆڕینی زمانی نووسین" لە ئەزموونەوە دێت، واتە ئەمە کارێك نییە لەسەر بنەمای هەوەسو ئارەزووی کاتی ئەنجام بدرێت. شێوازی نووسین وەختێ ئەگۆڕدرێت بینینەکانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتبێت لە دوای ئەزموونی دوورودرێژ، شێوازەکەت، ئەبێتە بەشێك لە ڕەنگی چاوتو تۆنی دەنگتو خووە تایبەتییەکانی خۆت. جاری وا هەیە شاعیر تا مردن لەیەك ئەزموونڎا کار ئەکات، بەڵام هەر جارەو، بە وێناو ڕوانگەی تازەوە. ئەوە گۆڕانە، ئەگەر بشبێت لە ماوەی کورتدا ناکرێ، چونکە ئەو "خۆ هەڵشێلانەوە"یە زەمانی ئەوێت، "هەڵوەشاندنەوەو پێکهێنانەوە"ی ئەوێت. من لە کارە درێژەکانی خۆمدا، ئەم گۆڕینی زمانەم ئەنجام داوە، زمانی "دەربەندی پەپوولە" بەو مانایە هەمان زمانی "ئافات" نییە یان زمانی "داستانی بەردەقارەمان" زمانی "ڕەنگدان" نییە، چونکە جیهانەکانیان گۆڕاون. ئاخر ناکرێ فیلمێکی دە دەقیقەییو فیلمێکی دو سەعاتی یەك زمانیان هەبێ! گۆڕانە لەبەرچاوەکان هەمیشە لە ڕووبەرە گەورەکاندا باشتر دەرئەکەون.

***لە بواری چامەی درێژو دەقی کورتدا چالاکیو داهێنانی شیعریت پێشکەش کردووە. ئایا ئاستەکانی زمانی چامەی درێژ لەگەڵ دەقی کورتدا چین؟!**

- با لە پێشەوە ئەوە بڵێم. شیعر بە کورتیو درێژی نییە. بە داڕشتنو شێوازی هونەرێتی، بە زمانو داهێنانە، بە ئەفراندنە. ئەشێ کانیەك وزەی بەخشینی بۆ من لە ڕووبارێ زیاتر بێ، ئەشێ جوانی ژنێکی ڕێبوار لای من زۆرتر بمێنێتەوەو کاریگەریەکەی لە جوانێکی تر بەهێزتر بێو بە سەعاتیش بەرامبەرم دانیشێ. ئەوەی ڕاستیبێ، لە ئەزموونی خۆمدا، وێستگەکانی شیعرم هەمە جۆرن. من لە یەك وێستگەی شیعردا دانەسەکنیوم. هەمیشە لە جووڵەو بزووتندا بووم، کەم یان زۆر، بەڵام بەردەوام خەتەری بەسەرهات لە ڕێگە درێژەکاندایە، چونکە ئەگەرەکان زۆرترن. چامەی درێژیش بۆ شاعیر هەمان شتە، بە مانایەکی تر، ئەمە جۆرێك لە دەسەڵاتی زمانو پشووی درێژو

ئارامو ئەزموونی ئەوێ بۆ ئەوەی چامەیەکی وا بنووسین بخوێنرێتەوەو گوێی لێبگیرێو فرێنەدرێ. ئەم ئەگەرەیان لە کورتە شیعردا کەمترە، واتە خوێندنەوەو گوێلێگرتنی تەنیا ساتەوەختێکی ئەوێ. زمان لە چامەی درێژدا پێویستی بە ئیشو زەخیرەیەکی زۆر هەیە، بە خەیاڵی چەند لایەنەو ڕەنگین، بە گۆڕینی ڕیتمەکان، بە گۆڕینی وێناو تابلۆکان، چونکە چامەی درێژ واتە چامەی فرەڕەنگیش، واتە فرە ڕەنگیی چامەی درێژ، گێڕانەوەو دراما‌ی شیعرییە. لە شیعری سەد دەر سەد پووخت ئەم ڕێگایە نابزوێ. بۆیە پێویستت بە جۆرێك لە هاوکاری چیرۆکە، یان شانۆیە، یان پەخشانە. پێویستت بە زانیارییە جیاجیاکانە. لەبەر ئەوەی تۆ یەك وێستگەو باخچەت نییە، تەنیا بەیەك شەقامدا ناڕۆیت، تەنیا لە یەك پەنجەرەوە تەماشای دەرەوە ناکەیت. ئەمە جگە لەوەی لە چامەی درێژدا ئەشێ لە چەند زەمەنێکدا کار بکەیت، لە ڕێی شەپۆلەکانی هۆشەوە بگەڕێیتەوە، یان لە ڕێی خەونەکانەوە ڕوو لە ئاییندە بکەیت. کورتی چامەی درێژ، وەك کورتەشیعر یەك حاڵەتی کورتو بروسکەئاسا ناگرێتەخۆ، فلاشێك نین، یەك سەرسام بوون نییە بە وێنەیەكو تەواو بێت. چامەی درێژ "ماراسۆن"ی شیعرە ئاخر خۆ هەموو یاریزانێکی ڕاکردن قودرەتی ڕاکردنی ماراسۆنیان نییە. شاعیرەکانیش هەروەها. من بە ئەزموونی خۆم لەوە گەیشتووم "چامەی درێژ" بەبێ "زمانی دەوڵەمەند" نانووسرێ، بێ ئاگاداربوون لە دنیای ڕۆمانو چیرۆكو شانۆ نانووسرێ، بێ خولیاو خەمی گەورە نانووسرێ. تۆ ئەگەر نەتوانی لە چامەیەکی درێژدا، زوو زوو پەنجەرەکان بگۆڕی، هەردووسێ لاپەڕە و، ئاڕاستەکان بگۆڕی. ناتوانی نە بەردەوام بیو نە کەسیش بەردەوام بێ لە خوێندنەوەو گوێلێگرتنێدا.

چامەی درێژ لە ئەزموونی مندا، چامەیەکی سینەماییە واتە بەرجەستەکردنی خەیاڵەکانە بە وێنەو بزواندنی زەینە لە جووڵەیەکەوە بۆ جووڵەیەکی دی. تێکەڵکردنی واقیعو خەونە، بەردەوامبوونی پرسیارە، وروژاندنی هەستو نەستو عەقڵە. زمان لە قەسیدەی درێژدا شێوەی پەلکە ڕەنگینە وەرئەگرێ، نەك هەورە تریشقە. زنە نییە، دەریاچەیە. بەلەمێکی بچووك نییە، کەشتییە. سەفەرێکی کورت نییە، دوورو درێژە. یەك گەمەی شکڵ نییە، چەندین گەمەی جۆراوجۆرە. دیارە ئەوە هەر قودرەتی

خەیاڵیشە لە چامەی درێژدا ئەتوانێ بەردەوام فەزاکان بۆ زمان نوێ بکاتەوە، لە ئاسۆیەکەوە بیگوێزیتەوە بۆ ئاسۆیەکی تر، بەڵام لە شیعری کورتدا، ئێمە لەبەردەم پۆستەرێکداین بۆ یەك ساتەوەخت چاومان ئەقۆزێتەوەو ئیتر هەر ئەوانەیە ڕامان ئەگرێ‌و سەرسامامان ئەکات، یان تێئەپەڕین‌و هەر هەمان ساتیش لەبیرمان ئەچێتەوە، فلاشێکەو لێمان ئەدات، یەك حاڵەتە ئەیبینین، کۆمەڵێ وتەیەو بە خێرایی ڕەت ئەبن‌و بە خێراییش ئەگەنە ئاقارێك، لێدانی زەنگێکە، یان کشانی ئەستێرەیەکە، یاخود دەرکەوتنی کەسێکی چاوەڕوان نەکراوە، یان سەرسامبوونێکە لە بەردەم سیحری زماندا. لە ئەزموونی منیشدا، کەمترین وشەیە بۆ دەربڕینی زۆرترین مانا.

***مانا لە ئاسۆ بنەڕەتییەکانی شیعرەکانی ئێوە، هەمیشە چالاك‌و ئامادەیە، وای کردووە هونەرەکانی شاعیریەتیت تا ڕادەیەك بە ئاسانی هەست پێبکرێت. ئایا دەتانەوێ ئەوە بەشێك بێت لە پێناسەو ناسنامەی شیعریت؟**

ـ بۆ وا نەبێ! لە کاتێکدا "مانا" هێشتا لای ئێمە نەك هەر تێر نەکراوە بە ڕوانینی جیاجیا، بەڵکو تازەبەتازە لە سەرەتای درکپێکردنی ڕەهەندە جیاوازەکانیداین. گیروگرفت لەمەدا نییە ئەگەر "مانا" شیعریەتی خۆی بدۆزێتەوە. بەبێ ئەو شیعریەتە مانا لە شیعردا ئەبێ بە بەیاننامە. یان مانشێت، یان لۆجیکێکی وشك، بەلای منەوە ئەو وەختەی مانا ون ئەبێ فۆرمیش ون ئەبێ، بە واتایەکی تر مەبەستمان لە مانا ئەوەیە تۆ پێویستە شتێك بڵێیت، پەسەند یان ناپەسەند، وەرئەگیرێ یان وەرناگیرێ، ئەم مانایە لە شیعردا زۆرجار لە ڕێگەی وێناکردنەوەـ مەبەستم ئەزموونی خۆمەـ دەرئەکەوێ.

یەکێك لە خەونەکانی ئەدەبی تازەمان بەگشتی، ئەوەیە گەلێ جار خاوەنەکانیان نازانن چی بڵێن یان چۆنی بڵێن. من هۆی ئەم بێ ماناییە بۆ بینینی شڵەژاوو ناڕونی دیدی نووسەر یان شاعیر ئەگێڕمەوە، واتە کە ئەنووسێ هەر لەبەر نووسین ئەنووسێ، نەك بۆچی یان چی ئەنووسێ! بەڵێ من ئەزانم لە "مالارمیە" وە تا بەشێکی زۆری شاعیرانی دنیاش، مانا بەو جۆرەی ئێمە ئەیزانین لای ئەوان نییە، ئەشێ جووڵەو مۆسیقاو سێبەری مانایەك یان هەر شکڵێکی زمان دەرکەوێ، بەڵام من بۆ خۆم بەوە سەرسام نیم‌و ئەو جۆرە قوتابخانە شکڵیانەشم لا گرنگ نییە. ئەزموونەکان جیاوازن.

شیعر مانایەو هونەریشە، زمان‌و مۆسیقایە. زۆرجار شیعرە ئاسانەکان، گرانەکانن. من بۆ خۆتان ئەزانن لە دنیای "زاکیرە"و بەتایبەتی لەناو ڕەهەندەکانی مێژوودا کار ئەکەم‌و یادەوەری‌و زەمینەیەکی لەو جۆرە جێگای هەڵکەندن‌و کارکردنی منن. بێگومان ئەم ئەزموونە پێویستی بە مانایە، بە جۆرێك لە دەربڕینی هەست‌و نەستە، چونکە فەزاکان بۆ خۆیان مانادارن.

"هونەری شاعیرێتی" لەگەڵ مانادا ناکۆك نییە، بۆ نموونە ئێمە ئەو وەختەی قەسیدەی بەردی هەتاوی "ئۆکتافیۆباز" ئەخوێنینەوە هونەرەو مانایشە لە بەرزترین شێوەدا، تەنانەت گێڕانەوەی ئەزموون‌و جۆرە گەشتێکی خودی شاعیریشە، بەڵام بەو زمانەی شیعر پێی ئەدوێ. من لە شیعردا بە زمانێکی گران قسە ناکەم. ناوەندێکم دۆزیوەتەوە، کەوتۆتە نێوان ساکاری‌و ئاڵۆزییەوە، نێوان والاکردنی هەموو دەرگاکان‌و داخستنی هەموو دەرگاکان. ڕونتر بڵێم: من نامەوێ پردی نێوان خۆم‌و گوێگرم یان خوێنەرم ببەستم، بەڵام نایشمەوێ ئەوەندە بە ئاسانی بمخوێننەوە ببم بە جۆرێك لە فۆلکلۆر.. نا.. تۆ بڕوانە بەشێکی شیعرەکانی بۆ نموونە (گارسیا لۆرکا) کە تا ئێستەیش بەهاو جوانی‌و کاریگەری خۆیان لەدەست نەداوە، وەك چۆن مۆنالیزا جوانی‌و زەردەخەنە سیحراوییەکەی هەر ئەدرەوشێتەوەو زیندووەو ماوە. لە شیعری ئەویاندا هونەری مانا سادەیەو بەڵام ڕوون‌و قووڵەو لە هونەری دافنشی دا بەهەمان شێوە لە ڕووخساری جوانێکدا مانا ئاشکرایە، بەڵام لەهەمان کاتدا موجیزەیەك خوڵقاوە.

ئەوەی ڕاستیبێ من تا ئێستە چێژو تام‌و تێڕامان‌و خۆشەویستیم بۆ هونەرێکە، جا شیعر بێ یان پەخشان یان شێوەکاری، لە چاومەوە بۆ هەست‌و نەست‌و بیرم، داگیرم بکا، بەجۆرێك تیامدا بمێنێتەوە ڕاگوزەر نەبێ. وەك بروسکەیەك لێمبداو ناخم ڕاتەکێنێ. من ئێستە لەم جۆرە ئەدەبەو لەناو خۆماندا، کەم ئەبینم. بەشی زۆری بەرهەمەکان، لە پۆلە باڵندەیەك ئەچن لەش‌و باڵ‌و دەندوك‌و خوێندنیان، ڕەنگیان وەکو یەکەو لە یەکتر جوێ ناکرێنەوە. ئێمە پێویستمان بە جیاکردنەوەیە، بە هەمەڕەنگییە. هەڵبەتە لە ڕۆژگاری جیاجیادا مانای زەق‌و زوپیش کەوتۆتە ناو کۆمەڵێ لە

شیعرەکانمەوە، بەشێك لەو شیعرانە بوون بە قوربانیی ناو "سەنگەرەکانی ئازادیی"و لە سەردەمێکدا بە هەر شتێك بوایە. دار، بەرد، چەك، وشە. ئەبوایە بەرگریت لە خۆت بکردایە بۆ ئەوەی بژیت، لەم جۆرە دووڕیانە سەختو چارەنووسسازانەدا "زمان"یش واز لە جوانکارییەکانی خۆی ئەهێنێ، چونکە کاتی ئەوەی نابێ لە بەردەمی مەرگدا خەریکی ماکیاجو خۆ ڕازاندنەوەو تیف تیفدانی خۆی بێ. دەنگە هێورو نزمەکان، خەمو مەراقی تاکەکەسی، بە ناچاری کپ ئەبنو ئیتر هاوارو خەمی گەورەتر لە خۆت، بە دەنگی بەرزو مانای زەقەوە دێنە پێشێ. ئێمە سەرەتای سەرهەڵدانی بەهرەمان ڕێکەوتی ناو ئەو زریانانەی کرد. بە خۆشی خۆمان شیعرمان نەبوو، بەڵام ئەوەیش ئەزانم نەوەی ئەم ڕۆژگارە بەئاسانی لەمە ناگات لەبەر هۆیەکی بچووك ئەویش خۆی تیا نەژیاوە، شیعری تیا نەژیاوە، دەستی بەو ئاگرانەدا نەچزاوە، تووشی ڕاکردنو ڕووکردنە نێو شاخو داخ نەبووە، نازانێ سەرکەوتن لە نەبەردێکدا بۆ ئێمە چی ئەگەیاند؟ پاراستنی لوتکەشاخێ مانای چی بوو؟ دەستکەوتنی کتێبێ بۆ خوێندنەوە لە پەنا بەردێکدا چەند گرنگ بوو! چارەنووسی نادیاری کەسە نزیکەکانت، دایکت، ژنت، خوشکت، برات، هەر هەمووی، لەناو قوڕگی نەهەنگێکدا مانای چی بوو؟! لێرەوە ئیتر ماناکان زەقو لە شێوەی چەکێکی سەرشان، یان سروودێکی گەرم، یان بەردە هەسانێکدا بۆ تیژکردنەوەی بەرگرییتو مانەوەت لە پێشی پێشەوەی هەلومەرجەکاندا بوون. شیعری ئەو ڕۆژگارانە ئەبوو مەشخەڵو سروودو هەڵمەت بێتو بە قوڕگی داستان هاوار بکات.

***پێوەندییەکانی نێوان شیعرو ڕەگەزەکانی تری ئەدەبی وەك ڕۆمان، شانۆنامە، پەخشان، چیرۆك... چیە، ئایا لە ئەزموونی خۆت سوودت لێ بینیونو بنیادی شیعرت پێ فرە دەنگ کردوون؟**

- وەك پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزانێکەو خێزانەکەیش ناوی "ئەدەب"ە. ئەم پەیوەندییە ڕوحیە هەموویان بە دایکی زمانو باوکی داهێنانەوە ئەبەستێتەوە. بەستنەوەی ناچاری نا، بەڵکو تێکەڵاوبوونو دەوڵەمەندکردنی هەر ئەزموونێ لەو ئەزموونانە بەجیاو بەسەر یەکیشەوە، بەرفراوانکردنی دنیای ئەفراندن. سنووری جوگرافیای زمانی هەر ڕەگەزێکیش لەو ڕەگەزانە وەختێ

کاڵبوونەوەو شەرتو قەیدەکانیان دەستیان بە ڕەوین دەکرد، کە ئیتر بینینی مرۆڤ بۆ ژیانو هەموو شتەکان لە گۆشەگیریو دەمارگیرییەوە کەوتە نێو فەزایەکی بێ سنوورەوە. بازگەی قەدەغەکان کەم بوونەوە، یان هەڵگیران. زمانی پاوانکاری لە ئەدەبدا بەهایەکی نەما. ئەم پەیوەندییە تازانە لە ئەنجامی پەیوەندییە تازەکانی ژیان خۆیەوە سەریانهەڵدا. هەر ڕەگەزێکیش لەو ڕەگەزانە گۆڕانی بەسەردا هاتو بە شێوە کۆنەکەی جارانیان نەیان ئەتوانی بەردەوام بن.

ڕۆمان هەستی کرد بەو زمانە وشكو مەنتیقیەی خۆی خوێنەر ڕازی ناکات بۆیە لە شیعرەوە وزەیەکی وەرگرت. پێویستی بە بارانەکەی ئەو بوو بۆ پاراوکردنەوەی خۆی. شیعر هەستیکرد نوقمبوون لە خەودا بە تەواوی لە واقیعی دەوروبەرو مرۆڤی دائەبڕێ، بۆیە پێویستی بەوە بوو شتێك لە مەنتیقی چیرۆكو ڕۆمان وەرگرێو بکەوێتە نێوەندێکی واوە کە خەونو واقیع ئاوێتەی یەکتری بکات.

ئەو شێوازی واقعییە سیحرییەی کە ئەمڕۆ باسی ئەکرێ، ئەوە زمانی شیعرە لەناو ڕۆماندا، ئەفسانەی زمانی ئەمە لەناو ئەودا، شیعری دراما قەرزاری فرە دەنگی ناو چیرۆكو جووڵەی بەردەوامی شانۆنامەیە. ئەگەر خەونی شیعرو زمانی چڕوپڕی ئەو نەبوایە، شانۆنامەکانی "چیخۆف" نەئەبوون بە گەورەترین وەرچەرخان لە شانۆی دنیادا. "دەقی کراوە یان والا" کە لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا خەریکە ڕووبەرێکی گەورە لە جیهانی ئەدەبدا بۆ خۆی بگرێت، مانای جەوهەری لەمەدایە کە ئەو تێکەڵاوبوونە لەنێو ئەو ڕەگەزانەدا گەیشتۆتە ئاستێکی نکوڵی لێنەکراو.

من پێموایە شیعری پاشەڕۆژ هەر ئەبێ ڕوولە دەقی والا بکات، چونکە لە دەقێکی والادا هەموو ڕەگەزەکان جیا بەجیا هەن و، بەڵام لەهەمان کاتیشدا هیچیان نین، ئەشێ بەشێك لە دەقی کراوە، پەخشان بێ، بەشێکی تر شیعر بێو پەرەگرافێك کورتە چیرۆكو دوابەدوای ئەویش دیمەنێکی شانۆنامە، یان هەر هەموو لەناویەکدا بنو جیاکردنەوەیان بۆ نەبێت. هەروەها لە دەقێکی والادا ڕەنگە بکەوێتە ناو دەقی پەخشانەوەو ببیات تا ئەتداتە دەست بناری چیرۆکێكو ئەوسا ئەگاتە ناو شاخو داخەکانی شیعرەوەو بەو جۆرە زمان لە شوێنێکدا ئەبێ بە زمانێکی وەزندارو قافیەدار.

درێژەی ناداتێ‌و لەولای ترەوە ئەبێتە پەخشانە شیعرێ کە پابەندی هیچ جۆرە وەزن‌و قافیەیەك نییە.

بە کورتی دەقی کراوە ئەو کەژاوەیەیە، کە هەموو شتەکانی تێدایە. بێگومان هەروەکو پێشتریش ئاماژەم بۆ کردبوو، سوودم لێ بینیون بە تایبەتی لە ڕۆمان‌و چیرۆکە ڕۆمان بەردەوامبوون‌و هونەری دیالۆگ‌و خوێندنەوەی ناخی مرۆڤی فێرکردووم. گۆڕینی خێراخێرای وێستگەکانی تازەبوونی لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر فێرکردووم. لە کورتە چیرۆکدا کۆتایی سەرسامکەر –مەبەستم لەو چیرۆکانەیە کە بە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو کۆتاییان دێت- کاریگەرییان هەبووە لەسەر ئەو کورتە شیعرانە، کە لە خاڵی داچڵەکینێکدا زەنگێك لێئەدەن‌و ئەبنە هەوێنی شیعرەکە.

هەروەها لە هونەری شێوەکارییەوە، یان سینەماوە گونجاندنی ڕەنگەکانی ناو زمان لەگەڵ یەکترداو لەویشیانەوە مۆنتاژکردن فێربووم. سەردەمی تازەو تەکنەلۆجیای تازەیش ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە لێك نزیککردنەوەی ئەو ڕەگەزانەوە لە یەکتر. ئێستا بونیادی شیعر بە تەنیا پشت بە بونیادە تایبەتیەکانی خۆی نابەستێ، بەڵکوو بۆتە بونیادێك هونەرەکانی تریش لە مشت‌وماڵکردن‌و زاخاودانەوەو داڕشتنەوەو جوانکارییەکاندا دەوری لەبەرچاو ئەبینن. شیعر قوللەی گۆشەگیرو تەکیەکەی جارانی خۆی بەجێهێشت زمان پێویستی بە ڕەنگ‌و دەنگ‌و جووڵەی ناو شانۆو هەموو ئەو ژانرانەیە کە فەزای ڕەنگینترو زەمینەو کێڵگەی بەپیتتر دەکەن.

***تەوژم‌و جووڵانەوەو ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی وەك: دادائی، سوریالی، وجوودی، ئاینده‌خوازی، ڕۆمانسی، هەستی، واقیعی جادوویی... وەك تاڵە دەزوویەکی باریك دێنە ناو شیعرەکانت‌و دەمێننەوەو بزر نابن. کەچی هیچیشیانت بە تەواوی وەرنەگرتووە. ناوەندێکی گونجاندنی سەرسوڕهێنەر لە هەیکەلی شاعیریەتیت پاتتاییەکن بۆ بەدواداچوون‌و بیرکردنەوە. لە تەوژم‌و جووڵانەوەو ڕێبازە شیعرییەکان دەچیتەوە سەر کامیان؟**

ـ شاعیر بریتییە لە بەهرەو خوێندنەوەو ئەزمون. هیچ شاعیرێ نییەو نەبووە لە دنیادا بە تەنیا خۆی خۆی خوڵقاندبێ. ئەگەر خوێندنەوە نەبێ، نووسینی لە شوێنێکدا ئەوەستێت، ئاوی ژیانی نایەتە سەرو وشك ئەبێتەوە. ئەزموونیش

قاڵبوون‌و ڕاهاتن‌و پەند وەرگرتن‌و فێربوون لەوانی ترەوە، لەسەدا حەفتا زیاتری وزەی نووسینی هەموو نووسەرو شاعیرێ لەو گەنجینانەوە دێت کە هی عەقڵ‌و ئەزموون‌و بەرهەمی هونەرمەندانی ترن. ئەگەر دنیای ڕۆمانسییەکان نەبوایە دنیای سوریالیییەکان نەئەبوو. ئەگەر (عەزراپاوەند) نەبوایە (ئیلیەت) نەئەبوو. ئەوە (مەولەوی)و (پیرەمێرد)ن لە پشت (گۆران)ەوە ئەیانبینین. ئەوە (حاجی قادری کۆیی)یە لە پشت (بێکەس)ەوە ئەیبینین. بەڵێ ئەشێ لە نێو بەرهەمەکانی منیشدا لێرەو لەوێ چاوت بە وێنە سوریالیییەکان بکەوێ، یان ڕووبەڕووی سرووشتی ڕۆمانسییەکان ببیتەوە، ئەمە ئاساییە، چونکە شاعیری بێ پاشخان نییە. بەڵێ ئەو تیلماسکانە هەن، بەڵام هیچ کامێکیان دایان نەپۆشیوم‌و نەیانکردووم بە سێبەری خۆیان. من ڕوخساری شیعری سەرەتام بە تایبەتی لە دیوانەکانی (تریفەی هەڵبەست)، (کەژاوەی گریان)دا لە "گۆران"ەوە نزیکبوون. زمانی شیعرم زمانی ناو فەرهەنگی ئەو بوو. لە کۆمەڵێ قەسیدەی "من تینوێتیم بە گڕ ئەشکێ"و لەو فەرهەنگ‌و زمان‌و وشانە جیابوومەوەو لە قەسیدەی (کۆچ)ەوە ئیتر بە تەواوی بووم بە خۆم لە دیوانی "کازیوە"وە ڕێگام دۆزیەوە. لە چیرۆکە شیعرەکانی "ڕووبار"ەوە مەودای ڕوانینی تازەترم بۆ ئەزموونەکەم زیاد کرد. لە "دەربەندی پەپوولە"و بەدواوەو تا ئێستا خاوەنی چەندین ڕووبارە شیعرم. تۆ ئەوەیشت لەبیر نەچێ هەموو تەوژم‌و جووڵانەوەو ڕێبازە جۆراوجۆرەکان، شاعیران‌و ئەفراندن دروستیانکردوون‌و دواتر پەرەیان سەندووە.

بەڕاستی شاعیری تەواو لە هەموو دنیادا ئەو شاعیرانەن کە تەوژم‌و شەپۆلەکان بەریان ئەکەون لێیان ئەدەن، بەڵام نایانبەن، چونکە خۆیان بوونەتە تەوژم‌و شەپۆل‌و هەر خۆشیان بوونەتە کەناریان. بەڵێ ئەو تێکەڵییە لە هەمووماندا هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە نەبین بە هیچ کامیان. بەمجۆرە من ناچمەوە سەر هیچ ڕێبازێکی دیاریان، بەڵام لەهەمان کاتدا ڕۆحی هەمووشیانم تێدایە.

***هەندێك شیعریان بۆ شیعری (چێژ)و شیعری (ڕوئیا)و شیعری (مەعریفی) دابەشکردووە. ئایا (بەهرە) لەم دابەشکردنە، ڕۆڵی چییە؟**

ـ ئەتوانی زنجیرەیەك لەم دابەشكردنانە بنووسیت: شیعری دەروونی، شیعری شكلانی، شیعری سیاسی، شیعری وجودی، شیعری ڕۆژانە، ...هتد، بەلاَم ناتوانیت بلێیت "شیعری بێ شیعر"، چونكە سیفەتەكان هەرچییەك بن با ببن، بەلاَم وەك دەرئەنجام مەسەلە جەوهەریەكە ئەوەیە "شیعرن، یان شیعر نین" كێشەكە لەوەدا نییە شیعرەكە بۆچی نووسراوە، بەڵكو لەوەدایە چۆن نووسراوە. ئەشێ هەر لەیەك قەسیدەدا "چێژ"یش‌و "ڕوئیا"یش‌و "مەعریفە"یش كۆببووبێتەوە. بۆ نموونە من لە "وێرانە خاك"ی ئیلیەتدا هەموو ئەو خاسیەتانە ئەبینم. بەهرەی بناغەكەیە، یان سەلیقە سروشتییەكەیە. یان نەهێنییەكی ناو پێكهاتەی مرۆڤە. بەهرە وەكو دەنگخۆشیەكە لە مندا هەیەو لە تۆدا نییە، بەلاَم پرسیارەكە لێرەدا كۆتایی نایەت، چونكە دەنگخۆش لەدوای ئەم بەهرەیەوە پێویستی بە پەروەردەكردنی دەنگەكەو فێربوونی مۆسیقاو ئەدای چاك هەیە، ئەگەرنا، ئەو دەنگە ئەكەوێ، با خۆشیش بێ. بەهرە تا بەشێكی ڕێگەكە لەگەڵیایە ئەویتری بۆ چەندین هۆو هۆكاری دیكە بەجێئەمێنێ كە تۆ خۆت خوڵقێنەری بۆ ئەوەی ئەنجامی ئەدەیت یان نایدەیت.

ڕوونتر بڵێم بەهرە سروشت یان خودایەك بە تۆی بەخشیوەو نەیداوە بە هەموو كەس، ئەمە تۆ خۆت هەڵت نەبژاردووە، بەلاَم لە دوای ئەم بەخشینەوە چی لە بەهرەكەت ئەكەیت، چۆن ئەیپارێزی، چۆن گەشەی پێئەدەیت، چۆن گەورەی ئەكەیت؟! ئەمە لای خۆتە نە لە لای سروشتەو نە لە لای خودایەك. بەهرە زەمینەیە، بەلاَم ئەوەی لە زەمینەكەدا ئەیكەیت چین‌و چۆنن؟ بەهرە دەوری لەم دابەشكردنانەدا نییە، ئەوە بە شێوەیەكی گشتی، "بەهرەیە بۆ شیعر" نەك بۆ خانەیەكی شیعر، یان یەك نموونەی دیاریكراوی دیاریكردنەكان، ڕەنگرێژیەكان، ئەو خانووو باخچەو هەوارانەی كە تۆ لەسەر زەوی بەهرە دروستیان ئەكەیت پەیوەندییان بە ڕووناكبیری‌و ئەزموونی خۆتەوە هەیە.

***نزیككردنەوەیەكی شیعر لە پەخشان دەبیندرێت، ئەو بنەما ئەدەبییانەی كە شیعر لە پەخشان جیا دەكاتەوە، كامانەن. ئایا ئەو شیعرەی لە پەخشان نزیككراوەتەوە دەتوانێت لەسەر ستوونی شیعری پەتی بووەستێت؟**

- پێموایە لە پرسیارێکی پێشووتردا هەندێ ئاماژەم بەم دیاردەیە کردبوو. ئێستا "شیعری پەخشان" خەریکە ئەبێتە شێوازی زاڵی ئەم سەردەمە. واتە ئەو پەخشانە شیعرانەی خۆیان بە هیچ مەرجو تاریفێکی "عەروزی‌و تەفعیل"ەوە نەبەستۆتەوەو لە فەزایەکی ڕەهادان‌و "زمان"یش لە ئەسپی بێ جڵەو ئەچێ! من بۆ خۆم پێموایە ئەوەی شیعر لە پەخشان جیا ئەکاتەوە ئەمانەن:

**یەکەم:** مۆسیقاو ڕیتمی بڕگەو ڕیتمەکان.

**دووەم:** مەنتیقی عەقڵی لە پەخشاندا بە ئەندازەیەك زۆرترە وەك لە شیعر.

**سێیەم:** شەفافیەت لە شیعردا لە خەون‌و لە پەخشاندا لە بێ ئاگابوونەوە ئەچێت.

**چوارەم:** لەبەر ڕۆشنایی یەکەمدا شیعر ئەبێتە گۆرانی‌و لەبەر ئەکرێ‌و ئەوترێتەوە، بەڵام پەخشان نا.

**پێنجەم:** پەخشان لە گشتگیرییەوە نزیکترە، بەڵام شیعر لە تایبەتمەندییەوە.

ڕەنگە ئەم خاڵانە جێی مشتومڕ بن‌و هەمووومان لەسەری ڕێکنەکەوین، یان سنووری تر هەبن. یان لای هەندێك جیاوازییەك نەبێت، بەڵام بەلای منەوە دوو هەڵقوڵینن یەکێکیان لە شێوەی قەڵبەزەو فوارەداو ئەویتریان لە شێوەی بڵاوبوونەوەیەکی بێ تخووبدا. دیارە لە هەردوو نموونەکەدا جوانیی ئەبینین‌و هەست بزوێنییان تێدایە.

***ئیلتیزام لە ئەدەبدا چ ئاست‌و ئاڕاستەیەك وەردەگرێت، لە ئەزموونی شیعریتدا ئیلتیزامێکی پتەوت بە بیروباوەڕی سەربەخۆیی‌و ئازادی مرۆڤی کوردو کوردایەتی بێگەردەوە هەبووە، هۆیەك بووی بۆ جۆشدان. ئایا شۆڕشی کورد چەند بەو ئیلتیزامەی زانیوەو کاری پێکردووە، لە کاتێکدا ئیلتیزامکردن بە شتێکەوە پێویستە بەرامبەر بەو ئیلتیزامە بزانێت‌و سوودی لێ ببینێت؟**

- ئەوانەی هەموو ئیلتیزامێکیش ڕەت ئەکەنەوە، دواجار هەر ئیلتزامیان بەو زمانەوە هەیە کە پێی ئەنووسن، ئیلتیزامیان بە ناوی خۆیانەوە هەیە کە لە سەروو بەرهەمەکانیانەوە ئەینووسن. ئیلتیزامیان بە کۆمەڵێ بەهاوە هەیە یان

تەنانەت ئیلتیزامیان بەبێ ئیلتزامیەوە هەیە. ژیان لە ئیلتیزام بەتاڵ ناکرێتەوە، چونکە هەموو پەیوەندیەك لە ژوورەکانی خۆمانەوە بۆ دەرەوەی خۆمان بۆ پەیوەندی ڕۆژانەمان لەگەڵ ئەوانیتردا هەر پەیوەنداری ئەگەیەنێ. مادام لە ژیاندایین هەریەکەمان مولتەزیمە بە کۆمەڵێ نەریتەوە، پێشکەوتوو یان دواکەوتوو، ئایینی یان نا ئایینی، ئایدیۆلۆژی یان نا ئایدیۆلۆژی. ئەوانەی هەر هیچ ئیلتیزامیان نییە مردووەکانی سەر قەبرانن، بەڵام ئەم ئیلتیزامە لە ئەدەبدا چۆن! هەر کاتێ ئەم ئیلتیزامە شێوەی ئیلزامی وەرگرت ئەدەبەکە ئەبێتە ئەدەبی زۆرو سوخرەکێشی. ئەم جۆرە ئیلتیزامە ئەگەر لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیەتێکدا، یان حزبێکدا بێ، کە بە فەرمانکردن بەڕێوە بچێ‌و لەسەر بنەمای "داواکردن"و دوایی "جێبەجێکردن" بێتە کایەوە، ئەوە بەلای منەوە ئەدەبی وەزیفەیە. بە سروشتی لەدایك نابێ‌و بە عەمەلیەتێکی "قەیسەری ئاسا" بە وجود دێت، بەڵام ئەگەر خودی شاعیرو سەری خۆی‌و دڵی خۆی سەرچاوەکان بن. من بۆ خۆم ئەو ئەدەبە بە ئەدەبێکی سروشتی ئەزانم ئینجا دوای ئەوە ئەشێ باس لەوە بکەین شیعرە، یان نا. ئەدەبە، یان نا.

لە لایەکی تریشەوە ئیلتزامکردن هەیە بە مەسەلەوە. مەبەستم لە مەسەلە ئەوەیە چوارچێوەیەکی ئایدیۆلۆژی نییە، وەك ئەوەی ئیلتیزاممان بە ئازادییەوە هەبێت یان بە خاك‌و وڵاتێکەوە کە لە هەردوو حاڵدا ئەمانە لە سەروو سەقفێکی دیاریکراوی حزبی‌و ئایدیۆلۆژیەوەن. بۆ نموونە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا زۆربەی زۆری شاعیران‌و نووسەرانی فەڕەنسا لە سوریالییەکانەوە بۆ مارکسییەکان شاعیرو نووسەری موقاوەمەت بوون دژی نازیە داگیرکەرەکان. چ بریتۆن‌و چ ئاراگۆن‌و چ سارتەرو چ کامۆ، ئەمانە هەموویان، ئیلتیزامیان بە "ئازادی"و بە "فەڕەنسا"وە هەبوو. ئیلتیزام بە مرۆڤایەتییەوە. بە جوانییەوە بۆ ئەوەی نەکوژرێ. ئیلتیزام بە دارستانەوە بۆ ئەوەی نەسووتێنرێ. ئەتوانی ئەم نموونەیە بچووك بکەیتەوە بۆ شیعری من بەتایبەتی لە نێوانساڵانی (1980ـ 1990) کە زۆربەی زۆری شیعرەکانی "کەشکۆڵی پێشمەرگە"م تیا نووسیوە.

بەڵێ ئەو شیعرانە بۆ جۆشدانن تا مرۆڤ لە ئاست سەربڕینی میللەتێکدا دەستەوەستان نەبن. ئەو دەمە تاریکستانێ بوو چاو چاوی تیا نەئەبینی ئێمەومانان هەندێ مۆمی شیعرمان تیا هەڵکرد. نەئەکرا دەست بە کڵاوی خۆمانەوە بگرین لە کاتێکدا شیعریان لە چاوی منداڵو خۆشەویستیدا ئەکوشت، بەڵێ ئەو شیعرانە لە ڕۆژگاری شۆڕشدا چ لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلوول‌و چ تازەیشدا "بریتی بوون لە کۆمەڵێ وشە بۆ ئەوەی گوڕو تینێك بدەن بە گیانی ئەوانەی دەستەو یەخە لەگەڵ مردندا ئەجەنگان". من ئەو شیعرانەم بۆ ئەوە نەئەنووسی تا شۆڕشی کورد بەوە بزانێت، یان نەزانێت. من سروودم ئەخوێندو لە پێش هەموو کەسێکیشدا بۆ خۆم‌و ئینجا بۆ ئەوانی تریش. هەبووە پێی زانیوەو هەشبووە پێی نەزانیووە. زەمانەکە سەخت‌و دژوار بوو. من هەر قەڵەمم هەبوو. پیاوی ناو سەنگەر نەبووم‌و تا ئێستەیش نازانم تفەنگ چۆن ئەتەقێنرێ، بەڵام بە بەرچاوی خۆمەوە ئاگریان لە گوندو مەزراو منداڵو ژن‌و دنیا بەرئەدا. ئاخر منیش ئەبوو شتێك بکەم. ئەوەی بەمن ئەکرا وتنی ئەو شیعرانە بوون، کە کوورەی موقاوەمەتەکەیان دائەگیرساند. من دەسرۆکەیەکی ئەو کوورەیەم لابوو بۆ جۆشدان‌و هیچی تر. ڕەنگە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو، کە ئەو ڕۆژگارانەی نەدیوە. یان شاعیرێکی لاو کە چاوی بەو کارەساتانە نەکەوتووە، لە ئێستەدا پێکەنینیان بەو شیعرانە بێت، ئەشێت، بەڵام ئەو شیعرانە لە کۆڵە پشتی هەزاران پێشمەرگەدا بوون. ویردی سەر زمانیان بوون بە قەد مەتارەکانی لاقەدیان خۆشیان ئەویستن، چونکە بەشێك بوون لە هەست‌و نەست‌و گریان‌و پێکەنینی ئەو ڕۆژگارانەیان. من ئەزانم ئەوانە شیعری حەماسئامێز بوون، دەمامکێکی هونەریان نەبوو، بەڵام لەو کاتانەدا ئەوە عەشق بوون‌و ئەسووتان. برین بوون‌و خوێنیان لەبەر ئەڕۆیشت.

شیعر سوودێکی ڕاستەوخۆی دیاریکراوی نییە. ئەو لە دەرووندا گەرای خۆی دائەنێت. بۆ ئەو شیعرانەیش ورەیەکی تری ڕۆژی تەنگانەیە ناهێڵێ ئاگرەکە سارد بێتەوە. ئەوەی لەو کاتانەدا لای من بە پلەی یەکەم ئەهات، چۆن بگەنە

دەستی جەنگاوەرانی ئازادی‌و بیخوێننەوەو دەستاو دەست‌و دەماودەم بکەن، من لەو سەردەمانەدا، ئیلتیزامم بەو خوێن‌و دووکەڵ‌و فرمێسکانەوە هەبوو کە لە جەستەی کوردێکی هەژارەوە فیچقەی ئەکردو یان لە چاوی دایکی قوربانییەکەوە هۆن هۆن ئەڕژا.

***لە شیعری نوێدا کورتبڕی لە وشەو چڕبوونەوەی وێنەو جۆرێك پێوەندی لە نێوان شیعرو شێوەکاریدا هەیە. شیعر لە وەسف‌و شتی زیادەڕۆیی خۆی بە دوورگرتووە. بە هەمان شێوە، شێوەکاریش گەیشتووە بە چڕکردنەوە لە ڕۆشنایی، لەم بارەیەوە ڕوانینت چۆنە؟**

ـ ئەمە لە سەرێکەوە ڕاستەو لە سەرێکی دیکەوە نە ‌ء چونکە نابێ، شیعری نوێ بە تەنیا ئەو دیوەی هەبێت. یان هونەر بە گشتی بۆ کورتبوونەوەو چڕبوونەوە، یان هەناسە درێژی بگەڕێنینەوە. هەردوو حاڵەتەکە هەیە، هەردوو ڕێگەکان هەر هەن کورت‌و درێژیش، چڕبوونەوەو پەلهاویشتنیش. سەبارەت بە هونەری شێوەکاری‌و شیعر، ئەمەوێ بەر لەوەی پەیوەندییەکانیان باس بکەم ئەوە بڵێم هونەری شێوەکاری هونەری بینینە، واتە ئەو وەختەی چاو ئامادەیی نییە هونەری شێوەکاری ونە، بەڵام شیعر با چاو ئامادەبوونیشی نەبێت شیعر لە ڕێی گوێیەوە حازرە، بەم پێیە ئەویان هونەری بینین‌و ئەمەیان هونەری بیستنە، بەڵام هەمیشە لە نێوان چاوو گوێدا پەیوەندیەکی دینامیکی هەبووە ئەم پەیوەندییە خۆی لە ڕێی دەنگ‌و ڕەنگەوە دەرخستووە. زمان ئەتوانێ لە ڕێی وێناکردنەوە تابلۆیەك لەناو خۆیدا بنەخشێنێ بەو جۆرەی وێنەکێشێ ئەیکێشێ لە ڕێی گوێشەوە یان خوێندنەوە ئەم تابلۆیە بگوێزرێتەوە بۆ ناو زەینی گوێگرو خوێنەر، هونەری شێوەکاریش ئەتوانێ وێنەیەکی ناو زمان، یان جووڵانەوەیەکی، یان خەونێکی لە ڕێی ڕەنگەوە بگوێزێتەوە بۆ ناو تابلۆیەك. کەواتە ئەتوانین بڵێین ڕەنگ، هێڵ، بۆشایی، ڕووناکیی زمانێکی بینراون لە دنیای تابلۆدا، یان بە پێچەوانەوە، زمان، پیتەکان‌و وشەکان‌و ڕستەکان تابلۆیەکی بیستراون لەناو شیعردا. تابلۆی شیعری لەلای وێنەکێشێ ڕەهەندێکی نییە واتە ئەو خەون‌و زمانی مەجاز بە ڕەنگ ئەکێشێ. سنورەکانی نابینرێن‌و بەدەیان مەودا ئەگرنە

خۆ. تابلۆی هونەری شێوەکاری لە تازەگەریدا سوودی زۆری لە شیعرو دنیای شیعر بینیوە واتە لەگەڵ سەرهەڵدانی شیعری تازەدا ڕەهەندو ماناو ڕەنگەکانی هونەری شێوەکاریش گۆڕانیان بەسەردا هات. یان بە پێچەوانەوە شیعریش هونەری شێوەکاری لە ئاستە بەرزەکانیدا کرد بە سەرچاوەیەکی زیندوو بۆ خۆی. چڕبوونەوە بە تەنیا لە کورتکردنەوەدا نین ئەشێ شیعرێ کورتیش بێ و، بەڵام چڕوپڕ نەبێ. هەروەها درێژبوونەوەیش بە مانای پێچەوانەی چڕبوونەوە نایەت. بۆ نموونە دەیان قەسیدەی درێژ هەیە، بەڵام چڕوپڕیشە. هەڵبەت ئەم حاڵەتەی دواییان دەگمەنە یان کەم دەسەڵات هەیە ئەو سیحرە بەردەوامەی تێدابێ، لەبەر ئەوەی شیعری پوختو درێژیش لەهەمان کاتدا، ئەگەری داڕووخانی زیاتر لەبەر دەمەوەیە، وەڕسبوون، خۆ نەگۆڕین، دووبارە بوونەوە، بەڵام لە شیعری کورتدا ئەگەر چڕوپڕ بن، ئەم ئەگەرانە کەمترن. کەواتە ئێمە لەبەردەم وشەو ڕەنگداین، پەیوەندیەکە پەیوەندی نێوان وشەو ڕەنگە. فەرهەنگی ڕەنگەکان کەم نین، بەڵام فەرهەنگی وشەکان زۆرترن. ئەو وەختەی زمان ئەڵێ سپی یان ئەنووسێ سپی سپێتییەکە بەچاو نابینین، بەڵام لە شێوەی شتە سپییەکاندا دێنە بەرچاومان، بەڵام لە سروشتو لە هونەری شێوەکاریدا ڕاستەوخۆ سپێتیەکە ئەبینین.

بێگومان هەموو ئاقارە هونەرییەکان خۆیان لە زمانە زیادو ڕەنگە زیادو دەنگە زیادەکان دوور ئەخەنەوە. دەستە دوورو درێژەکان لە شیعردا وەك زمان ماندوو ئەکەنو ئەکەونە ناو لاڕێو توونو توونێکەوە، کە هیچ شتێ بە دوای خۆیاندا ناهێنن، لەهەمان کاتدا ئەبنە هۆی بێزارکردنی خوێنەرو گوێگر. هەروەها لە هونەری شێوەکاریشدا هەمان خۆپوختکردنەوەو چڕبوونەوە هەیە، ئەشێ تەنیا ڕەنگێك ببێتە چەندین ڕەهەند لە تابلۆیەکدا. بە کورتی ڕۆژی سیخناخبوونی ڕەنگو زمانو درێژدادڕیو وەسفی ناپێویست بەسەرچووە.

*ژیانی یێکەس لە ئەزموونت ئامادەبوونێکی دیارو تایبەتی هەیە، زۆر دووبارە دەبێتەوە. لە هەندێك دەقدا وەك ژیاننامە دەمێنێتەوەو نابێت بە وێنەی شیعریی. ئایا وەك گەورەیی باوك دەیهێڵیتەوە، یان حاڵەتەکە وات لێدەکات بەجێبیێڵیتو نەیگەیەنیتە ئاستی وێنەی پڕ بزاوت؟

- وایە، چ (بێکەس)و چ (شەفیقەی) دایکم لە شیعرەکانی دە ساڵی ڕابوردوودا زوو زوو دێنەوە لام، بەڵام هاتنەوەکان چوونیەك نین. هەر جارەو بە شێوەیەك، هەر شێوەیەکیش بۆ خۆی زمانێکی جیای هەیە. بۆ نموونە لە شیعری (27) جاردا (بێکەس) لە شێوەی هەڵۆیەکی سپیو ئەدمۆنس لە شێوەی جرجێکی ڕەشدا دەرئەکەونەوە، بەڵام لە خاچو ماردا بێکەس وەك خۆی چۆن بووە بەو جۆرە دێتەوە. هەر قەسیدەیەك کەشو ئاوو هەوای خۆی هەیە، خاچو مار ژیاننامەیەکی شیعری بە گێڕانەوەیە، چیرۆکە شیعرە، ئەم فۆڕمە ئەو وێنەیەی ئەوێ، بەڵام تۆ ئەگەر بە وردی تەماشای ئەو ژیاننامەیە بکەیت (بێکەس) تێکەڵ بە سروشت ئەبێتەوە. یان جێی کۆمەڵێ سومبۆڵ ئەگرێتەوە. لێرەدا نەچوومەتە ناو زمانێکی تەجریدییەوە، واقیع خۆی هاتۆتەوە بەو شێوەیەی بێکەسی تێدابووە، چونکە من شیعری پوختم نەنووسیوە. لە ئەفسانەیەك نەدواوم، ژیانو بەسەرهاتی مرۆڤێك باس ئەکەم، بەڵام مەبەستم بووە نەبێتە پەخشانێکی ڕووت. وەك بێتەوە بیرم لە کورتە شیعرێکی کورتدا (بێکەس) لە ئێوارەی شەشی ئەیلولی هەموو ساڵێکدا دێتەوە ماڵەوە، بەڵام لەگەڵ پەڵە خوێنێکدا دێتەوە. بەڕاستی ئەگەر خوێنەرێ ئاگای لەوە نەبێ کە بێکەس سەرکردەی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلول بوو، لە سلێمانیو لەو ڕاپەڕینەدا بریندار بووەو گیراوە. هیچ جۆرە چێژێکی شیعرەکە ناکات. ئاخر ژیاننامەیەك مێژوونووسێ یان ئەدیبێ بە نووسینی ئاسایی بینووسێ جیایە لەو ژیاننامەیەی شیعری بێو لەم حاڵەتەیشدا مەحاڵە بێ وێنەی شیعری بێت. من ئێستا دەقەکەم لە دەستدا نییە ئەگینا بێکەس بووە بە دەیان وێنەی شیعری. تۆ بۆ خۆشت ئەزانی شیعری من بە کورتو درێژەوە ئەگەر وێنەکانیان لێدەربێنی هیچی وایان تێدا نامێنێتەوە. وێنەی پڕ بزاوت ڕەنگە لای تۆ بە جۆرێكو لای من بە جۆرێکی تر تەفسیر بکەین.

***شاعیرانی هەفتایەکانو هەشتایەکان خۆیان بە دوور گرتووە لە بەکارهێنانی وشەو دەستەواژەی بێگانە. ئەمە یەك لە کارە جوانەکانی نووسینە، کەچی لاوانی ئەم دواییە زۆر پەنا دەبەنە بەر وشەی بێگانە، لەوانەشە ئەم وشانە هیچ کارلێککردنێکی گیانی لەگەڵیدا نەکردبێت تەنیا وەك لاساییکردنەوەیەکی بێ بنەما بەکاری بهێنێت. دەکرێت لەسەر ئەم دیاردە ناشیرینە قسەت هەبێت؟**

ـ زمانی نووسین زمانی قسەکردنی ئاسایی نییە. ئینجا هەموومان ڕۆژانە لە کاتی ئاخاوتندا دەیان وشەی عەرەبی بەکار ئەهێنین، بەڵام ئەو کاتانەی ئەنووسین بە زمانی ئەدەبی ئەنووسین. مێژووی زمان ئەمەی دواییان ئەبێتە بەڵگەی بوونو مانەوەی. هەر ئەمەیشە جیاوازی نێوان نووسەرو شاعیرێ لەگەڵ کەسێکی ئاساییدا. ئەو زمانەی ئێستا ئێمە پێی ئەنووسین، شێوەی کرمانجی خواروو، لە سەردەمی نالیو سالمو مستەفا بەگی کوردییەوە چۆتە سەر کاغەزو بووە بە شێوە زمانێ کە ئەتوانم بڵێم خاوەنی گەورەترین کتێبخانەو پاشخانی ڕووناکبیرییە بە بەراورد لەگەڵ شێوەکانی تردا، بەڵام ئەم زمانە هەر لە خۆوە نەگەیشتۆتە ئەم ئاستەی ئەمڕۆی. سەرەڕای ئەوەی ئەم زمانە دەوڵەتێ نەیپاراستووە. خزمەتی نەکردووە، بەڵام بەهۆی ڕووناکبیرە پێشەنگەکانیەوە، لە ئەنجامی ئەو هەموو ڕەنجو ماندووبوونانەی نەوەکانی پێش ئێمەوە، هەنگاو بە هەنگاو چۆتە پێشێ، بەڵام گرانو زەحمەت وەك ئەوەی لە شاخێکی ئاسندا ڕێگەیان کردبێتەوە. ئەو پێشەنگانە گەورەبوونو ئێمە هەموومان قەرزاری ئەوانین.

با مەسەلەکە باشتر ڕوونبکەمەوە. لەسەردەمی حوکمداری (شێخ مەحمودی حەفید)دا. لە ڕۆژنامەکانی ئەو وەختەدا "ڕۆژی کورد"، "بانگی هەق"، "ئومێدی ئیستقلال" تەماشای زمانی کوردی بکە. تێکەڵەیەکی سەیر ئەبینی لە زمانێك کە بەشی زۆری وشەکانی عەرەبیو تورکیو فارسین. خۆتان ئەتوانن تەماشای ئەو لاپەڕانە بکەن. کەچی هەر لە دوای نزیکەی بیستساڵ، کە بۆ پاکژکردنەوەی زمانو پوختکردنی زۆر نییە، وەرەو تەماشای گۆڤاری گەلاوێژ بکە. وەك موجیزەیەك ڕوویدابێ وایە. زمانێکی ئەدەبی نووسین هاتۆتە کایەوە کە بە ڕاستی پێویستە مرۆڤ لە بەردەمیدا کڕنوش بەرێ. ئاخر لە ماوەی بیست ساڵدا ئەم گەشەکردنو پێشکەوتنە چۆن ڕوویدا. فەرموو ئەوە گۆرانو ئیبراهیم ئەحمەدو هەردیو ع. ح. بو دیلانو کامەران موکریو محەمەد مەولوود مەمو موحەڕەم محەمەد ئەمینو زۆری تریش لە پەنجاکانداو تەماشای بەرهەمەکانیان بکە. مەبەستم لە زمانیانە. هەوڵیانداوە کەمترین گیاکەڵەی وشەی بیانی تێبکەوێو

ئینجا هەڵکشێ بۆ حەفتاکانو هەشتاکان هەمان بەردەوامبوون لە پاکژکردنەوەدا هەبووە. ئەمە بە مانای هەستکردن بە لێپرسینەوەیەکی مێژوویی و ئەخلاقی دێت. هەستکردن بەوەی زمان ڕۆحی بوونی تۆیە: بەڵام ئەوەی هەست بەم بەرپرسە ناکات، بە تایبەتی لەم قۆناغەی ئێستاداو لەناو لاوەکاندا مانای وایە ئەوانە ڕابوردووی جوانی خۆیان، کۆششی دەیان ساڵی پێشەنگەکانی ئەم تازەکردنەوەیە لە زمانی کوردیدا، بەر شەق ئەدەن. ئەو شاعیرەی بە تەنگ زمانی پوختو جوانی کوردیەوە نەبێت، چۆن بە تەنگ داهێنانو ئەفراندنەوە ئەبێت!. ئەو شاعیرەی لە جێی وشەیەکی کوردی کە هەبن وشەیەکی فارسی یان عەرەبی دابنێ لەوە ئەچێ مینێك لە زمانی کوردیدا بچێنێ. من لێرەدا بێئاگانیم لەوەی کاریگەری زمانی نەتەوە باڵادەستەکان لە کوردستاندا لەسەر زمانی کوردی چەندە! من ئەزانم هەندێ وشە هەن جێگرەکەی لە زمانی ئێمەدا تا ئێستە نینو بەکارهێنانیان خەوشی تێدا نییە. ئەزانم زمانێك نییە لەم دنیایەدا سەد دەر سەد پاکبێ، بەڵام ناکرێ تۆ پاچێ بگری بەدەستەوەو بونیادەکانی زمانی کوردی بڕووخێنی لە شیعرێکدا بنووسی: حەقیقەتو مەحەبەتو مەجهولو مەغریبو لەحنو ئینشاو لقاء و زۆر وشەی تریش. ئەمە چییە. ئەمە گەڕانەوەیەکی زەقە بۆ دوای دواوە. ئەمە کۆنخوازییە نەك نوێخوازی. ئەمە گەمە کردنێکی پیسو پۆخڵە! من کە ئەو جۆرە شیعرانە ئەخوێنمەوە دڵم تێکەڵدێ، بەڵام با بپرسین ئەم دیاردە ناشیرینە لە کوێوە هاتووە. ئەمە دیاردەی نەوەیەکە نە عەرەبی ئەزانن و نە فارسی و نە کوردیش بە تەواوی، بەڵام کارەساتەکە لەوەدایە شیعریش ئەنووسن. ئێستا ئێمە شاعیرمان هەیە دیوانێكو یان دووانی دەرکردووەو بەڵام بە هۆی بارودۆخی سیاسی و هەموو ئەو ڕووداوانەوە کە ئەیزانینو دیارن. نەیتوانیوە زمانی عەرەبی فێر ببێ. کەچی سەیر ئەوەیە وشەی عەرەبی بەکاردێنێ. من گومانم هەیە ئەوانە نازانن ئەو وشانە چین، لە کوێوە هاتوون. بە دڵنیاییەوە ئەڵێم لە زمانی فارسییەوە هاتوون، چونکە لە ماوەی پانزدە بیست ساڵی دواییدا، دوای دابڕان لەگەڵ عێراقدا، چاپکراوی فارسی ئەگەیشتنە دەست ئەم نەوەیە، ئەم

زمانە، فارسی، ئاشنایەتیەکی لەگەڵ زمانی کوردیدا هەیەو وشەگەلێ لە کوردیو فارسیدا هەر یەکن. لەهەمان کاتدا وشەگەلێکی عەرەبی کەوتوونەتە ناو زمانی فارسییەوە ئەگەرچی بە مانای جیاواز بەکارهاتوون. ئەمانە هاتوونو ئەیخەنەوە ناو شیعرەکانی خۆیان، بەبێ ئەوەی بزانن بۆچی بەکاریان دێنن.

بۆ نموونە: شیعرەکانی سوهرابی سپهری یان فروغی فەروخزاد ئەخوێنینەوە، هەڵبەت لەم شیعرانەدا کۆمەڵێ وشەی عەرەبی هەن، بەڵام وەك ڕیتم بە مانای جیاواز لە فارسیدا بەکارهاتوون. ئەمانە دێنو ئەو وشانە بەکاردێننەوە. خۆ لەوانەیشە نەزانن ئەم وشانە عەرەبین. ئەمە کارەساتەو لە وێنەی نەبووە. ئاخر خۆ وێرانبوونی ئێمە هەر وێرانبوونی وڵاتو گوندو ڕاگوێزانو خەڵكو ئاوارەبوون نەبووە. بەشێك لەو وێرانبوونانە وێرانبوونی کولتوورو زمانەکەیشمان بووە، هەروەکوو چۆن ئەم دیاردەیە "تەنانەت بەبێ تێگەیشتنی" لە بڵاوبوونەوەی گۆرانی تورکیو عەرەبیدا ئەبینین، گۆرانیەکە تووتی ئاسا ئەڵێتەوە، بەڵام ناشزانی چی ئەڵێ.

بەڵێ ئێمە هەموومان ناوبەناو، بەڵام لە شوێنی خۆیا وشەی بیانیمان بەکارهێناوە، بەڵام نەك بەم لێشاوە ناپەسەندە، بۆ نموونە ئەو کاتەی ئەکەوێتە نێو شیعرێکەوە سرووتەکانی "تەصوف" ئەبنە ئاسۆی ڕوانینو توانەوە تۆ ئەگەر لەوێدا وشەو دەستەواژەی ناو ئەم دنیایە وەك خۆیان بەکاربێنیتەوە خەوشی تێدا نییە، بۆ نموونە وەکو "وەجد"و "ئیشراق"و "عەشقی ئیلاهی" وهتد.. بەڵام تۆ بێیتو دەیان جار وشەی "مەحەبەت" یان "مەعزەرەت" یان "وەعد"و "موخالیف" بەکاربێنیو دوای پاکژکردنەوە ئەم گیاکەڵانە لە زمانی کوردیدا بڕوێنیتەوە. لە تێکدانو گەمەی ئەنقەست بەولاوە چیتر ئەگەیەنێ؟!

ئەو دەستەواژە بیانیانەی کە جێگیرەکانیان لەم زمانەدا هەن، بەڵام تۆ بەکاریان ناهێنیتو نایاننووسیت وەك ئەوە وایە کۆمەڵێ دوومەڵ بە دەستی خۆت بە جەستەی کولتوورەکەتدا دروستبکەیت. ئەمە جگە لەوەی بەم کارانە ئێمە بێ وەفاییەکی گەورە دەرهەق بەو نووسەرو شاعیرو ڕووناکبیرانەی ڕابوردوومان ئەکەین، کە شێلگیرانەو بێ هیچ پشتیوانێ ساڵەهای ساڵ خەریکبوون بۆ ئەوەی

ئەم زمانە مشتومالّو بژار بکەن. کەچی مەخابن هەندێ لە "شاعیرانی" نەوەی خۆیان لە سەردەمێکی پێشکەوتووتردا بێنەوە بۆ ئەوەی ڕیسەکانیان بکەنەوە بە خوریو ڕەنجیان بە با بدەن، ڕەنگە لێرەدا شوێنی خۆی بێ ئەگەر ڕووی دەم بکەمە هەموو ئەو خوشكو برایانەی لە بواری ڕۆژنامەگەریو ئەدەبدا کارئەکەن بەتایبەتی سەرنووسەرو بەڕێوەبەری نووسینی تەواوی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستان، بەرپرسی لاپەڕە ئەدەبیو کولتوورییەکان بۆ ئەوەی لای خۆیانەوە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی، نووسین یان شیعر یان چیرۆك یان پەخشانیان بۆ هاتو زانییان نووسەرەکەی زمانی کوردی بەو دەردە ئەبات وەکو لە سەرەوە باسمانکرد چاکتر وایە ڕێبگرن لەو نەخۆشییەو نەهێڵن بڵاو بێتەوە.

***لە شیعری دەمامکدا، ئایا بە دوای چارەنووسی کەسایەتییەك گەڕاویت. کەسایەتی دەمامکدار لە شیعردا چۆن دروست دەکەیت، وەك ئەو ئەزموونەی بۆ شاعیرو شەهید (جەمیل ڕەنجبەر) ئەنجامتدا؟**

ـ شیعری (دەمامك) لە بنەڕەتدا لە شانۆوە گوێزراوەتەوە بۆ ناو شیعر، یان شیعر کە هەر خۆی دایکی شانۆیە لە سەرچاوەوە ئەم دەمامکانەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئەشێ یەك ئەکتەر چەندین دەمامك بۆ چەندین هەڵوێستی جیاجیاو بۆ نیشاندانی چەندین کارەکتەری تر بەکار بێنێ، ئەمە دەوڵەمەندکردنی درامایە بە ناکۆکی جیاجیا، بە دەنگی جیاواز، بە زۆرانبازی جیاواز. ئەم دەمامکانە پێبەپێی هەڵچوونو داچوونی دراماکە لە شانۆدا بێ یاخود لە قەسیدەکەدا دێنو ئەچن. شیعرەکان شوێن دراماکان ئەکەون. ئێستە ئەبێتەوە، بە ڕابوردو و لەهەمان کاتیشدا ڕوو لە پاشەڕۆژیش بەردەوامە. بەڵێ لە شیعری "میوان"دا کە پێشکەشی شاعیرو شەهید "جەمیل ڕەنجبەر" م کردووە زەمانەکان تێکەڵ ئەبنەوە، ئێستەیەو ئەو بە جەستە نەماوە، بەڵام ئەگەڕێتەوەو سەردانم ئەکات نەك هەر ئەوەندە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەم ئەداتەوە کە من لە ئێستەدا لێی ئەکەم. ئامادەبوونی ئەو زۆرترە لە من، تەنانەت وەختێ خواحافیزی ئەکاتو لامان ئەچێتە دەرەوە، باران ئەبارێ، بەڵام من چەترەکەی خۆمی ئەدەمێ لەگەڵ

خۆیدا بیبات. واتە شتێك نییە پێی بوترێ مردوو یان مردن، بەڵكو ئەوەی هەیە بەردەوامبوونی ژیانە. ئەم حاڵەتانە، لە قەسیدە درێژەكەی "دەربەندی پەپوولە"دا لە چەندین دیمەندا بەرچاومان ئەكەوێت. لە گەڕانەوەی نالی‌و دیالۆگی نالی‌و سالم‌و هەروەها كەسایەتی شەریف پاشادا لە پاریس. من ناچم بۆ لای نالی، ئەو دێت بۆ سویدو لەوێ بە یەكتری ئەگەین. دەمامك پۆشینی ڕەنگە بۆ ساتەوەختێ بووبێ، بەڵام ئەو ساتەوەختە درێژ ئەبێتەوە لە لایەكەوە بۆ ڕابوردو ئێستەو داهاتوویش.

ئەو دیمەنانە هەر تەواو درامای شانۆن. جووڵەی جەستە، دیالۆگ، بەربوونی پەنگخواردنەوەكانی ناوەوە بە زمانی شیعرو چاوەڕێكردن تا ساتەوەختی دەركەوتنی كەسێك یان بزربوونی. دەمامك ئەشێ لە ڕێی زمانیشەوە بێت واتە ئەو كاتەی نالی لە (دەربەندی پەپوولە)دا شیعر ئەنووسێ، ئەوە منم دەمامكی شیعری ئەوم پۆشیوە، بەڵام بۆ ئەوەی بڕوا بە دەمامك بكەین پێویستە دەمامكەكە لە ساتەوەختی خۆیدا ڕۆڵی ڕاستەقینە ببینێ، هەست نەكەین درۆیە یان فێڵە، واتە ئەو كاتەی تۆ شیعرەكەی نالی لە (دەربەندی پەپوولە)دا ئەخوێنیتەوە، مەحاڵە بزانیت ئەمە هی نالی نییە. وەك سەبك‌و مۆسیقاو دەستەواژەی نالی خۆی‌و شێوەی نووسینی‌و وشەسازی تایبەت بە نالی، ئەمە دەمامكێكی زمانی نالییەو، بەڵام شاعیرێكی تر دوای سەد ساڵ زیاتر هاتووەو دروستی كردووە.

دەمامك گۆڕینە بۆ نیشاندانی زەمەنە جیاجیاكان. یان پێناسەیەكە بۆ ئەو كەسایەتییانەی سەرلەنوێ ئەیانژێنینەوە. دەمامكی ڕەنگ هەیە. تۆ ئەتوانی لە ڕێی دەمامكی دەم‌و چاوێكەوە كە هەندێ هێڵكاری ڕەنگاوڕەنگی تێدا بێت بیخەیتە بەر دەم‌وچاوی خۆت‌و ببی بە سیحربازێكی ئەفریقی‌و ئەو كەسایەتیەم لا بەرجەستە بكەیت. بە كورتی شیعری دەمامك، نیشاندانی ژیانە جیاوازەكانە، یان ڕەگەزە جیاوازەكانە. ژنێك ئەتوانێ ببێ بە پیاو لە ڕێی دەمامكێكی پیاوەوە. دەمامكدار واتە خۆی نییە یەكێكی ترە، نادیارییەكە، بەڵام ئامادەبوونی خۆی هەیە. ئەتوانین ئەم دەمامكە بە هێما و ڕەمزیش بچوێنین، چونكە لە ڕاستیدا دەمامك ئەیەوێ شتێكیتری

دەرەوەی ئەو کەسەمان نیشان بدا کە دەمامکەکەی پۆشیوە. یەکێك لەو هونەرمەندە گەورانەی کە بۆ هونەری شێوەکاری‌و ستایلی خۆی سوودێکی زۆری لە دەمامکەکانی سرووت‌و بۆنەو سەماو جادووگەری ئەفریقاییەکان بینیوە "بیکاسۆ"یە.

***ماوەیەکی زۆرە دەنووسیت. ئایا هەست دەکەیت هێشتان شتێك ماوە بینووسیت‌و مایەی سەرسامیت بێت. نووسینی داهێنراو لە ئەنجامی سەرسامی چرکەیی دروست دەبێت، یان لە ئەنجامی تێرامان‌و لێوردبوونەوەی قووڵ‌و درێژخایەن؟**

- تا لە ژیاندابم، کەمتازۆر، برووسکەشیعرێ بێ، یان دڵۆپەوشەیەك، یان زنەیەك، لە ئەفراندن هەر ئەمێنێ بۆئەوەی بیاننوسم. ڕەنگە نەتوانم جوانتر لە (کۆچ)و (دەربەندی پەپوولە)و (ڕەنگدان) بنووسم، بەڵام تازە نووسین بووە بە چارەنووسم. لەوانەیە من واز بێنم‌و ئەو واز نەهێنێ. بەوەی باشە نووسەرو شاعیر وزەی بەخشین‌و نووسینی لەناو ماسولکەو جەستەیدا نەبوو، ئەگینا ئەبوو من لە دەمێکەوە خۆم کەنارگیر بکەم‌و لەدواییدا هیچم بۆ نەئەمایەوە، لەوە زیاتر کە ببوومایە بە ناوبژیوان‌و حەکەمی کێبڕکێیەکانی شیعر، بەڵام حەز ئەکەم لێرەدا ئەوە بدرکێنم. من زۆرم وتووە، لەبەر ئەوە بۆریشی تێکەوتووە، نزیکەی بیست‌و پێنج کۆمەڵە شیعر. گەلێ زۆرە تۆ بڵێی پێنج کۆمەڵەیم بۆ بمێنێتەوە. ئەگەر بزانم وائەبێ ئاهەنگێك بۆ هاوڕێ‌و کەسە نزیکەکانم ئەگێڕم. من بە توندی ڕەخنە لە خۆم ئەگرم، چونکە سەردەمێکی تەمەنم واتە لە گەرمەی زەینی تیژی‌و چالاکیدا هەر وا بە هەدەر داو دوو زمانی زیندووی ئەم دنیایە فێرنەبووم. ئەمە بووە بە گرێکوێرە لە دەروونما.

شیعر کارکردنە لەناو زماندا، ئێستاکە ئاوڕ ئەدەمەوە، ئەزانم زۆرجار غەدرم لە خۆم‌و زمانەکەم کردووە، چونکە پەلەم کردووەو ئەو شیعرانەیشم بە کاڵ‌و کرچی لە درەختەکانی بەهرەو خۆشەویستیم کردۆتەوە. من تەنیا یەك شتم کردووە تۆزێ دڵم پێی خۆشبێ. ئەزموونەکەی خۆم پەرەپێداوەو دەستبەرداری نەبووم‌و ئەوەی پێشمبووە هەر ئەوەندە بووە. هەموو شاعیرێ هەرچی نووسیوە هەمووی

بۆ نامێنێتەوە، بەلای منەوە "گۆران" واتە سی شیعریَ زۆرەو بە زیندوویی ئەمێنێتەوە. بەڵێ هەست ئەکەم هێشتا زۆر شت ماوە بیڵێم، ئەگەر بتوانم بیڵێم، چونکە تەماشا ئەکەمو دڵم هەر لێ ئەداو ژیان بەردەوام هەر سەرسامم ئەکاو جوانیی سروشتو ژنو چۆلەکەیەكو پەڵە هەوریَ ڕوانینی تازەم پێ ئەبەخشن، پێم ئەڵێن: بماننووسە گرنگ ئەوەیە ئەو نووسینانە نائومێدیان نەکاتو بەو مانایەی شیعر نەبن، ئەمەیان ناخۆشە، بەڵام من هەر چاوێکم لەلای زمانە، ئەگەر ڕۆژێ زانیم خەریکم ناشیرینی ئەکەم. ئەوەستمو چاوی ماچ ئەکەمو پێی ئەڵێم داوای لێبوردن ئەکەم من گۆرانیت بۆ نەڵێم باشترە، چونکە حەیفە بە دەنگی ناخۆش بێزارت بکەم.

"سەرسامی چرکەیی" یان "تێڕامانو لێوردبوونەوە"، شیعر لە ئەنجامی هەردوو حاڵەتەکەوە دروست ئەبێ. هەر حاڵەتێکیش شیعری خۆی ئەخوڵقێنێ. بۆ نموونە چرکەساتێکی سەرسامبوون بە شتێ، دیاردەیەك، دیمەنێك، بیرۆکەیەك، ژنێك، مەلێك. گوڵە گەنمێ. سەگێك. وێنەیەك لە خەیاڵدا ئەنەخشێننو مەرجیش نییە ئەو ساتەوەختە ببنە شیعر. من جاری وابوو دوای ساڵێك گەڕاومەتەوە بۆ سەرسامبوونێکی ڕابوردوو بەدیمەنێكو ئینجا بۆتە شیعر. ئەشێ تۆ سەرسامبوون هەر لە خەیاڵی خۆتدا دروستبێتو چ پەیوەندی بە دنیای دەرەوە نەبێت. پێموایە ئەو سەرسامبوونە خێرایانە بە زۆری کورتە شیعریان لێ ئەکەوێتەوە، بەڵام تێڕامانو قووڵبوونەوەو وردبوونەوە بە مانای ئەوەی تۆ چوویتە ناو نێرینەی ڕووبارێکەوە یان لە گەردوونێ ڕائەمێنی کە زۆر نەهێنیو پرسیاری تێدایە. سەفەرێکی درێژ ئەکەیت لەو ڕامانو وردبوونەوەیەدا ئەوسا خەیاڵەکان ئەزێن واتە خەیاڵێك خەیاڵێکی دیکە ڕائەکێشێو ئەتبەنە قووڵایی ترەوە لەو قووڵاییەی تریشدا قووڵایی تر هەیەو بەو جۆرە.

لە هەڵوێستی بروسکەییدا یەك تێڕامان یان یەك زرنگانەوە یان یەك وردبوونەوە هەیە. یان یەك دیمەنەو بەڵام هەندێ لقو چڵی دیاریکراوی کورتو سنووورداری لێبۆتەوە. نابێ ئەوەیشمان لە بیر بچێت هەر شاعیرەو بە جۆرێك

لەناو ئەو دوو دنیایەدا کارئەکات. تێرامان‌و لێوردبوونەوەی قووڵ‌و درێژخایەن واتە شیعری درامی. فرە دەنگ. فرە ڕەنگ. فرە بینین‌و هەناسە درێژی نەك هەر لەسەر یەك ڕێگا، بەڵکو لە چەندین ڕێگادا. لە چەندین ئامانج‌و لە چەندین ڕیتم‌و ئاهەنگدا.

***لە ساتی نووسینی شیعردا بە نموونە: قەلێك بەسەر پەنجەرەکەتەوە نیشتووە، یان پەرداخێك دەمەونخوون کەوتووە، یان گەردەلوولێکی توند لقی درەختەکانی باخچەی ماڵەکەتی شکاندووە، شوێن لە ساتی وروژاندا چۆن دێتە ناو نووسین؟**

ـ من لەسەر ئەزموونی خۆم قسە ئەکەم. نازانم ئەو وێنانە لای شاعیرێکی ترو لە وەختی نووسیندا چۆن ئەکەونەوە. من بەرلەوەی بنووسم واتە پێش ئەوەی قەڵەم‌و کاغەز لە ئارادابێ. ئەبێ شتێکم لە خەیاڵما نووسیبێ. تەنانەت ئەگەر چەند وشەیەکیش بێ. بە مانایەکی تر، من لەوەختی نووسیندا ئەو بیرۆکانەی پێشتر، یان ئەو خەیاڵانەی زووتر بەرەژانی خۆیان هەبووە، ئەبنە کلیلەکانی یەکەم دەستپێك، بۆ نموونە: لەبیرمە لە کاتی خۆیدا شیعری (کۆچ) لە خەیاڵمدا بریتی بوو لەم ڕستەیەو هیچی تر "چاوی خۆمەو ئەبێ بڵێم چاوم نییە" ئیتر ئەم وێنەیە هەموو وێنەو جووڵەو ڕەنگەکانی تری بەدوای خۆیدا هێنا. ئەگەر ڕوونتریش لەمە بدوێم ئەبێ بڵێم: من لە کاتی نووسیندا لە هەموو شتێکی دەرەوەی خۆم دائەبڕێم. لەو قەلەی تۆ باسی ئەکەیت‌و لە پەرداخە دەمەونخوونەکەو لە گەردەلوولەکەیش. ئەوەی لای من بوونی هەیە ئەو نووسینەیە، کە دەستم کردووە بە خوڵقاندنی‌و ئەمەوێ تەواوی بکەم. من ئەوکاتە دانەنیشتووم‌و بەتاڵبم بۆئەوەی وێنەیەك لەو وێنانە بێن‌و پڕمبکاتەوە. من کە دانیشتووم‌و لە نووسیندام، ئەبێ شتێکی تری پێش قەل‌و پەرداخ‌و گەردەلوولەکە سەرقاڵی کردبم، یان وورووژاندبێتمی، بۆیە هەموو شوێنەکانی تر بەو ژوورو کۆڕنیشەوە کە لەسەری دانیشتووم، ئامادە نین‌و بوونیان نییەو نایانبینم. ئەوەی بە تەنیا ئەیبینم زمان‌و بیرۆکەو جووڵەو ئەو خەیاڵەیە کە ئەو ساتەوەختە خەریکم لەگەڵیاندا، بۆ ئەوەی ببن بە شیعر. بۆ وێنە: دانیشتووم ئەنووسم گوارەی کچێکی

جوان که پێشتر سەرنجی ڕاکێشاوم خەیاڵم لەوەوە ئاڵاوە، گوارەیەك‌و هیچی تر، ئەمەوێ ببێ بە شیعر. ئەوەی لەو ساتەوەختەدا، یان لە هەموو دانیشتنەکەدا چەند ئەخایەنێ، یان ئەوەیان شتێکی ترە. ئەوەی دێتە پێش چاوی خەیاڵم، شۆخێکی جوان‌و جووتێ گوارەی شۆڕی لە گوێ گرتووە، دەمووچاوی، گەردنی، لەرەی گوارەکان. ئەمە ئیتر ئەبێتە شوێنی خەیاڵ‌و سەنتەری بیرکردنەوەم لە دەرەوەی ئەم گوارەیە. ئیتر من لەو ساتانەدا هیچی تر نابینم. نە بە خەیاڵ‌و نە بەڕاستی.

من وەك کارێزکەن کار ئەکەم، بەڵام زمان هەڵئەکەنم. ئەشێ ئەو دیمەنانەی تۆ باستکردوون لە وەختی بەئاگاییدا کارم تێبکەن‌و بچنە ئەودیوی هەست‌و نەستەوەو دواتر خۆیان لە شوێنێکدا سەرهەڵبدەنەوە. وەك چۆن من ناتوانم شیعر بەبێ مانا بنووسم ناشتوانم بە بڕیار بۆی دانیشم. لای من حاڵەتی شیعر نووسین لە باران بارین ئەچێ جاری وا هەیە، یان ساتەوەختی وا هەیە بەڕاستی شوێنی نووسینی شیعرە. بێدەنگیی، ئاسۆیەکی دوور، تەنیایی، پاکەتێ جگەرەی پڕ، ڕەنگە دووراو دووریش شۆخێکی جوان سەرتاپاشی‌و گوڵەباخێکی دابێ لە پەرچەمی، بەڵام من ناتوانم یەك دێڕ بنووسم، یان یەك دڵۆپ باران نابارێ. پێچەوانەکەیشی کە زۆرجار ڕوویداوە بە تایبەتی لە نووسینی شیعرە درێژەکانداو دوای ئەوەی سەرەتای ڕووبارەکە بردوومی: لە چاپخانەیەکی بەژاوە ژاودا، قاوەیەکی ساردەوەبوو لەبەردەمما. ئاگام لێ نییەو سێ جگەرەی داگیرساو لەسەر تەپڵەکەکەن‌و ئاگام لێ نییەو لەولامەوە کامێرایەك وێنەم ئەگرێ‌و ئاگام لێ نییەو دوو کەس لەیەکتری تووڕە ئەبن، بەڵام من ئەنووسم‌و بارانیش بەخوڕەو خۆشکردنەوەی بۆ نییە. مەگەر شتێکم بەرکەوێ. ئەوسا خەبەرم ئەبێتەوە. بەڵێ هەر تەواو خەوبینینە. لەو بەهۆش هاتنەوەیەدا جگەرە داگیرساوەکان ئەبینم. کامێراکە ئەبینم‌و ئەو دوو کەسەیش ئەبینم کە دەمەقاڵێیانەو ساتەوەختێ پێش ئەوە دابڕاوم. هەر تەواو دابڕاوم. دیارە ئەمە لە ئەزموونی شاعیرێکی تردا ڕەنگە پێچەوانە بێت. من هەرگیز بە مەستی شیعرم نەنووسیووە، بەڵام چەند جار دوای ئەوەی نووستووم‌و داچڵەکیوم‌و هەستاوم‌و ئەو دێڕەی بەشوێنیا گەڕاوم لەو کاتەدا هاتووەو

به چاوی خەواڵووەوە نووسیومە. ئەمە باران بارین‌و نەبارین نییە وەختی بۆ نییە. شەو، یان ڕۆژ، بەیانیان، یان ئێواران.

هەر شاعیرەو ستایلی خۆی، من شیعرە درێژەکانم فیلمن وێنە لە دوای وێنە. ڕووداو لەناو ڕووداودا، ڕەنگاوڕەنگ، بەسەرهات‌و بەسەرهاتی کوتوپڕ، تراژیدیا ڕووبەرێکی گەورەی لەو بەرهەمانەدا هەیە، قوربانییەکان، جەللادەکان، سروشت، یادەوەری، فلاشی بچووک بچووک‌و گرێدانەوەی بە فیلمەکەوە. ژن‌و باران، بەڵام لە شیعری مندا یەك ژن‌و یەك عەشقی دیاریکراو نییە، پۆلێ ژن‌و پۆلێ عەشق‌و پۆلێ شیعر. ئەو وەختەی وورووژاندن بووە، شوێنەکان خۆیان هاتوون. ناوو شوێن‌و مێژووو یادەوەری‌و سروشت لە شیعری مندا لێوانلێون. ئەو کاتانەی شیعر نەنووسینم درێژە بکێشێ شپرزەییم لە ڕادەبەدەر ئەبێ‌و خەریکم سەربدەم بە دیواردا. جاری وابووە وتوومە: تەواو چیم پێ نەماوە، بەڵام هەر ئەو هەورە شپرزانەش بوون وەختێ دایانکردووە فریای ئەوە نەکەوتووم پەنجەکانی دەستی ڕاستم ڕاگرم‌و خۆم‌و ماڵم لەو بوومەلەرزە پیرۆزانەی شیعر بە دوور بگرم‌و هەمووومان پێکەوە نوقم نەبین.

هەڤپەیڤینی
کاروان عەبدوڵڵا — سەباح ڕەنجدەر
سلێمانی 2005/3/3

# ناوەرۆک